# پەروەردەکردنی منداڵ

## لە چل فەرموودەی صەحیحدا



نوسینی

دکتور عادل عبدالله بن سعد الحمدان الغامدي



وەرگێرانی

مامۆستا عمر توفيق الخطاط

نـــاوی کتێـــــب: پەروەردەکردنی منداڵ لە چل فەرموودەی صەحیحدا

نووسیـــنـــــــی: دکتۆر عادل عبدالله بن سعد الحمدان الغامدی

وەرگێـــڕانـــــــی: مامۆستا عمر توفیق الخطاط

نـەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

نۆرەو ســاڵی چـــاپ: یەکەم ٢٠١١ ز

ژمـــــارەی سپـــاردن: (٢٧٢١)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# پەروەردەکردنی منداڵ

## لە چل فەرموودەی صەحیحدا

نوسینی

دکتۆر عادل عبداللە بن سعد الحمدان الغامدی

وەرگێڕانی

مامۆستا عمر توفیق الخطاط

**ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:**

*بە پێغەمبەری خـوا (ﷺ)و هاوەڵـە نازدارەکـانی کـە ئەگـەر هـەوڵو مانـدوبوونو گیان فیدایی ئەوان نەبووایە ئێستا ئێمە لەناو گۆمی مەی خواردنـەوەو وقمـارو گونـاهو گەندەڵیدا دەتلاینەوە.

* بە دایكو بـاوکم کـە شـەو و ڕۆژیـان خـستبووە سـەریەك تـا نـەوەکانیان صـاڵحو ئیسلام پەروەربن.

* بــە هــەموو مامۆســتاکانم چ ئەوانــەی نووســینو خوێندنــەوەیان فێرکــردم لــە قوتابخانە، چ ئەوانەشی لە دەرەوە بەرەو گوڵزاری ئیسلامو ڕەوشتی بەرزی پێغەمبـەر (ﷺ) ئاوێتەیان کردم، خوا وێنەیان زۆر بکات.

* بە براو هاوڕێی خۆشەویستم کاك فائق محمد خاوەنی کتێبخانەی نـارین لەهـەولێر کە بووەتە هۆی چاپکردنو بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانم.

* بە هەموو خوێنەرانی نووسینەکانم.

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس‌و ستایشی نەبڕاوە شایستەی خوای بەدیهێنەری بوونەوەرەو سەلات‌و سەلامیش بەردەوام وەك لێزمە باران بڕژێت بەسەر گیانی پاکی محمد المصطفى‌داو سەرجەم ئال‌و کەس‌و کارو هاوەڵە دڵسۆزو گیان لەسەر دەستەکانی.

پەروەردکردن زۆر گرنگەو نابێت باوکان‌و دایکان هەل لەکیس بدەن‌و نابێت بهێڵن ئەمەن ڕۆژ بەڕۆژ ماڵئاواییان لێ بکات‌و کوڕو کچەکانیان گەورەبن لە کەش‌و هەوایەکەی پەروەردەنەکراودا، لە ئاکامدا بەرەیەك دێتە کایەوە هەموو بۆچوون‌و بیروباوەڕە جێگیرە دروستەکانی باوك‌و باپیریان ڕەد دەکەنەوەو پشت لە قورئان دەکەن‌و لەژیانی پێغەمبەر بێ ئاگادەبن‌و لەبەر قسەی ئەم‌و ئەویش نەبێت (پەنا بە خوا) خۆیان بە موسڵمانیش نازانن!.

ئەم ئایینە پاکە، ئەوە لەدوای ئەوە لەڕێگەی پەروەردەکردنەوە گوێزراوەتەوە بۆمان تا گەیشتۆتە ئەم ساتەوەختە.. هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت وەك ڕازیش بوو لێیان لەگەڵ ئەو هەموو ئەرك‌و ئیش‌و کارە قورسەی بانگەوازو بەرز ڕاگرتنی ئالای جیهادو تێکۆشاندا، کەچی بەردەوام وانەیان بە منداڵەکانیان وتۆتەوەو لە قورئان‌و فەرموودەو غەزاکانی پێغەمبەر (ﷺ) شارەزاکردووە..

ئەوەتا پێغەمبەرمان (ﷺ) -بە دایك‌و باوکمەوە بە قوربانی بم- لە پاشکۆی خۆیەوە عبداللەی کوڕی عەباسی بچکولانەی سوارکردووەو بەسواری وڵاخەوە بنەماکانی وەلاء و بەراءو بیروباوەڕی ئیسلامی تێدەگەیەنێت..

بەڵام ئەمڕۆ دایك‌و باوکان بیانوو دەهێننەوە کە گوایا ئێمە نامان پەڕژێ‌و خەریکی مەینەتی ژیانین، واز لە کوڕو کچەکانیان دێنن هاوڕێی خراپ لە دەرەوەو تەلەفزیۆن‌و سەتەلایت‌و ئینتەرنێت لە ماڵەوە مێشکیان تێك داوەو بیرو باوەڕی لەق کردوون‌و لە ڕەوشت دایماڵیون..

یان ئەوسا دەیان وت هەندێك لە مامۆستاو مەلاكان قسەی خێریان بۆ خەڵكی دەكرد بەڵام بۆ منداڵەكانی خۆیانیان نەدەكردو فەرامۆشیان دەكردن تا لە ئاكامدا كوڕە مەلا وا دەردەچوو كە دەبوونە دوژمنێكی سەرسەختی ئیسلامو پێغەمبەری خوا (ﷺ)، تا وای لێدەهات خەڵكی سنگیان لە باوكیشیان هەڵتەكاندو مامۆستا بەڕێزەكەشیان لەبەرچاو كەوت!

بەڵام ئەوەتا (نافیع) گەورە زانای تابیعین دەفەرموێت: عبداللەی كوڕی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەرسی قورئانی پێ دەگووتین ئەگەر یەكێكمان لە نەوەكانی خۆی بیویستایە ڕابكاتو نەیخوێنێت دەچوو هەردوو قاچی پێكەوە دەبەستەوە تا لە ئاكامدا كردنی بە گەورە زانایانی تابیعینو تابعی تابعین.

كوردی خۆشمان دەڵێت: (توڵ بە تەڕی دەچەمێتەوە) واتە پەروەرد لە سەردەمی منداڵیدا كەڵكی هەیەو دڵی منداڵەكە لاپەڕەیەكی سپی وەك لۆكەیەو دەتوانیت چیت بووێت تیایدا نەخشی بكەیتو پاشان لەسەریان ڕادێتو گەورە دەبێتو كوژانەوەی مەحاڵە.

خوێنەری خۆشەویست.. ئەم كتێبەی لەبەر دەستتدایە بریتیە لە چل فەرموودەی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) كە هەموویان صەحیحن، هەموو لایەنەكانی پەروەردەی لەخۆگرتووەو لەو خولگەیەدا دەسوڕێنەوە.

من كە سەرەتا ئەو كتێبەم بە عەرەبیەكەی بینی لەژێر ناوی (الاحتال بأحكام واداب الاطفال) لە نووسینی بەڕێز كاك عادل الغامیدی) نووسیویەتیو منیش ناوم لێ نا (پەروەردەكردنی منداڵ لە (٤٠) فەرموودەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ))و دوای ئەوەی خوێندمەوە بۆم دەركەوت ئەمە ئەو كتێبەیە كە چەندان ساڵە دەمەوێت چاوم پێی بكەوێت چونكە لەیادمە كاتێك قوتابی زانكۆ بووین لە بەغدادو شەوێك هاوڕێیەكمان هات بۆ لامانو میوانمان بوو دەستمان كرد بە تاوتوێكردنی فەرموودەو هاتینە سەر

فەرموودەیەکی زۆر کورت کە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) هەواڵی باڵندەی منداڵێك دەپرسێتو دەفەرموێت: ((یا أباعمیر ما فعل النُغیر؟)).

نزیکەی (٣٠) وانەی لێ دەرهێنا بۆمانو ئێمەش زۆر چێژمان لێ وەرگرتو بەتایبەت هەر لەو کاتەوە منی وا لێکرد خولیای ئەوەبم کە بتوانم دەرسو ئامۆژگاریو ئەحکام لە فەرموودە دەربهێنم بەڵام لەو کاتەدا کەرەستەی تەواو و تێشوی زانستیم کەم بوو.

بەڵام دواتر لام کردەوە بەلای قورئانداو حەزم کرد وانەی بەسود لە قورئان هەڵبگۆزم کە سەرچاوەی یەکەمی ئیسلامەکەمانەو لەو بوارەدا کتێبی (لە سورەتی یوسفدا دیومە)م نووسی.

دواتر کە ئەم کتێبە زۆر چاكو بەپێزەی کاك عادل غامدی م بینی، ئیتر بە پێویستم زانی خۆم شت بنووسم بۆیە هەستام بە وەرگێڕانی بۆ سەر زمانە ناوازەکەی خۆمانو لە بواری پەروەردەکردندا ملۆیەکم لەسەر کتێبخانەی هەژاری کوردی داناو بۆ زیاتر سوودارکردنیشی خۆم لەکاتی پێویستدا خاڵم بۆ زیادکردووەو خستوومەتە نێوان کەوانەوەو لەپەراوێزی لاپەڕەکاندا نووسیومە (وتەی وەرگێڕ).

جا داوا لە دایكو باوکانی غەمخوار دەکەم کە ئەم کتێبە زۆر بەجوانی بخوێننەوەو پاشان منداڵەکانیانی لێ ئاشنا بکەنو لەسەری پەروەردەیان بکەن..

هەر کاتێکیش پێویستی کرد هەندێك خاڵی کتێبەکە بە کردەوە جێ بەجێ بکرێت وەك پەروەردەکردنی قوتابی لەسەر مەلەوانیو تیرئەندازیو شتی تر با خۆی بادیەك بکرێتو نیشانەشکێنی بە قوتابیەکان بکاتو ئەگەر کرایش سەردانی مەلەوانگەکانیان پێ بکاتو بەناو ئاوو مەلەوانی ئاشنایان بکات..

لەکۆتاییـدا لـە خـوا دەپاڕێمـەوە ئـەم کـارەم لێ قبـوڵ بکـاتو لـەناو کۆمـەڵی موسڵمانانیشدا بیکاتە مایەی قەبوڵو سوودی لێ وەربگرن انشاءالله. (أقـول قـولي هـذا واستغفرالله لي ولكم امين).

عمر توفيق الخطاط

٢٠١٠/١٠/١٣ – هەڵەبجەی شەهید/ گوڵان

## پێشەکی نووسەر

سوپاس بۆ ئەو خوایەی دروستکەرە بە ڕێکوپێکی، هەموو شتێکی دیاری کردووەو پاشان ڕێنموونیشی کردووە، هەردوو ڕەگەزی نێرو مێی دروستکردووە، مرۆڤیشی لە خۆڵ دروستکردووە، پاشان لە شێوەی تۆودا لە جێیەکی ئارامشدا دایناوە، پاش ئەوە کردوویەتی بە ئاوپارەو ئاوپارەکەشی کردۆتە پارچە گۆشتێکو پاشتر کردوویەتی بە ئێسقانو پاشان بە گۆشت دەوری ئێسقانەکانی داوەو پاشان خەڵکانێکی زۆری بەو چەشنە دروستکردووەو بەرزیو بێ هاوتایی بۆ ئەو خوایەی کە باشترین دروستکەرە.

هەر ئەو خوایەش فەرموویەتی ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانًا وَإِنَٰثًاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ﴾ (الشورى: ٤٩-٥٠) واتە پاش ئەو قۆناغانەی کە باسمان کرد خۆی بڕیاردەر دەدات کە کچ ببەخشێت بە هەر کەسێك خۆی مەبەستی بێتو کوڕیش بە هەر کەسێك خۆی مەبەستی بێت یان لە کوڕ و لە کچ بەشیان دەداتو هەندێکیش بە نەزۆکی دەهێڵێتەوەو چونکە خوا زۆر زاناو بە توانایە.

وە شایەتیش دەدەم کە محمد (ﷺ) بەندەو پێغەمبەری ئەو خوایەیەو سەلاتو سەلامی بێ شماری بۆ دەنێرم.

خوای (عز وجل)یش دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ (سورەتی تەحریم) ئایەتی ٦.

وە پێغەمبەریش (ﷺ)دەفەرموێت ((كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته، فالامام راعٍ، ، وهو مسؤل عن رعيته، والرجل راعٍ في أهلهِ وهو مسؤل عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسؤلة عن رعيتها)) رواه البخاري (٨٩٣).

واتە: هەمووتان شوانن‌و هەمووشتان بەرپرسیارن لە ژێردەستەکنیان، سەرکردەو پێشەواکان شوانن‌و بەرپرس دەبن لە میللەتە ژێردەستەکانتان، پیاویش لەناو ماڵدا شوانەو بەرپرسە لە خانەوادەکەی ژێردەستی، ئافرەتیش چاودێری منداڵی مێردەکەیەتی‌و بەرپرسە لەو شتانەی لەژێر دەستیدان.

وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بە عبداللەی کوڕی عەمری فەرموو ((وان لولدك عليك حقاً)) رواه مسلم ٢٧٠١.

واتە ئەی عبدالله کوڕەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە.

ئەی برای پەروەردەکارم، سەربەرزو سەرکەوتوو ئەو کەسەیە خوا چاکی بۆ دەکات‌و منداڵەکانی بە جوانی پەروەردە دەکات‌و لەسەر ئیسلام‌و سونەت‌و ڕێڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) گۆشیان بکات‌و لە خوا دەترسێت‌و بە چاودێری خۆی دەزانێت‌و منداڵەکانی پشتگوێ ناخات، بە زویرکردنیان خوای لە خۆی ڕازی کردووە نەك بە ڕازی کردنی ئەوان خوا لە خۆی زویربکات، زۆر بەئاگابووە لە بەڵای ماڵ‌و منداڵ‌و دوژمنایەتیان وەك چۆن خوای تەعالا فەرمانی بەو کارە داوەو فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ﴾ التغابن ١٤).

واتە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران هەندێك لە خێزان‌و منداڵەکانتان دەبنە دوژمنتان ئاگاداریان بن‌و حەزەریان لێ بکەن.

زانای موسڵمان (موجاهد) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت ((چونکە ئەوان هانی پیاوەکە دەدەن سەردانی خزمەکانی نەکات، هەروەها سەرپێچی خوایش بکات، ئەویش چونکە خۆشی دەوێت ناتوانێت بە قسەیان نەکات))[1].

---

١ راوه ابن جرير في تفسيره (١٢٥/٢٨)

وە بەڕاستی جێگەی داخە كە زۆرێك لە باوكانو بەرپرسیارانی كاروبارەكان لەو بەرپرسیارێتیە خۆیان دەدزنەوە كە خراوەتە ئەستۆیان كە ئەویش پەروەردەكردنی منداڵەكانیانو فێركردنیان دەربارەی ڕێنماییەكانی ئایینەكەیانو بیانپارێزن لە سزای سەختی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا...

ئەوەی ئەمڕۆ سەرنجی پەروەردەكردنی منداڵان لەلایەن باوكو دایكانەوە بدات بۆی دەردەكەوێت كە تەنها گرنگی بەلایەنی جەستەییو خۆشگوزەرانی منداڵەكانیان دەدەن ئیتر با پێچەوانەی شەرعیش بێت، بۆیە دەیانبینیت گرنگی بە خواردنو جلو بەرگیان دەدەنو پارەو بەخشش دەڕێژنن بەسەریاندا كە ئەوەش زۆرجار دەبێتە هۆی لادانی ئەو منداڵە لە ڕێگەی ڕاست، كە بەو كارەش خۆیان و منداڵەكانیشیان بەرەو هەڵدێریو لەناوچوون دەبەن.

ئەمەش (سوفیانی سەوری)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ((فەرمان دەدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا بەوەی پیاوێك بخەنە ناو ئاگرەوەو پێی دەڵێن: ئەمە خێزانوماڵو منداڵەكەیەتی هەموو چاكەكانیان لەناوبردووە))[١].

(ابن قیم)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت ((زۆربەی منداڵەكان كە ڕەوشتیان تێكدەچێت بەهۆی باوكو دایكیانەوەیەو لە ڕێگەی پشتگوێ خستنیانەوەو وازهێنانیان لە فێركردنی فەرمانەكانی ئایینو سوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ)و هەر بە منداڵی فەوتاندنیانو ئیتر نە سوودیان بۆ خۆیانو نە بۆ دایكو باوكیان داوەتەوە، هەروەك چۆن منداڵێك سەرزەنشتی باوكی دەكات كاتێك باوكی پێی دەڵێت تۆ كوڕێكی زۆر خراپی بۆمانو ئەویش بە باوكی دەڵێت: باوكە گیان، تۆ بە منداڵی لەگەڵ مندا خراپ بوویتو منیش لە گەورەییدا لەگەڵ تۆ خراپ دەبم، بە منداڵی منت فەوتاندو منیش بە گەورەیی تۆم فەوتاند)).

---

١ الحلية (أبو نعيم) (٨١/٧).

بۆیە منیش خوای گەورە كۆمەكی كردووم بۆ كۆكردنەوەی هەموو ئەو ئەحكامو فەرمانانەی كە پێویستە هەموو موسڵمانێك بیزانێت لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیدا ئەگەر خواوەند نەوەی پێ بەخشیبوو.

تا لەسەر چاوڕۆشنیو زانست پەروەردەیان بكاتو ئەوكاتە فەرمانی خوا جێ بەجێ بكات كە دەفەرموێت ماڵو منداڵتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزنو خۆیشی ڕزگار بكات لە لێپرسینەوەی لە بەردەم خوای پەروەردگاردا دەربارەی خێزانەكەی ژێردەستی، كە هەڕەشەی ترسناك هەیە بۆ ئەو كەسانەی كە ژێردەستەكانیان دەفەوتێننو فەرمانی گوێڕایەڵیكردنی خوایان فێرناكەن، هەروەك لەو فەرموودەیە هاتووە كە مەعقەڵی كوڕی یەسار (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) فەرموویەتی: ((مامن عبد یسترعیه الله رعیة، یموت یوم یموت وهو غاش لرعیته، الا حرم الله علیه الجنة))[1]

واتە: هیچ كەسێك نیە كە خوا كەسانێكی خستبێتە ژێر دەستی، وە بمرێتو لەو كاتەدا كە دەمرێت ناپاك بێت بەرامبەریان ئەوا خوا بەهەشتی لێ حەرام دەكات..

كەواتە ئەی دایكو باوكانی ئازیز مەسەلەكە ئاسایی نیەو زۆر ترسناكەو لێپرسینەوەكە زۆر گەورەیە، بە تایبەتی لەم زەمانەی دواییەی خۆماندا، كە هاوكارو دەستكر زۆر كەم بۆتەوەو چاكەكردن غەریبو نامۆ بووەو هۆكاری تێكدانی ڕەوشت زۆر بووە خوا ڕەحم بكات.

*　　　　*　　　　*

لەم كتێبەدا (چل) فەرموودەی صەحیحم كۆكردۆتەوە دەربارەی پەروەردەكردنی منداڵو پاشان لەسەری ڕۆیشتوومو ڕوونكردنەوەم داوە لەسەریان بە ئەندازەی ئەوەی فەرموودەكان هەڵیدەگرێت، لەم كارەمدا هەوڵمداوە بە كورتیو بە ئاسانی ڕوونی

---

١ رواه مسلم (٢٨٠)

بکەمەوە، مەگەر فەرموودەکە زیاتر بخوازێتو بە درێژی لەسەری ڕۆیشتووم چونکە یان لەبەرئەوەی زانیاری لەو بارەیەوە کەمە یان ئەو باسە نەکراوە لەلایەن خەڵکیەوە.

بۆ شەرحی هەندێکی پەنام بردووە بۆ وتەی زانایانی ئەم دواییە (متـأخرين) چونکە لە زانایانی پێشینەوە شتێکم لەو بارەوە دەست نەکەوتووە یان ویستوومە باسەکە بە کورتی ببڕمەوە یان ئەو مەسەلەیە تازەو نامۆیەو دەبینم زۆر زەرورە قسە بکەم لەو بارەیەوە.

وە لە ئاکامدا سوپاس بۆ خوا زیاتر لە هەزار فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و بەسەرهاتی هاوەڵانو قسەی زانایانم نەقڵ کردووە.

* * *

پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ((شایانە هەڵگری زانست خاوەنی ئەدەبو ویقارو لەسەرخۆییو لەخواترسان بێتو دەبێت شوێن کەوتەی زانایانی پێش خۆی بێت))[1]

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ((هەڵگرانی فەرموودە سەیرن! مەسەلەیەکیان دێتە بەردەست لە حەسەنی بەسریو ابن سیرینو عەتاو تاوسەوە گێڕراوەتەوە کەچی دەڕۆن بۆ لای خاوەن ڕاو بۆچوونو لەوان دەپرسن، دەی ناکرێت زانست لەو زانا گەورانە وەربگرن))[2]

پێشەوا (ئاجوری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (الشريعة(١/٣٠١))دا دەفەرموێت: ((نیشانەی ئەو کەسانەی خوای عز وجل ویستی چاکەی پێیانە ئەم ڕەوشتانەیە: کارکردن بە قورئانەکەی پەروەردگارو سوننەتو ڕێڕەوی پێغەمبەر (ﷺ)و بۆچوونەکانی هاوەڵانی لەدوای خۆی و پاشان بۆچوونی ئەوانەی لەدوای

---

١رواه البيهقي في المدخل (٥١٠)

٢ طبقات الحنابلة (١/٢٣٨)

هاوەڵان هاتن بە چاكەو پاشان زانا مەزنەكانی هەموو شارو هەرێمەكانی وڵاتانی ئیسلام وەك پێشەوایان ئەوزاعیو سوفیانی سەوریو مالیكی كوڕی ئەنەسو شافیعیو أحمدی كوڕی حەنبەلو قاسمی كوڕی سەلامو وازهێنان لە هەر بۆچوونو ڕێڕەوێك كە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوان بێت)).

*  *  *

منیش لەم كارەمدا كە هەستاوم بە كۆكردنەوەی (٤٠) فەرموودە، نامۆ نیم لەم بوارەداو زانایانی پێشووو ئەم كارەیان كردووە كە (٤٠) فەرموودەیان كۆكردۆتەوە كە باس لە یەك بابەت بكاتو هەریەكەیان بە مەبەستێك كۆی كردووەتەوە وە هەندێك لە بواری بیروباوەڕداو هەندێك لە بواری حوكمی شەرعیدا نووسیویانەو كۆنترینیان ئەمانەبوون:

١- كتێبی (الاربعین في الحدیث)ی عبداللەی كوڕی موبارەك كە لە ساڵی (١٨١)ی كۆچیدا نووسیویەتی.

٢- كتێبی (الاربعین)ی محمدی كوڕی ئەسلەمی طوسی لە (٢٤٢)دا نوسیویەتی

٣- كتێبی (الاربعین حدیثا)ی محمدی كوڕی حوسەین الاجوری لە ساڵی (٣٦٠)ی كۆچیدا نوسیویەتی.

٤- كتێبی (الاربعین حدیثا)ی ئیمام نەوەوی.

دیارە هۆی كۆكردنەوەی (٤٠) فەرموودەكان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەرموودەیەی كە لە چەند ڕێگایەكەوە گێڕراوەتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((مَن حفظ علی امتی اربعین حدیثا من أمر دینها، بعثه الله یوم القیامة في زمرة الفقهاء والعلماء)).

واتە: هەر موسڵمانێك چل فەرموودە دەربارەی كاروباری ئایینەكەی لەبەربكاتو بیپارێزێت بۆیان ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕیزی زاناو شارەزایانی شەریعەتدا حەشر دەكرێت.

ئەم فەرموودەیە لە زیاتر لە (٣٠) ڕیوایەتەوە گێڕراوەتەوە (هەموو ڕیوایەتەكانیش لاوازیان پێوە دیارە) بەڵام زاناكان بەردەوام قبوڵیان كردووەو كاریان لەسەر كردووە ئەمەش لەبەرئەوەی كە یان لاوازیەكانیان زۆرنیە یان لە بابی هاندان بۆ كردەوە باشەكانەو سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە چاویان لێ داخستووە.

منیش لێرەدا هاتووم لەم بارەیەوە پشكێك دەست بخەمو (٤٠) فەرموودەی (صەحیح)م كۆكردۆتەوە لە بواری ئادابو پەروەردەكردنی منداڵداو ناوم لێناوە ((الاحتفال باحكام وأداب الاطفال)).

وە لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی ((من لم یشكر الناس لم یشكر الله))و هەر كەس سوپاسی خەڵكی نەكات سوپاسی خوایش ناكات، بۆیە دەبێت سوپاسێكی تایبەتی ئاراستەی مامۆستای بەڕێزم مامۆستا عبدالله ی كوڕی عبدالعزیزی كوڕی عەقیل كە هەستا بە پێداچوونەوەو پێشكەش كردنی ئەم بەرهەمەم بە چەند وشەیەكی جوانو سوودبەخش.

لە خوای (عزّ وجلّ) خوازیارم ئەم كارەم پڕاوپڕ بۆ ئەو بێتو لە ڕێڕەوی سوننەت نەترازێتو پیرۆزو سوودبەخشی بكاتو خوایش لە پشتی هەموو مەبەستەكانەوەیەو درودو ڕەحمەتیش بۆ گیانی پاكی پێغەمبەرمانو هاوەڵو شوێنكەوتوانی.

أبو عبدالله عادل بن عبدالله الحمدان

# چل فەرموودە لەبارەی منداڵانەوە

## فەرموودەی یەكەم

### كۆرپە بە سروشتی باوەڕەوە لەدایك دەبێت:

عن أبی هریرة (ﷺ) قال: قال النبي ((ﷺ) ((مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأبَوَاهُ يُهوِّدَانِهِ أو يُنَصِّرَانِهِ أو يُمَجِّسَانِهِ، كما تنتج البهيمة بهيمة عجماء، هَل تحسون فِيها مِن جدعاء)).

واتە: هەموو كۆرپەیەك لەسەر سروشتی پاكی باوەڕ لەدایك دەبێت بەڵام پاشتر باوكو دایكەكەی دەیكەن بە جولەكە، یان گاور، یان مەجوسێكی ئاگرپەرست، هەروەك چۆن ئاژەل كۆرپەیەكی تەواو بێ عەیبی دەبێت ئایا دیوتانە ئاژەڵێكی كۆڵیان ببێت.

## فەرموودەی دووەم

### منداڵ فێری یەكتا پەرستیو سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بكرێت:

عن ابن عباس (رضی الله عنهما) قال: كنت خلف النبي (ﷺ) يوماً، فقال: ((يَا غُلاَمُ إِنِّی أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، وَإِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعت عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشیءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَیْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللّهُ لَكَ، وَان اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَیءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَیْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ)).

واتە: عبداللەی كوڕی عباس (خوا لە هەردووكیان ڕازی ببێت) دەڵێت: لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) دەڕۆیشتم ڕووی تێكردم فەرمووی: ئەی لاو من چەند وشەیەكت فێردەكەم: سنوری خوا بپارێزە خوایش تۆ دەپارێزێت، سنوری خوا بپارێزە خوایش ڕووی پیرۆزیت تێ دەكات، ئەگەر داوای شتێكت كرد تەنها لە خوای گەورە داوا بكە، ئەگەر هانات بۆ كەسێك برد تەنها بۆ خوا هانا ببە، وە (عەباس گیان) چاكیش بزانە

ئەگەر هەموو ئوممەت كۆببنەوە كە سودێكت پێ بگەیەنن، ناتوانن مەگەر ئەو ئەندازەیەی كە خوای گەورە بۆی نووسیویت، ئەگەر كۆببنەوەو بیانەوێت زیانێكت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی كە خوا لەسەرت نووسیویەتی، قەڵەم هەڵگیراوەو لاپەڕەكانیش وشك بوونەتەوە.

## فەرموودەی سێیەم

### منداڵی صاڵح:

عن ابي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال ((إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)).

واتە: هەر كاتێك ئادەمیزاد بمرێت دەستی دەبڕێت لە چاكەكردن مەگەر لە سێ شتدا: یەكەم: خێرێكی بەردەوامی لەدوای خۆی بەجێ هێشتبێت، دووەم: یان زانستێكی بەسوود، سێیەم: یان نەوەیەكی صاڵحی بەجێ هێشتبێتو لەدوای خۆی دوعای خێری بۆ بكات.

## فەرموودەی چوارەم

### قورئان فێركردنی منداڵان:

عن ابن عباس (رضى الله عنهما): (توفي رسول الله (ﷺ) وَأَنَا إِبنُ عَشرِ سنين، وَقَد قَرَاتُ المُحكم، قال شعبة: قُلتُ لِأبي بِشرٍ، ما المُحكَم؟ قال: المُفصَّل).

واتە: عبداللەی كوڕی عەباس (خوا لە هەردووكیان ڕازی ببێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) كۆچی فەرموو لە دنیا دەرچوو، من تەمەنم دە ساڵان بوو، هەموو سورەتە (مەحكەمەكانم) خوێندبوو، شوعبە دەڵێت: بە باوكی بیشرم ووت: مەحكەم یانی چی؟ لە وەڵامدا وتی: واتە سورەتە درێژەكان.

## فەرموودەی پێنجەم

## منداڵان و زانست فێرکردنیان:

عن ابن عباس (رضى الله عنهما) قـال: ان الـنبي (ﷺ) دخـل الخـلاء، فوضـعت لـه وَضوءاً، قال: مَن وضع هذا؟ فأخبر، فقال: (( اللّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ)).

واتە: (ابن عبـاس) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) چـوو بـۆ سەرئاو، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ حازر کرد، ئەویش فەرمووی: کـێ ئـەم ئـاوەی بـۆ ئامادەکردووم؟ ئەوانیش پێیـان ووت، ئـەویش فـەرمووی: ئـەی پـەروەردگارم لـە ئـاین شارەزای بکەو زانستی لێکدانەوەی فێربکە.

## فەرموودەی شەشەم

## میزی منداڵ و حوکمی شەرع:

عن أُم قيس بنت محصن(رضي الله عنها): انها أتت بابن لها صغير لم ياكل الطعام الى رسول الله (ﷺ)، فاجلسه رسول الله (ﷺ)في حجره، فبـال علـى ثوبـه، فـدعاه بمـاء، فنضحه ولم يغسله).

واتە: دایکی قەیسی کچی موحـصن (خـوا لێـی ڕازی بێـت) جارێـك كـورێكی بـچوکی خـۆی هێنایـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) کـە هێـشتا نەکـەوتبووە خـواردن، پێغەمبەریش (ﷺ) لە باوەشیدا دایینیشاندو منداڵەکەش میزی کرد بەخۆیداو جلەکانی پێغەمبەری (ﷺ) تەڕکردو داوای ئاوی کردو ئاوەکەی لێ پڕژاندو نەیشۆرد.

## فەرموودەی حەوتەم

## خەتەنەکردنی منداڵ:

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال النبي (ﷺ) ((الْفِطْـرَةُ خَمْـسٌ: الْخِتَـانُ، وَالاِسْـتِحْدَادُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ )).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: پێـنج شـت لـە سروشـتی پاکـەوەن: خەتەنەکردن، لابردنی مووی بەر، بن باڵ کردن، سمێڵ کورت کردنەوە، نینۆك کردن.

## فەرموودەی هەشتەم

## منداڵان لە حەوتساڵیدا دەبێت نوێژ بکەن:

عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال: قال النبي (ﷺ) ((مُرُوا أَبْنَاءَكُمْ بِالصَّلَاةِ لِسَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا لِعَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ))

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: فەرمان بەسەر منداڵەکانتاندا بدەن بە نوێژکرن لە تەمەنی حەوت ساڵییەوەو لە تەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەنو کوڕانو کچان لەیەك جیابکەنەوە لە شوێنی خەوتنیان.

## فەرموودەی نۆیەم

## منداڵ گرتن بەباوەشەوە لە نوێژدا:

عن ابي قتادة (رضي الله عنه) صاحب رسول الله (ﷺ) قال: بينما نحن ننتظر رسول الله (ﷺ) للصلاة في الظهر أو العصر، وقد دعاه بلال للصلاة، اذ خرج الينا وأُمامة بنت أبي العاص بنت إبنته على عنقه، فقام رسول الله (ﷺ) في مصلاهُ، وقمنا خلفه، وهي في مكانها الذي هي فيه، قال: فكبَّر، فَكبَّرنا، قال: حتّى إذا أراد رسول الله (ﷺ) ان يركع اخذها فوضعها ثم ركع وسجد، حتى إذا فرغ من سجوده، ثم قام، اخذها فردها في مكانها، فما زال رسول الله (ﷺ) يصنع بها ذلك في كل ركعة حتى فَرِغَ من صلاته)).

واتە: هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئەبو قتادە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئێمە لە مزگەوت بووین چاوەڕوانی نوێژمان دەکرد نیوەڕۆ یان عەسر، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی دا بە بیلال بانگ بدات، لەو کاتەدا (ئومامەی کچی ئەبی عاص) کە کچەزای بوو بە قەڵادوشکانیەوە بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا بۆ نوێژو ئێمەیش هەموو لەدوایەوە وەستاین (الله اکبر)ی کردو ئێمەیش (الله أكبر)مان کردو نوێژمان دابەستو پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو منداڵەی گرت بە باوەشیەوەو هەرکاتێك دەچوو بە سوجدەدا لە بەردەمی خۆیدا دایدەناو کە هەڵدەستایەوە دووبارە دەیگرتەوە بە باوەشیەوەو بەو جۆرەی کرد تا لە نوێژ بوویەوە.

## فەرموودەی دەیەم

### نوێژی مردوو لەسەر منداڵی کۆچکردوو:

عن المغيرة بن شعبة (رضي الله عنه) قـال: سمعـت رسـول الله (صلى الله عليه وسلم) يقـول: ))الطِّفْـلُ يُـصَلَّى عَلَيْهِ)).

واتـە: مـوغیرەی کـوڕی شـوعبە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: گـوێم لێ بـوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێت.

## فەرموودەی یازدەیەم

### ڕۆژووگرتنی منداڵان:

عن الربيع بنت معوذ (رضى الله عنهما) قالت: أرسل الـنبي (صلى الله عليه وسلم) غـداة عاشـوراء الى قرى الانصار: ((مَنْ أصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ ، وَمَنْ أصْبَحَ صَائمًا فَلْيَصُمْ)).

قالت فكنا نصومه بعد، ونصوم صبياننا، ونجعـل لهـم اللعبـة مـن العهـن، فـاذا بكـى أحدهم على الطعام اعطيناه ذاك حتى يكون عند الافطار)).

## فەرموودەی دوازدەیەم

### زەکاتی سەرفیترە لەسەر منداڵان:

عن عبدالله بن عمر (رضى الله عنهما) قال: فرض رسول الله (صلى الله عليه وسلم) زَكَاةَ الْفِطْرِ صَـاعًا مِـنْ تَمْـرٍ أوْ صَـاعًا مِـنْ شَـعِيرٍ عَلَـى الْعَبْـدِ والْحُـرِّ وَالـذَّكَرِ وَالأُنْثَـى وَالـصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِـنَ الْمُسْلِمِينَ. وَأمَرِبهَا أن تُؤدىَ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ))

واتە: عبدالله کوڕی عومەر (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) دەفـەرموێ((پێغەمبـەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زەکاتی سەرفیترەی مەزەندەکرد بە ساعێك لە خورما یان ساعێك لە جۆ – کە نزیکەی دوو کیلۆ دەکات– و فەرزی کرد لە سەر بەندەو ئازادو نێـرو مـێو گـەورەو بچووکی موسڵمانانو فەرمانی دەرکرد کە پێش ئەوەی نوێژی جەژن بکرێت، بدرێت)).

## فەرموودەی سیازدەیەم

### حەجکردنی منداڵان:

عن عبدالله بن عباس (رضی الله عنهما) قال: رفعت إمراة صبياناً لها، فقالت يارسول الله الهذا حج؟ قال: ((نَعم ولَك أجر)).

واتە: ئافرەتێك منداڵێكی خۆی بەرزكردەوەو پرسی: ئایا ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ تۆش پاداشتی خێرت دەبێت.

## فەرموودەی چواردەیەم

### كوشتنی منداڵی كافران لە جەنگدا:

عن عبدالله بن عمر (رضی الله عنهما) قال: ان إمراة وُجدت في بعض مغازي النبي (ﷺ) مقتولة، فانكر، فنهى رسول الله (ﷺ) عن قتل النساء والصبيان)).

واتە:عبدالله ی كوڕی عومەر (خوایان لیّ ڕازیبێت) دەفەرموێ:ئافرەتێكیان بەرچاو كەوت لە غەزایەكدا كوژرابوو،پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕازی نەبوو، فەرمانی دەركرد بە قەدەغەكردنی كوشتنی ژنانو منداڵان))

واتە: لە عبدالەی كوڕی عمرەوە (خوایان لیّ ڕازی بێت) فەرموویەتی: لە یەكێك لە غەزاكانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت). ئافرەتێك بە كوژراوی دۆزرایەوە پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر پێی ناخۆش بوو، لەپاش ئەوە فەرمانی دەركرد كە نابێت ژنو منداڵ بكوژرێت.

## فەرموودەی پازدەیەم

### بەشوودانی منداڵان:

عـن عائیـشة (رضـي الله عنهـا) ((ان النبـی (ﷺ) تزوجهـا وهـي بنـت سـت سـنين، وادخلت عليه وهي بنت تسع سنين، ومكث عنده تسعاً))

واتە: لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) مارەی کرد لە تەمەنی (شەش ساڵیدا)و گواستیەوە لە کاتێك تەمەنی بووبە (نۆ ساڵ)و نۆ ساڵیش لەلای مایەوە.

## فەرموودەی شازدەیەم

### داری حەد نادرێت لە منداڵان:

عن علي (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال:(( رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّـى يَـسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيُّ حَتَّى يَكْبَرَ وَعَنِ المَجنُوْنِ حَتَّى يعقل))

واتە: لە عەلی (ڕەزای خوای لەسـەر بێـت) لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: (قەلـەم لەسـەر سـێ کـەس هـەڵگیراوە، لەسـەر خـەوتوو تـا هەڵدەستێتو لەسەر منداڵ هەتا باڵق دەبێتو لەسەر شێتیش تا ژیرو چاك دەبێتەوە)

## فەرموودەی حەڤدەیەم

### منداڵ کەی میراتی دەکەوێت:

عن جابر بن عبدالله والمسور بن مخرمة (رضـی الله عنهمـا) قـالا: قـال رسـول الله ((لاَ يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخًا، وَاسْتِهْلاَلُهُ أنْ يَبْكِيَ أو يَصِيحَ أوْ يَعْطِسَ))

واتـە: هـەردوو هـاوەڵی پێغەمبـەرمان (ﷺ) گێڕاویانەتـەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: منـداڵی کۆرپـە میراتـی ناکـەوێت تـا لـەکاتی لـە دایکبووندا هـاواری لێ بەرزنەبێتەوە وەك گریان یان هاوار یان پژمە.

## فەرموودەی هەژدەیەم

## دابینکردنی خەرجی منداڵان:

عن عائيشة (رضي الله عنها) قالت: دخلت هند بنت عتبة (إمراة أبـي سـفيان) (رضـى الله عنهمـا) علـى رسـول الله (ﷺ) فقالـت: يارسـول الله ، ان أبـا سـفيان رجـل شـحيح، لايعطيني مايكفيني ويكفي بنيَّ، الا ماأخذت من ماله بغير علمـه، فهـل علـىّ في ذلـك مـن جناح؟ فقال رسول الله (ﷺ): ((خُذِى مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِى بَنِيكِ))

واتـە: عائیـشە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: هنـدی كـچی عوتبـەی خێزانی ئـەبو سـوفیان (خـوای لێ ڕازی بێـت) هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)و عەرزی كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەبوسـوفیان پیـاوێكی چـروكو دەسـت قوچـاوە ئەوەندە پارەم ناداتێ تا بەشی خۆمو منداڵەكانم بكات مەگەر بەدزیـەوە لـە پارەكـانیم بردبێـت، ئایـا مـن گوناهبـار دەبم؟ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: بەشـێوەیەكی جوانو بەپێی پێویستیتان لە پارەكانی بەرە.

## فەرموودەی نۆزدەیەم

## شیرپێدانی منداڵان:

عن أبي امامة الباهلي (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((:« بَيْنَا أنـا نَـائِمٌ إِذْ أَتَانِى رَجُلَانِ فَأَخَذَا بِضَبْعَىَّ فَأَتَيَا بِى جَبَلاً وَعْرًا فَقَالاَ لِـىَ : اصْـعَدْ، حتـى إذا كنـت في سواء الجبل فاذا أنا بصوت شديد فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ الأَصْوَاتُ قَالُوا : هَذَا عُوَاءُ أَهْـلِ النَّـارِ ، ثُمَّ انْطُلِقَ بِى فَإِذَا أَنَا بِقَـوْمٍ مُعَلَّقِـينَ بِعَـرَاقِيبِهِمْ، مُشَقَّقَةٌ أَشْـدَاقُهُمْ، تَـسِيلُ أَشْـدَاقُهُمْ دَمًـا، فقُلْتُ : مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قيلَ : هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يُفْطِرُونَ قَبْلَ تَحِلَّةِ صَوْمِهِمْ، ثُمَّ انْطُلِقَ بِى فَإِذَا بقومٍ اشـدّ شَـيىءٍ إنتفَاخـاً، وانتنـهُ رِيحَـاً، وَاسـوئه منظـراً، فقلـت مَـنْ هَؤُلَاءِ؟قيـلَ: الزانـون وَالزَواني، ثُمَّ انْطُلِقَ بِى فَإِذَا بِنسَاءٍ تنهش ثَدِيهنَّ الحيّات، فَقُلتُ مَا بَال هؤلاء؟ قيلَ هَؤُلاء اللاتـي يَمنعنَ أولادهُنّ البَانهنّ، ثُمَّ انْطُلِقَ بِى فَإِذَا أنا بِغلمَان يَلعَبُون بَينَ نَهرَين، فَقُلتُ مَـن

هَؤُلاء؟ هؤلاء ذَراري المُؤمِنين، ثُم شرف بي شرفاً، فَإذَا أنَا بِثَلاثَة يَشربوُنَ مِن خَمر لَهُم، فَقُلتُ: مَن هؤلاء؟ قَالُو: هذَا ابرَاهِيم وَمُوسَى وَعِيسَى وَهُم يَنتَظِرُونك)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: خەوتبووم لە خەومدا دوو پیاو هاتن بۆمو کردیان بەبن دەستمدا بە کەژێکی سەختدا سەریان خستمو پێیان وتم: سەرکەوە تا گەیشتمە سەر کێوەکەو لەپڕ گوێم لە دەنگێکی زۆر توند بوو، وتم: ئەم دەنگە چییە؟ وتیان: ئەمە گریانو هاواری جەهەننەمیەکانە.

پاشان بردمیان بۆ لای خەڵکێك کە بە ڕەقەڵتەی ملٚ هەڵواسرابوون، چەناگەیان شەقو چەناگەیان خوێنی لێ دەچۆڕا، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەو کەسانەن پێش ڕۆژوو شکاندن ڕۆژووەکانیان دەشکێنن، پاشان بردمیان بەلای خەڵکانێکدا لە هەموو شتێك زیاتر فویان تێ بووبوو، بۆنیان پیس بوو، شێوەیان ناشیرین بوو، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ژنو پیاوە زیناکەرو شەرواڵ پیسەکانن.

پاشان بردمیان بەلای کۆمەڵە ژنێکدا کە مار بەربوو بوونە سنگو مەمکەیانو گۆشتەکەیان شیو شیتاڵ کردبوویەوە، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەو ژنانەن نەیانهێشتووە منداڵەکانیان شیریان بمژنو بیخۆنەوە.

پاشان دامیان بەلای کۆمەڵێك منداڵدا لەنێوان دوو ڕووباردا یاریان دەکرد، وتم ئەمانە کێن؟ وتیان: منداڵی باوەڕدارەکانن (واتە بە منداڵی مردوون).

پاشان لە بەرزاییەکەوە بردمیان دەبینم سێ کەس دانیشتونو مەی دەخۆنەوە وتم: ئەوانە کێن؟ وتیان: ئەمانە ئیبراهیمو موساو عیسی پێغەمبەرنو چاوەڕوانی تۆ دەکەن).

## فەرموودەی بیستەم

## کێ شایەنە کۆرپەڵە بەخێو بکات:

عن عبدالله بن عمر (رضى الله عنهما) ان امراة قالت: يا رسول الله (ﷺ) ان ابني هذا كان بطني له وعاء، وثدي له سقاء، وحجري له حواء، وان أباه طَلَّقني، وأراد ان ينتزعه مني، فَقال لها رسول الله (ﷺ)((أنتِ أحَقُ بِه مَالَم تنكحي))

واتە: جارێکیان ژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێی وت: ئەم کۆرپەیەم بە پێستی سکم هەڵمگرتووە، بەم مەمکانەم شیرم پێداوە، باوەشم بۆ کردبووە جێی حەوانەوە، کەچی باوکی تەڵاقی داوم‌و دەشیەوێت بەزۆر لێم بسەنێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ئەو منداڵە هی تۆیە تا شوو دەکەیتەوە.

## فەرموودەی بیست‌و یەکەم

## داد پەروەری لەنێوان منداڵاندا:

عن نُعمان بن بشير (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): إعدِلُوا بَينَ أبنَائِكُم، إعدِلُوا بَينَ أبنَائِكُم)).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دادپەروەربن لەگەڵ منداڵەکانتاندا.. دادپەروەربن لەگەڵ منداڵەکانتاندا)).

## فەرموودەی بیست‌و دووەم

## ناونانی منداڵان:

عن عبدالله بن عمر (رضى الله عنهما) قال قال رسول الله (ﷺ) ((إنَّ أحبُ أسمَائِكُم إلَى الله: عَبدالله وعَبدُالرَّحمن)).

واتە: خۆشەویسترین ناوی ئێوە لەلای خوا دوو ناوە: ((عبدالله و عبدالرحمن)).

## فەرموودەی بیستو سێیەم

## شیرین کردنی ناو دەمی کۆرپەلە:

عن عائیشة (رضي الله عنها): ان رسول الله (ﷺ) كَانَ يُؤتى بِالصبيَان، فَيبرك عَلَيهم وَيحنكهُم)).

واتە: منداڵی تازە لەدایکبوویان دەهێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەویش موبارەكو پیرۆزیایی لێ دەکردنو پاشان دەمەجوی خورمای بۆ دەکردنو دەیدا لە مەلاشویان).

## فەرموودەی بیستو چوارەم

## حەیوان سەربڕین لە حەوتەی منداڵدا:

عن سُمره (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: ((كُلُّ غُلاَمٍ مُرتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسمَّى)).

واتە: هەموو منداڵێك پەیوەستە بە سەربڕینی مەڕەکەیەوە، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەردەبڕێتو سەری دەتاشرێتو ناویشی دەنرێت.

## فەرموودەی بیستو پێنجەم

## بەزەیی هاتنەوە بە منداڵاندا:

عن عبدالله بن عمرو (رضی الله عنهما) قال: قال رسول الله (ﷺ) ((لَيسَ مِنا مَن لَم يَرحَم صَغيرَنَا، وَيعرف حَقَّ كَبيرَنَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە ئێمە نیە هەر کەسێك بەزەیی بە منداڵەکاندا نەیەتەوەو قەدرو ڕێزی گەورەو بەتەمەنەکانیشمان نەگرێت.

## فەرموودەی بیستو شەشەم

### خێرو گەورەیی كچ بەخێوكردن:

عن انس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ، وَضَمَّ أَصَابِعَهُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: هەر كەسێك دوو كچی هەبێتو پەروەردەیان بكات تا پێدەگەن، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا منو ئەو پێكەوە دەبین، وە پەنجەكانی خستنە پاڵی یەك.

## فەرموودەی بیستو حەوتەم

### خێرو گەورەیی هەتیو بەخێوكردن:

عن سهل بن سعد (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: ((أَنَا وكَافل اليَتيم فِي الجَنَّةِ كَهذا)) وقال بِاصبعه: السبَابَة وَالوُسطَى)).

واتە: سەهلی كوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((منو سەرپەرشتیارو بەخێوكەری هەتیوان لە بەهەشتدا ئا ئاوا پێكەوە دەبین)) بە پەنجەی موبارەكی ئاماژەی كرد بۆ پەنجەی شایەتمانو پەنجەی ناوەڕاستی خۆی))

## فەرموودەی بیستو هەشتەم

### سەبرو ئارامی لەسەر مردنی منداڵ:

عن انس بن مالك (رضي الله عنه) : ان رسول الله (ﷺ) أتى على إمراة تبكي على صبيّ لَها، فَقَالَ لَها: ((إِتَّقِ الله وَاصبِري))، فَقَالت: وَما تبالي بِمصيبتي، فَلما ذَهَب قيل لَها: إِنّهُ رَسول الله (ﷺ)، فَأخذها مثل الموت، فَأتت بابه –فلم تجد على بابه بوابين– فَقالت: يَا رسُول الله، لَم أعرفك، فَقال: ((إنّما الصَّبرُ عِندَ أولِ صَدمَة)) او قال ((عِندَ أوّل الصدمَة)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لای ئافرەتێك بە كوڵ دەگریا بۆ منداڵێكی كە مردبوو، پێی فەرموو: لە خوا بترسەو سەبرو ئارامت هەبێت، ژنەكەش وتی: تۆ چوزانی من چیم بەسەرهاتووە، كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت وتیان دەزانی ئەوە پێغەمبەری خوابوو؟ ئەویش خەریكبوو گیانی دەرچێتو خێرا خۆی گەیاندە بەر دەرگاكەی -كە پاسەوانی لێ نەبوو- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمناسیت، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: ئارامی دروست ئەوەیە لە سەرەتای ڕووداوەكەدا بەئارامو خۆگر بیت)).

## فەرموودەی بیستو نۆیەم

## خێرو گەورەیی ئارامیو خۆگری لەسەر مردنی منداڵ:

عن ابي حسان قال: قلت لأبي هريرة (رضي الله عنه) : انه قد مات لي إبنان، فما أنت بمحديثي عن رسول الله (ﷺ) بحديث: تطيب به أنفسنا عن موتانا؟ قال: قال نعم ((صغارهم دعاميص الجنة، يتلقى أحدهم أباه، أو قال: أبويه فيأخذ بثوبه، او قال: بيده -كما اخذ انا بِصَنِفَةِ ثوبك هذا، فلا يتناهي- او قال: فلا ينتهي حتى يدخله الله وأباه الجنة)).

واتە: ئەبی حەسان دەڵێت: بە ئەبو هورەیرەم وت (خوا لێی ڕازی بێت) من دوو كچم مردووە، دەی فەرموودەیەكم لەو بارەیەوە بۆ بگێڕەوە كە دڵمانی پێ خۆش بكەین بە مردووەكانمان؟ ئەبو هورەیرە فەرمووی: بەڵێ، ئەو منداڵانەی كە دەمرن لە بەهەشتدا وەك بەرخۆلە هاتوچۆ دەكەن بە توندی كراسی باوكو دایكیان ڕادەكێشن یان دەستیان دەگرنو وازناهێنن تا لەئاكامدا لەگەڵ خۆیان دەیانبەنە بەهەشتەوە.

## فەرموودەی سی یەم

## ماچكردنی منداڵان:

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قبَّل رسول الله الحسن بن علي، وعنده الاقرع بن حابس التميمي جالساً، فقال الاقرع: ان لي عشرة من الولد ماقبلت منهم احداً، فَنَظر إلَيه رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ثم قال ((مَن لايَرحَم لايُرحَم))

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەسەنی كوڕی عەلی ماچكرد، لەو كاتەدا ئەقرەعی كوڕی حابیس لەوێ دانیشتبوو، هاواری كردو وتی: دە منداڵم هەیە تا ئێستا یەك دانەیانم ماچ نەكردووە ! پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) سەیرێكی كردو پاشان فەرمووی: ((هەر كەسێك ڕەحمو بەزەیی نەبێت ڕەحمو بەزەیی پێ ناكرێت)).

## فەرموودەی سیو یەكەم

## سڵاوكردن لە منداڵان:

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: أتى علي رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وأنا العب مع الغلمان، قال: فسلم علينا، فبعثني إلى حاجة، فأبطأت على أمي، فلما جئت، قالت: ما حبسك؟ قلت: بعثني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لحاجة، قالت: ما حاجته؟ قلت: انها سِرٌ، قالت: لاتحدثنَّ بِسرِّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) احداً)).

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەفەرموێت: ئێمە كۆمەڵێك منداڵ بووین یاریمان دەكرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ ناومانو سەلامی لێ كردینو منیشی بۆ كارێك نارد، بەو هۆیەوە لە ماڵەوە دواكەوتمو كاتێك گەڕامەوە دایكم لێی پرسیم بۆ وا دواكەوتیت؟ وتم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ كارێك ناردمی، دایكم پرسی: بۆ چ كارێك؟ وتم: كارەكە نهێنی بوو، ئەویش پێی وتم: هەرگیز نهێنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەلای كەس ئاشكرا نەكەیت.

## فەرموودەی سی و دووەم

## دووعای خراپ نەکردن لە منداڵان:

عن جابر بن عبدالله (رضى الله عنهما)قال: قال النبي (ﷺ): ((لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَوْلاَدِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لاَ تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ سَاعَةً يُسأَل فِيهَا عَطَاءً فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: دووعای شەڕ لە خۆتان مەکەن، دووعای شەڕیش لە منداڵەکانتان مەکەن، دووعای شەڕیش لە ماڵو سامانتان مەکەن چونکە نەوەك دووعاکردنەکەت بەری ئەو ساتە وەختە بکەوێت کە خوا داوای هەرچی لێ بکرێت وەڵام دەداتەوەو جێ بەجێی دەکات.

## فەرموودەی سی و سێیەم

## منداڵان و ئادابی نان خواردن:

عن عمر بن ابي سلمة (ﷺ) قال: كنت غلاماً في حجر رسول الله (ﷺ) وكانت يدي تطيش في الصحفة، فقال لى رسول الله (ﷺ) ((يَا غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ)) فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ)).

واتە: عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: منداڵ بووم لە باوەشی پێغەمبەری خوادا بووم (ﷺ) کاتی نانخواردن بوو من دەستم بۆ ئەم بەرو ئەوبەری قاپەکە دەگێڕا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم: بچکۆل گیان هەر کاتێك نانت خوارد سەرەتا ناوی خوا بێنەو بە دەستی ڕاستت نان بخۆ، دەستت بۆ بەردەمی خۆیشت بەرە.

## فەرموودەی سی و چوارەم

## پاراستنی منداڵان لە شەیتان:

عن ابن عباس (رضى الله عنهما) قال: كان النبي (ﷺ) يعّوذُ الحسنَ والحسين: ((أعيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللّهِ التَّامَّة، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّةٍ، ثم يقول: كان أبوكُم يعوذ بِهما إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ)).

واتە: (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای دەخوێند بەسەری حەسەن و حوسەینداو دەیفەرموو: پەناتان پێ دەگرم بە وشە تەواوو دروستەکانی خوا، لە هەموو شەیتانێك و نەهامەتییەکانی شەو، وە لە هەموو چاوێکی پیس و پاشان دەیفەرموو: باوکیشتان ئیبراهیم ئەم دوعایانەی بەسەر اسماعیل و اسحاقدا دەخوێند.

## فەرموودەی سی و پێنجەم

## چارەسەرکردنی نەخۆشی منداڵان:

عن ام قيس بنت مِحصنَ (رضى الله عنها): انها أتَت رسول الله (ﷺ) بإبنٍ لَها لَم يبلغ أن يأكل الطعام، وقد أغلقت عليه من العذرة)).

قالت: فقال رسول الله (ﷺ) ((عَلاَمَ تَدْغَرْنَ أَوْلاَدكُنَّ بِهَذَا الإِعْلاَقِ، عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ –يَعْنِي بِهِ (الْكُسْتَ)– فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ)).

واتە: (ام قيس) دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوڕێکم پێبوو کە نەیدەتوانی هیچ بخوات لەبەر قوڕگ ئێشە (لوزتین) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: تاکەی منداڵەکانتان بەشێوەی چارەسەری هەڵە دووچار دەکەن، داری هندی بەکاربێنن چونکە حەوت چارەسەری تێدایە کە یەکێکیان کەلەکە ئێشەیە.

## فەرموودەی سی و شەشەم

## جل وبەرگ و ڕازاندنەوەی منداڵان:

عن ام خالد بنت خالد (رضى الله عنها) اتي النبي (ﷺ) بثياب فيها خميصة سوداء صغيرة، فقال: ((مَنْ تَرَوْنَ أن نَكْسُو هَذِهِ؟ فسَكتَ الْقَوْمُ فقَالَ ((ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ)) فَأُتِيَ بهَا تُحْملُ، فأخذَ الْخَمِيصَةَ بِيَدِهِ فَألْبسَهَا وقَال ((أَبْلِي وَأَخْلِقِي)). وكَانَ فِيهَا عَلَمٌ أَخْضَرُ أوْ أصفَرُ فقَالَ ((يَا أُمَّ خَالِدٍ هَذَا سَنَاهْ وَسَنَاهْ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنٌ))

واتە: دایكی خالد دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێك كۆمەڵێك جل و بەرگیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە تیایاندا كراسێكی ڕەشی منداڵانەی تێدابوو، فەرمووی: ئێوە دەڵێن ئەمە بە كێ دەبەخشم؟ خەڵكەكە بێدەنگ بوون، ئەویش فەرمووی: دەی دایكی خالیدم بۆ بانگ بكەن و دایكی خالیدیان بۆ هێنا كە منداڵێكی پێ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دایە (خمیصە) كەو كردیەبەری منداڵەكەی و فەرمووی: یاخوا كۆنی نەكەیت و بیدڕێنی، كە لەو قوماشەدا خەتی سەوز یان زەردی تێدابوو فەرمووی: ئەی دایكی خالید ئەمە باشترینیانە. كە بە زمانی حەبەشی فەرمووی (سناه) واتە باشترینیانە.

## فەرموودەی سی و حەوتەم

## گاڵتەوگەپ كردن لەگەڵ منداڵاندا:

عن أنس بن مالك (ﷺ) قال: كان رسول الله (ﷺ) يَدخُلُ علَينَا وَلي أخ صَغِير يُكنَى (أبا عُمَير) قال: أحسبه فطيماً، وكَان لَهُ نُغَرٌ يَلْعبُ بِهِ فَمَاتَ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِى (ﷺ) ذاتَ يَوْمٍ فرَآهُ حَزِينًا، فقَالَ ((مَا شَأْنُهُ))؟ قَالُوا ماتَ نُغَرُهُ فَقَالَ ((يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ)).

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەهات بۆ ماڵمان و منیش برایەكی بچوكم هەبوو پێیان دەوت (أبا عمیر) دەڵێت: وا دەزانم لە شیر بڕابوویەوە، بەچكە چۆلەكەیەكی هەبوو، ڕۆژێكیان

باڵندەكـەی مرداربوویـەوەو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـات بـۆ ماڵمـان دەبینێـت زۆر غەمبارە، پرسی: ئەمە چیەتی؟ وتیـان: بەچـكە چۆڵەكەكەی مـردووە! ئـەویش وتـی: ئەی ئەبا عومەیر بەچكە چۆلەكەكەت چی بەسەرهات!؟.

## فەرموودەی سی و هەشتەم

## منداڵان و سەرتـاشینی نـاقۆڵا:

عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قـال: ان الـنبي (ﷺ) رأى صـبياً حلـق بعـض شعره وتَركَ بَعضه، فَنَهَاهُم عَن ذَلِكَ وَقَال: ((أحلقُوا كُلهُ أو أتركُوه كُلّه)).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی كەوت بـە منـداڵێك هەنـدێك لەسـەری تاشـرابوو هەندێكیشی نەتاشرابوو، ئەویش بەرگری ئەم كارەی لێ كردن و فـەرمووی: یـان ئـەوەتا هەمووی كورت بكەنەوە یان هەمووی بهێڵنەوە)).

## فەرموودەی سی و نۆیەم

## فەرمان پێدان و بەرگری كردنی منداڵان:

عـن ابـي هريـرة (رضي الله عنه) قـال: كنـا عِنـد رسـول الله (ﷺ) وَهُـو يقـسمُ تَمـراً مِـن تمـر الصدقة، وَالحسن بن علي في حجرِه، فَلمـا فـرغَ حملـه الـنبي (ﷺ) علـى عاتقـة، فـسال لعابة على النبي (ﷺ) فرفع النبي (ﷺ) رأسه، فإذا تَمرة في فِيه، فَحَرك خـده، وَقَـال: ((القِهَا يَا بنيَّ كِخْ كِخْ ارْمِ بِهَا)) فادخل النبي (ﷺ) يده في فِيه فَانتزعهَا مِنـهُ ثُـم قـال: ((أمَا عَلِمْتَ انَّ الصَّدَقَةَ لاتحلُّ لاال مُحمد)).

واتـە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین هەندێ لە خورمای زەكاتی دابەش دەكرد، حەسەنی كوڕی عەلیشی لـە باوەشـدا بـوو كاتێـك لێبوویـەوە هـەڵیگرت و خـستیە سـەر شـانی، لیكەكـەی بەسـەر شـانی پێغەمبـەری خـوادا شـۆڕبوویەوە، بۆیـە سـەری هـەڵبڕی دەبینێـت خورمایـەكی لـەناو دەمدایـە، بۆیـە پەنجـەی نـا بـە گوپیـاو فـەرمووی پێـی: لـە دەمـت فڕێـی بـدەرەوە

كخەیە،كخەیە بیتفێنەوە، هەر بەوەوە نەوەستا بەڵكو پەنجەی خستە ناو دەمیو بەزۆر دەری هێنایەوەو فەرمووی: ئەی نازانی بنەماڵەی محمد زەكاتیان پێ ناشێت؟!.

## فەرموودەی چلەم

## نیشانەكانی پێگەیشتنی منداڵ:

عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال: عرضني رسول الله (ﷺ)يَومَ أُحُد في القتال، وأنَا ابنُ أربَعَ عَشْرَةَ سَنَة فَلَم يُجزِني، وعرَضَني يَومَ الْخَنْدَقِ، وأنَا إبنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأجَازَنِي.

قَالَ نَافِع: فقَدِمتُ عَلَى عُمَر بْنِ عَبدالْعَزِيزِ وهوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَة، فَحَدَّثْتُهُ هَذَا الْحَدِيث، فقَالَ إنَّ هَذَا لَحَدّ بَينَ الْكَبِيرِ والصَّغِيرِ، فَكَتَبَ إلى عُمَّالِهِ أن يَفرِضُوا لِمَن كَانَ ابْنَ خَمس عَشْرَةَ سَنَة، وَمَن كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجعَلُوهُ فِي الْعِيَال.

واتە: عبداللەی كوڕی عمر (خوا لە خۆیو باوكیشی ڕازی بێت) فەرمووی: لە ڕۆژی جەنگی (ئوحد)دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕیزی كردینو سەیری كردین من منداڵ بووم، چواردە ساڵان بووم، ڕێگای نەدام بەشداری جەنگەكە بكەم، بەڵام لە جەنگی (خەندەق)دا ڕیزی كردینەوەو سەیری كردین من تەمەنم گەیشتبووە (١٥) ساڵ، ڕێگای دام بە بەشداریكردنی غەزاكە.

نافیع دەفەرموێت: كاتێك عمری كوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خەلیفە بوو، چوومە خزمەتیو ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: دەی ئەم فەرموودەیە ئاستی گەورەو بچوك جیادەكاتەوە، بۆیە نامەی نووسی بۆ كاربەدەستەكانیو بۆی نووسین: هەر كەسێك تەمەنی دەگاتە (١٥) ساڵ، ساڵانەی بۆ دیاری بكەنو پێی بدەنو هەر كەسێكیش لەوە خوارترە، با لەگەڵ ماڵەوەیاندا بنوسرێت (واتە حیسابی منداڵی بۆ بكرێت)).

# فەرموودەی یەكەم

## كۆرپە بە سروشتی باوەڕەوە لەدایك دەبێت:

عن أبی هريرة (ﷺ) قال: قال النبي ((ﷺ)) ((مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَو يُنَصِّرَانِهِ أَو يُمَجِّسَانِهِ، كما تنتج البهيمة بهيمة عجماء، هَل تحسون فِيها مِن جدعاء)).

ثمّ يقولُ ابو هوريرة (ﷺ): اقْرَءُوا إِن شِئْتُم: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾.

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە صەحیحەكەیداو لە كیتابی جەنائیزی ژمارە (١٣٥٩)دا ڕیوایەتی كردووە لە بابی (ئەگەر منداڵی موسڵمان ببێتو بمرێت ئایا نوێژی لەسەر دەخوێنرێت؟)

وە هەروەها فەرموودەی ژمارە: (١٣٨٥) لە بابی (چی وتراوە دەربارەی منداڵانی بێ باوەڕان)و لە كتێبی تەفسیر ژمارە (٤٧٧٥)و لە بابی (لاتبدیل لخلق الله) (ئاینی خودا)و كتێبی قەدەر ژمارە (٦٥٩٩) لە بابی (تەنها خوا دەزانی چیان كردووە).

(مسلم)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕیوایەتی كردووە لە ژمارە (٦٨٤٩) وە ابوداود لە (السنن)دا لە كیتابی (السنة)دا ژمارە: (٤٧١٤)و لە بابی (وەچەی بت پەرستان)، (تورمذی)یش لە كتێبی (قەدەر)دا ژمارە (٢١٣٨)داو لە بابی (هەموو كۆرپەیەك لەسەر باوەڕداری لەدایك دەبن).

### ئەو ئەحكامو ئادابانەی لەم فەرموودەیەوە دەستمان دەكەوێت:

یەكەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە هەموو كۆرپەلەیەك كە لەدایك دەبێت بە باوەڕەوە لەدایك دەبێت.

دووەم: زانایانی ئەهلی سوننە لەسەر مانای وشەی (بە سروشت باوەڕدار) (الفطرة)دا جیاوازیان هەیەو ڕای زۆریان هەیەو لێرەدا بواری ئەوە نیە هەموویان باس

بكەین، بەڵام ڕاسترینیان كە دەقەكانی قورئانو سوننە پاڵپشتی دەكەنو زۆربەی زانایانی لەسەرە ئەوەیە كە مەبەست لە (الفطرة) واتە: موسڵمانەتی، ئەم بەڵگانەیش پاڵپشتی دەكات:

١- لە هەندێك فەرمودەدا ڕاستەوخۆ وشەی (الفطرة) بە مانای موسڵمانەتی دێت، لەو ڕیوایەتانە:

- فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَد إلاَّ وَهُوَ عَلَى الملّة))[1].

واتە: ((هەموو منداڵێك كە لەدایك دەبێت لەسەر میللەتی باوەڕ لەدایك دەبێت)).

- یان دەفەرموێت: ((مَا مِنْ يولد يُولَد إلاَّ عَلَى فِطْرَةِ الاسلام، حَتَى يُعرِبَ، فَأبَوَاهُ يُهوِّدَانِهِ أو يُنَصِّرَانِه... ))[2] تا كۆتایی فەرموودەكە..

واتە:(( هەمو منداڵێك لەدایك دەبێت لەسەر سروشتی ئیسلامەتی لەدایك دەبێت تا گەورە دەبێت باوكو دایكی دەیكەن بە جولەكەو گاور))

٢- لە تەفسیری ئەبوهورەیرەدا كە خۆی فەرموودەكەی گێڕاوەتەوە لەپاش گێڕانەوەی فەرموودەكە ئایەتی ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ی خوێندەوە، كە مانای وایە مەبەست لە (فطرة) أموسلمان بوونە چونكە لە زۆربەی زانایانەوە وەرگێراوە كە مەبەست لە ئیسلامە.[3]

٣- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەكەدا باسی لادانی منداڵی كرد لە (فطرة) تەوە بەرەو جولەكەبوونو گاوربوون و مەجوسی بوون بەڵام باسی

---

١ رواه مسلم (٦٨٥٣).

٢ رواه الضياء المقدسي في (الاحاديث المختارة) (١٤٤٦) وابن حبان (١٣٢).

١ التمهيد لابن عبدالبر (٧٢/١٨)

موسڵمانبوون ناكات چونكە منداڵ لەسەری لەدایك دەبێتو ئەوان لەو سروشتە لای دەدەن.

٤- مسلم لە صەحیحەكەیدا ژمارە (٧٣٠٩)دا لە عەیازی كوڕی حیمارەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پەروەردگاریەوە (عزوجل) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

((وَاني خَلَقت عِبَادِي حُنفَاء كُلُهُم، وَإنّهم أتتهم الشَّيَاطِين فَاجتالتهم عَن دِينهم، وَحرَّمت عَلَيهم مَاأحللت لَهُم، وَأمرتهُم ان يشركوا بي مالم أنزل به سلطاناً..))

لە ڕیوایەتی (طبري)داو لە معجم الكبير (٩٩٧)(١٧، ٣٦٣)دا ئەم بڕگەیەی هێناوە لە فەرموودەكە:

((ان الله عزوجل خلق ادم وبنيه حنفاء مسلمين)).

واتە: خوای گەورە لە فەرموودە قودسیەكەیدا دەفەرموێت: من هەموو بەندەكانی خۆمم بە باوەڕدار دروست كردووە، بەڵام شەیتانەكان دێنو لە ئاینی پاك دووریان دەخەنەوەو هەموو ئەو شتانەی من بۆم حەلال كردوون بۆیان حەرام دەكەنو فەرمانیان پێ دەدەن كە هاوبەش بۆ من پەیدابكەن كە من ڕێگام بەو كارە نەداوە.

كەواتە بەم كۆمەڵە بەڵگانەی پێشەوە بۆمان دەركەوت كە مەبەست لە سروشتی (فطرة) ئیسلامە.

سێیەم: مەبەست لەوەی كۆرپەلە لەسەر ئیسلامەتی لەدایك دەبێت:

- إبن قيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە كتێبی (شفاء العليل) (٢/٧٨٩-٧٩٠)دا دەڵێت: ئەوەی كە پێویستە لێرەدا بزانرێت مانای ئەوەی كە لە فەرموودەكاندا هاتووە ((كۆرپەلە لەسەر سروشتی باوەڕو ئیسلامەتیو میلەتی ئیسلام لەدایكبوون)) مەبەست لێی ئەوەنیە كە هەر كە منداڵەكە لەدایكی بوو دەربارەی ئیسلام هەموو شتێك بزانێتو قبوڵی بكات.

نەخێر، چونكە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی ((وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا))[1]

(واتە خوای گەورە لە سكی دایكتان دەرتان دەهێنێتو لەو كاتەشدا ئێوە هیچ شتێك نازانن)

بەڵكو مەبەست لە (فطرة) ئەوەیە كە ئیسلامی لەلا جوانەو پێی قبوڵەو خۆشی دەوێت، سروشتی باوەڕ وایە كە مرۆڤ بەرەو پەروەردگاری دەباتو خۆشەویستی دەكات لەلایانو دڵسۆز دەبن بۆی، ئیتر ناسینو زانیاری دەبارەی وردەوردە پەیدا دەبێت ئەگەر بەربەستەكان ڕێگەی لێ نەگرن.

وە دەڵێت: بەڵكو مەبەستی لەو (فطرة)یە ئەوەیە كە لەسەر خۆشەویستی پەروەردگارەكەی لەدایك دەبێتو ڕازی دەبێت بە خوایەتی پەروەردگارەكەی، سەری بەندایەتی بۆ نەوی دەكات، ئەگەر وازی لێ بهێننو بەربەست نەخەنە ڕێگای هەرگیز لەو سروشتە لانادت.

هەروەك چۆن بەجۆرێك لەدایك دەبێت كە حەزی بەو شتانەیە كە پێویستی پێیەتی لە خواردنو خواردنەوە، حەزی لەو شیرەی دایكیەتی كە بە سروشت بۆی گونجاوە.

وەك خوای گەورەیش لە سورەتی (طـه: ٥٠)دا دەفەرموێت ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ وە هەروەها دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾ (الاعلى: ٢-٣).

ئەو پەروەردگارە هەموو گیانلەبەرانی دروست كردووەو هەر ئەویشە ڕێنمونی كردوون بۆ ئەو شتانەی بەسودە بۆیانو دووریش بكەونەوە لەو شتانەی زیانی هەیە بۆیان.

---

[1] سورەتی النحل ئایەتی (٧٨).

ئەم خۆشەویستیو ڕقو کینەیە بەپێی پێویست دەست دەکەوێت، پاشان زۆرێك لە مرۆڤەکان ئەم سروشتە پاکەیان لێ تێکدەچێتو هەر ئەمەشە کە دەڵێن لەسەر سروشتی پاك لەدایك دەبێت)..

چوارەم: فەرموودەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە کۆرپەلە لەسەر سروشتی باوەڕ لەدایك دەبێت، مەبەستی لەوەنیە کە باس لە باوەڕداریو بێ باوەڕی منداڵ بکات لە دنیادا، چونکە حوکمی منداڵی کافران حوکمی باوكو دایکی دەدرێت بەسەردا.

منداڵی باوەڕداران حوکمی باوكو دایکیان دەدرێت بەسەرداو هەروەها منداڵی بێ باوەڕانیش لە دنیادا هەر بەو جۆرە حوکمی باوكو دایکیان بەسەردا دەدرێت، حوکمی کافریان دەدرێت بەسەرداو نوێژیان لەسەر ناکرێتو لە گۆڕستانی موسڵماناندا ئەسپەردە ناکرێنو میرات نابەن لە خزمی موسڵمانیانو دروستە وەك کافران بکرێنە بەندە بە ڕای هەموو زانایان.[1]

پێنجەم: بەجولەکەکردنی یان بەگاورکردنی لەلایەن دایكو باوکییەوە، مانای ئەوە نیە کە بەڕاستی کافر بووە، حوکمی کافری تەواوی بەسەردا نادرێت تا بە زمانو بە ئاشکرا دەری نەبڕێت، خۆی بە ئارەزووی خۆی کوفر هەڵنەبژێرێتو ئیسلام ڕەدنەکاتەوە، بەڵام بەوەی کە لەژێر ڕکێفی باوكو دایکی کافریدایە لە دنیا حوکمی کافری بەسەردا دەدرێت، چونکە ئەحکامی دنیایی زۆر جیاوازە لە ئەحکامی قیامەتی.

بۆ نموونە دووڕووەکان (منافق) ئەحکامی موسڵمانانیان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت کەچی لەو ڕۆژی قیامەتدا لە قوڵایی دۆزەخدان، یان ئەو باوەڕدارەی لەژێر دەسەڵاتی کافراندایەو لە دڵەوە باوەڕی هێناوە بەڵام موسڵمانان بەو باوەڕەیان نەزانیوە هەر حوکمی کافری بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت لە دنیاداو ناشۆرێتو نوێژی لەسەر ناکرێت بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێکە لە بەهەشتیەکان.

---

١ سەیری کتێبی (شفاء العليل)ی ابن قيم بکە (٢/٨١٢).

ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (فیترەتی پاك واتە ئەو سروشتەی کە خوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردووەو لە دنیادا مادەم خۆیان بە دەمی خۆیان بیروباوەڕیان دەرنابڕن، حوکمی باوکو دایکیان دەدرێت بەسەردا)[1].

**شەشەم:** هەر لەبەر ئەم سروشت پاکیەی کۆرپەیە کە لە غەزاکاندا دروست نیە منداڵی کافران بکوژرێن.

وەك ئەسوەدی کوڕی سەریع (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا سریەیەکی دەرکرد بە لایەکدا بۆ جەنگ لەگەڵ بێ باوەڕانو لەوێ ناچاربوون منداڵی کافران بکوژن، کاتێك گەڕانەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی فەرموون ((مَا حملكم عَلى قَتل الذرية؟)): واتە: چی وای لێ کردن منداڵەکانیان بکوژن؟.

ئەوانیش وتیان: ئەی منداڵی بێ باوەڕان نین؟! پێغەمبەریش فەرمووی: ((أو هَل خيَاركُم إلا أولاد المُشركِين؟ وَالّذي نَفس مُحمد بِيَدِهِ مَامِن نسمة تولَد إلا عَلى الفِطرَةِ حَتى يعرب عَنها لِسَانها))[2]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموون: بۆ هەر پیاوچاکانی ئێوە کوڕی بتپەرستان نین، هەموو منداڵێك بە سروشتی پاکی باوەڕەوە لە دایك دەبێت، مەگەر خۆی بە زمان پێچەوانەکەی دەربڕێت.

ئیبن قەییم (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت: لەم فەرموودەیەدا لەگەڵ ئەو کەسانەی سریەکەو پاشتر بەرگری کردنی لە کوشتنی منداڵی کافران، فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت بە ئاشکرا، کەوا ئەو منداڵانە بە بێ باوەڕی لەدایك نەبوون، بەڵکو پاشتر کافربوون دێت بەسەریاندا.

---

١ رواه البيهقي في السنن البرى (١٣٠/٩) و (شفاء العليل) (٨١١/٢).

٢ رواه أحمد (٤٢٥/٣)

ئەگەر مەبەستی ئەوەبووایە كە كۆرپەلە كاتێك لەدایك دەبێت یان بێ باوەڕە یان باوەڕدارە، ئەوە لە علمو قەدەری خوادایە، ئەو كاتە ئەوەی كە فەرمووی ((بۆ پیاوچاكانی ئێوە نەوەو منداڵی بێ باوەڕان نین؟)) خۆ ئەوە ناگەیەنێت كە نەیهێشتوە لە جەنگدا بیانكوژن وەك هەندێك بەهەڵە لێی تێگەیشتوونو دەڵێن:

لەوانەیە نەیهێشتووە بیانكوژن لەبەرئەوە بووبێت كە لە عیلمی خوادا هەیە كە ئەگەر بمێنن موسڵمان دەبن!

نەخێر، بەڵكو ماناكەی ئەوەیە: كە پیاوچاكانتان ئەوانەی پێشتر باوەڕیان هێناوە لە كۆچەریانو پشتیوانان كە هەموویان نەوەو وەچەی بێ باوەڕانن، پاشان منداڵەكانیان باوەڕیان هێناوەو كوفری باوكو باپیریان هیچ زیانێكی پێ نەگەیاندوون، ئەگەر باوەڕدار بێت خوای گەورە بە كردەوەی چاكی خۆی پاداشتی دەداتەوە نەك بە كردەوەی باوكو دایكی، چونكە خوای عزوجل لە مردوو زیندو دەردەهێنێتو لە زیندوویش مردوو دەردەهێنێت. لە بێ باوەڕ باوەڕدارو لە باوەڕدار بێ باوەڕ دەهێنێتە كایەوە.[1]

حەوتەم: زانایان ئەم فەرموودەیە دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە: منداڵی كۆرپە ئەگەر لە جەنگدا گیراو باوكو دایكی نەدەزانرا، ئەوە حوكمی موسڵمانی بەسەردا دەچەسپێتو ئەگەر لەوێ لەگەڵیاندا بمرێت دەیشۆنو نوێژی لەسەر دەكەن.

بەڵگەشیان ئەوەیە كە: ئەگەر لەسەر سروشتی پاكی باوەڕ لەدایك ببێت باوكو دایكی ئەو سروشتە دەگۆڕن، بەڵام هەر كاتێك موسڵمانەكان لە شەڕدا كەوتە دەستیان بەبێ دایكو باوكی ئەوە كەسێك نیە لە دینەكەی بگۆڕێتو حوكمی ئەوەی دەدرێت بەسەردا كە لەسەر فیترەتی پاكی موسڵمانەتیە، بە سروشتی بە یەكێك لە موسڵمانان دادەنرێت، بەڵام ئەگەر باوكو دایكی هەبوو لەگەڵیاندا بێت بە ئاساییو بە بێ

---

١ (أحكام أهل الذمة) ابن قيم (٢/٩٥٥)

ئاراستەكردن‌و فێركردن دەیكەن بە بێ باوەڕ وەك خۆیان‌و ئەوكاتە ئەو منداڵە حوكمی منداڵێكی باڵقبووی دەردێ بەسەردا.

ئێ ئاشكرایشە منداڵی پێ گەیشتوو ئەگەر لە شەڕدا گیرا حوكمی كافریەكەی لەسەر لاناچێت چونكە بووە بە كافرێكی تەواو، ئەگەر ئەو منداڵەی كە لەگەڵ دایك‌و باوكیدا دەگیرێت ئەوە حوكمی كافری تەواوی بەسەردا دەبرێت‌و لە دنیا هەموو حوكمەكانی كافری بەسەردا جێ بەجێ دەكرێت لەبەر دایك‌و باوكی نەك لەبەر كافریەتی خۆی.[1]

**هەشتەم:** مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمودەكەی كە فەرموویەتی: ((كما تنتج البهيمة بهيمة عجماء، هَل تحسون فِيها مِن جدعاء)) واتە: ئاژەڵ بەچكەیان دەبێت بە تەواوی‌و بە ڕێك‌و پێكی لەدایك دەبن‌و پاشان خەڵكی خۆیان گوێچكەی دەبڕن‌و شاخی دەبڕنەوەو ئەمەش بە فەرمانی پەروەردگارە، هەر بەو چەشنەیش منداڵ لەسەر سروشت پاكی لەدایك دەبن‌و پاشان دایك‌و باوكی بیروباوەڕی تێك دەدەن‌و ئەمەش هەر بە قەزاو قەدەری پەروەردگارە))[2]

**نۆیەم:**

**دوو كەڵك:**

١- بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە صەحیحەكەیدا ژمارە (١٣٥٨)دا دەفەرموێت: ئەبولیەمان باسی بۆ كردین‌و ئەویش لە شوعەیبەوە گێڕاویەتیەوە لە (ابن شهاب الزهري) فەرموویەتی: هەموو منداڵێك بمرێت نوێژی لەسەر دەكرێت تەنانەت منداڵی زۆڵیش ئەمەش لەبەرئەوەیە كە لەسەر سروشتی پاكی ئیسلامەتی لەدایكبووەو باوكی‌و دایكی یان هەر باوكی خۆیان بە موسڵمان دەزانن ئیتر با دایكی لەسەر ئاینی ئیسلام نەبێت، هەر كاتێك لەكاتی لەدایكبووندا گریانی

---

١ أحكام أهل الذمة، ابن قيم (١٠٤٧/٢)

٢ درء التعارض (ابن تيمية) (٣٦٢/٨)

بیستراو ئەگەر گریانی نەبوو نوێژی لەسەر ناکرێت چونکە حوکمی منداڵی لەبارچوی دەدرێ بەسەردا،

ئەبوهورەیرەیش (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَامن مَولُود يُولَد إلا عَلَى الفطرة...)) تا کۆتایی فەرموودەکە.

لە (ابن جريج)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پرسیارم کرد لە (عطا) دەربارەی منداڵی زۆڵ لەدایك بێتو دەنگی لێوە بێت، ئایا نوێژی لەسەر دەکرێت؟

لە وەلامدا وتی: بەڵێ، وتم: چۆن شتی وا دەبێت؟ ئەویش وتی: چونکە لەسەر سروشتی ئیسلامەتی لەدایکبووە[1].

٢- ئیمام ئەوزاعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیمام زوهەری (بە ڕەحمەت بێت) دەربارەی کەسێك کە لەسەری پێویستە بەندەیەکی موسڵمان ئازاد بکات ئایا دروستە بۆی منداڵێك ئازاد بکات کە تازە لەدایك بوویێت؟ فەرمووی: بەڵێ، چونە لەسەر فیترەتو سروشتی پاکی باوەڕ لەدایکبووە.[2]

**مەسەلەیەك:**

ئەهلی سوننە لەناو خۆیاندا لەسەر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا جیاوازیان هەیە: (قەدەریەکان) ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە کوفرو کافربوون خوای گەورە لەسەر کەس فەرزی نەکردووەو نەیسەپاندووە، بەڵکو خەڵکی خۆی ئەو کارە هەڵدەبژێرێت، چونکە هەموو کۆرپەیەك لەسەر سروشتی باوەڕ لەدایك دەبێتو بێ باوەڕبوونی دوایی دەست پێ دەکات خەڵکی بێ باوەڕی دەکەن.

---

١ رواه عبدالرزاق (٦٦١٤).

٢ التمهيد ابن عبدالبر (١٨/٧٦).

پاشتر بە ئیمام مالیکیان وت: قەدەریەکان سەرەتای ئەم فەرموودەیە بە بەڵگەی خۆیان دەزانن! ئەویش (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئێوەش بە کۆتایی فەرموودەکە بەرپەرچیان بدەنەوە، بەوەی کە پێغەمبەری (ﷺ) کاتێك پرسیاری لێکرا: ئایا منداڵ پاشەڕۆژی چۆنە ئەگەر بە کۆرپەلەیی بمرێت؟ فەرمووی: ((الله أعلم بما كانوا عاملين)). واتە فەرمووی: خوا زۆر چاکتر دەیزانێت ئەگەر بمانایە چۆن رەفتاریان دەکرد))[1]

شیخ الاسلام (ابن تيميه) (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: زانایان ئەوەیان روونکردۆتەوە لە ئەم فەرموودەیە هیچ بەڵگەیەکی بۆ قەدەریەکان تێدانیە، چونکە ئەوان نالێن دایكو باوکی بەجۆرێ دروستکراون کە دەبێت منداڵەکەیان بکەن بە جولەکەو گاور، نەخێر پاش گەورەبوون بە ئارەزووی خۆی جولەکەو گاوری دایكو باوکی هەڵدەبژێرێت، بەڵکو ئەوان لە رێگەی دەرسدادانو پێ لەبەرکردنەوە ئەو کارەی پێ دەکەن.

وە ئەگەر لەم رووانگەوە سەیری دایكو باوکەکەی بکەین، ئەوە شیاوترو شایانترە کە بدرێتە پاڵ ئەو خوایەی کە دروستکەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە، چونکە بەڵێ خوای گەورە لە سروشتدا لەسەر فیترەتی پاك دروستی کردووە، بەڵام ئەوەشی داناوەو بڕیارداوە کە چۆنو لەلایەن کێوە لەم فیترەتە پاکەی لای دەدەن.

وە بەڵگەی ئەوەش لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی صحیحدا دەفەرموێت: ((ان الغُلامَ الذي قتله الخضرُ طبع يوم طُبِعَ كافِراً، ولَو بلغ لأُرهقَ أبويه طغياناً وكُفراً)).

---

[1] رواه اللالكائي في (أصول إعتقاد أهل السنة) (١٠٠٠).

واتە: ئەو منداڵەی كە (خضر)ی پیاوچاك هەستا بە كوشتنی لەو ڕۆژەی كە بڕیاری كافریو موسڵمانەتی خەڵكەكان دراوە لە (لوح المحفوظ)دا، ئەگەر گەورە ببوایە كاریگەریشی دەبوو لەسەر كافركردنی دایكو باوكی.

وشەی (طُبِعَ) واتە لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوەو بڕیاری لەسەر دراوە، ئەوە ناگەیەنێت كە پێش لەدایكبوون بڕیاری بێ باوەڕبوونی درابێت، ئەو لەسەر فیترەتی پاكو بێگەرد لەدایك بوو، بەڵام دوای ئەوە گۆڕانكاری دێت بەسەریداو بێباوەڕ دەبێتو دەچێتە سەر ئەو بیرو باوەڕەی كە لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە.[١]

---

١ بۆ زیاتر شارەزایی سەیری ئەم كتێبانە بكە ١- الابانة الكبری(ابن بطة)(٢/٦٩) ٢- درء التعارض (ابن تیمیة)(٨/٣٥٩) ٣- شفاء العلیل لابن قیم (٢/٧٧٥)

# فەرموودەی دووەم

## (دوو شت فێری منداڵ بکرێت یەکتاپەرستی و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

عن ابن عباس (رضي الله عنهما) قال: كنت خلف النبي (ﷺ) يوماً، فقال: ((يَا غُلاَمُ إِنِّى أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، وَإِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعت عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَانِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە

ئیبن وەهەب لە (القدر) لاپەڕە (٢٨)، ئیمام ئەحمەد (٢٩٣/١، ٣٠٣، ٣٠٧)و ترمذی لە (السنن) (٢٥١٦)دا، ئەبو یەعلا لە (المسند) (٢٥٥٦)دا، (طبری) لە (المعجم الكبير) (١١٥٦٠) (١٢٩٨٨) وە الاوسط (٥٤١٧)دا، (ابن سنی) لە (عمل اليوم والليلة) (٤٢٥)دا، وە (الحاكم) لە (المستدرك) (٣/٥٤٢-٥٤١)دا هێناویانە.

ترمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە حەسەن و صەحیحە. (ابن منده) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم فەرموودەیە لە زۆر ڕێگای ترەوە لە (ابن عباس)وە ڕیوایەت کراوەو ئەم ڕێگایەشی (صحیح)ترینیانە.

(ابن رجب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت (ئیسنادەکەی واتە زنجیرەی گێڕەرەوەکانی باشەو هیچی لەسەر نیە[1].

---

[1] سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: ((نور الاقتباس من مشكاة وصية النبي (ص) لابن عباس (رضي الله عنهما)) ابن رجب لاپەڕە (٣٠-٣١).

## ئەو ئەحکامو ئادابانەی لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێت:

**یەکەم:**

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە شتێکی ڕەواو دروستە منداڵ فێری زانستو زانیاری بکرێت، لە فەرموودەی سێیەمدا زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە دەدوێین.

**دووەم:**

لەم فەرموودەیەدا ئامۆژگاریەکی تێدایە بۆ پەروەردەکەرو فێرکارانی منداڵان کە کاتو شوێنی گونجاو بە هەل بزانن‌و شێوازی باش بەکار بهێنن لە پرۆسەی فێرکردندا.

ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باشترین‌و چاکترین مامۆستا بووە هەروەك ئەو هاوەڵە بەڕێزە کە ناوی (معاوی)ی کوڕی (حکم)ی سوللەمی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: (ما رأيت معلماً قبله ولا بعده أحسن تعليماً منه).

واتە: تا ئێستا نە لە پێشترو نە لە دواتریشیەوە نەمدیوە مامۆستایەك باشتر لە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

سەیرکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هەلی دەزانێت کە ئامۆزا بچکۆلانە ژیرەکەی لە مەسەلە گەورەو گرانەکان تێ بگەیەنێت لەکاتێکدا لە دوای خۆیەوە سواری وەلاخەکەی کردبوو بە ڕێگادا دەڕۆیشتن، چونکە ئەوە ساتەوەختێکە کە منداڵ لە خۆشترین حاڵەکانیدایەو دڵی کراوەتەوەو هەرچیان بۆ باس بکرێت وەری دەگرن.

**سێیەم:**

لە فەرموودەکەدا ئامۆژگاری منداڵان بەدی دەکرێت کە پێیان دەڵێت هەرچی زانستو زانیاریە کە فێردەکرێن لە منداڵیدا ئاگایان لێ بێت لەبیریان نەچێتەوە، جوان لەبەری بکەن.

وەك چۆن ئیمام (طبراني) لە (المعجم الكبير) (١٢٩٨٨) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((يَا غُلام، إني اعلمك كَلِمات فَاحفَظهنّ)).

وە (ابن یعلی)یش لە (معجم)ەكەیدا لاپەڕە (٦٩): ((یَاغُلام أو یَا غُلَيم احفَظ عَنّي كَلِمَات لَعَلَ الله أن يَنفَعك بِهن)). واتە: ئەی منداڵ یان ئەی منداڵە بچكۆلەكە چەند وشەیەكم لێ وەربگرە بەڵكو خوای گەورە بەهۆیانەوە سودت پێ بگەیەنێت.

هەردوو زاناو پیاوچاك (حسن البصری‌و قتادەو نافع) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) وتویانە: ((الحفظ في الصغر كالنقش على الحجر)) واتە: شت لەبەركردن لە منداڵیدا وەك هەڵكۆڵینە لەسەر بەرد)[١].

**چوارەم:**

لە فەرموودەكەدا ئەوە بەدی دەكرێت كە دەبێت مامۆستایان بە نەرمونیانی‌و بە بەزەیی هەڵسوكەوت بكەن لەگەڵ منداڵاندا لەكاتی فێركردنیاندا، سەیركە پێغەمبەری خوا (ﷺ)چۆن ئامۆژگایەكەی پێشكەش بە(إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەكات‌و پێ ی دەفەرموێت ((يَاغلام، ألا أعلمك شيئاً ينفعك الله به))[٢] واتە: ئەی كوڕە جوانەكە، چۆنە كۆمەڵێ شتت فێربكەم كە خوای گەورە بەهۆیانەوە سوودبارانت بكات؟!)).

ئەم شێوازەیش شتێكی شاراوە نیە كە چەندە بەسودە لە خۆشەویستكردن‌و دروستكردنی حەز لە منداڵاندا بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری‌و قورئان خوێندن‌و تێكەڵیكردنی بە كۆڕی زانایان.

خوای گەورەیش لە قورئاندا مەدح‌و سەنای پێغەمبەرەكەی خۆی (محمد) (ﷺ) دەكات كە ئەگەر دڵڕەق‌و بێ سەلیقە بووایە لەگەڵ چواردەورەكەیدا، هەموو خەڵكی وازیان لێ دەهێناو بڵاوەیان لێ دەكرد وەك دەفەرموێت ﴿وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَ﴾[٣].

---

١ رواه ابن الجعد في مسنده (١٠٧٩) و(ابن سعد) لە (الطبقات)دا لا(٢٩٩/٧).

٢ رواه (طبرانی) في (المعجم الكبير) (١١٥٦٦٠).

٣ (ال عمران) ئایەتی ١٥٩.

ئەوەی کە ئەم مانایە دەگەیەنێت فەرموودەکەی (ابن مسعود)ە (خوا لێی ڕازی بێت) کە بە پێغەمبەری خوای وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو شتانەم فێربکە کە دەیانخوێنیتو پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: ((یرحمك الله، انك غُلیم معلّم)) واتە: ڕەحمەتی خوات لێ بێت، بەڕاستی تۆ ئێستا منداڵە چکۆلەیەکی پاشان فێر دەبیت)).

(ابن مسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) لەدوای ئەم فەرموودەیەوە دەفەرموێت: چل سورەتی قورئانم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرەوە وەرگرتووە کە کەس لەو بوارەدا شان لە شانم نادات.[١]

ئەم شێوازە جوانو نەرمەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پەروەردەکردنو فێرکردنی منداڵدا کاریگەری هەبووە لەسەر زاناو مامۆستایانی سەلەفی صالح (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ قوتابیانیاندا:

* (علقمە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: قورئانم دەخوێند لە خزمەتی عبداللەی کوڕی مسعوددا (خوای لێ ڕازی بێت) دەنگمی زۆر بەدڵ بوو بۆیە پێی فەرمووم: بەردەوامبەو بخوێنە، دایكو باوکم فیدات بێت!

ئیبراهیم دەڵێت: علقمە دەنگی زۆر خۆش بووە.[٢]

* ڕەبیعی کوڕی سولەیمان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئیمام شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وتم: (ئەگەر پێم بکرایە عیلمو زانیاریم وەك خواردن دەکرد بە گەروتدا).[٣]

---

١ رواه الطيالسي (٣٥١). وأحمد (٣٧٩،٤٦٢/١). إسناده حسن.

٢ رواه (ابن خيثمة) في (التأريخ) (٣٩٤٦).

٣ رواه البيهقي في (المدخل) (٣٧٦/١).

* عبدالرحمن کوڕی مهدی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: گوێم لە چەندان پیاو و زانایان بووە کە ئەگەر کەسێکیان بدیایە ئاستی زانستی لە خواری خۆیەوە بووبێت، خۆبەکەم زانینی نواندووە لە ئاستیداو هەوڵی داوە فێری بکات.[1]

نووسەری ئەم کتێبەش دەڵێت: شتێکی شاراوە نیە کە توندوتیژیو نواندنی شێوازی ڕەق لە فێرکردنو پەروەردەکردنی منداڵاندا شتێکی زۆر خراپەو لە وەرگرتنی زانست بێزراو وەڕەسیان دەکات، پاشترە ڕقیان لە زانستو هەڵگرانی دەبێتەوە، زۆرێك لە مامۆستاو پەروەردەکاران بون بەهۆی ئەوەی زانست لە بەرچاوی قوتابیان بخەن، پاشتریش لایاندا بەرەو ڕێگەی چەوتو خراپەکاریو سەرلێشێوان.

دەی با مامۆستایانو پەروەردەکاران ئاگایان لەم شێوازە بێزارکەرانەبێتو بەدوور بن لەبیریان بێت کە:

* پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) فەرموویەتی: ((إنَّ الله يُحِبُ الرِّفقَ فِي الامرِ كُلّه))[2] واتە: خوای (عز وجل) حەزی بە نەرمو نیانیە لە هەموو کارو کردەوەیەکدا.

* هەروەها دەفەرموێت: ((مَا كَان الّرفق فِي شَيىءٍ إلا زانه، وَمَا كَانَ الفحش في شيىءٍ قَط الا شانه))[3] واتە: نەرمو نیانی لە هەر شتێکدا بەکارهات ئەو شتە یان ئەو کارە بەرزو بە ئەرزش دەکات، وە توندوتیژیو خراپەکاری لە هەر کارێکدا بوو ئەوە سوكو بێ نرخی دەکات.

* هەروەها دەفەرموێت: ((اللهم مَن وليَّ من امر أُمتي شيئاً فشق عليهم، فاشقق عليه، ومن ولي من أمر اُمتي شيئاً فرفق بهم، فارفُق به))[4] واتە: ئەی پەروەردگارم هەر

---

١ رواه (ابو نعيم) في (الحلية) (٩/١١٨).

٢ رواه البخاري (٦٠٢٤)

٣ رواه أحمد (٣/٢٤١) و ابن حبان في صحيحه (٥٥١).

٤ رواه مسلم (٤٧٤٩).

كەسێك كاروباری موسڵمانان كەوتە ژێر دەستیو توندوتیژو ڕەق بوو بەرامبەریان، خوایە تۆش توندوتیژو ڕەق بە بەرامبەری. وە ئەگەر ئەو كاربەدەستە نەرمو نیانو بە بەزەیی بوو بەرامبەر ئوممەتەكەم دەی خوایە تۆش نەرمو نیانو بە بەزەیی بە بەرامبەری.

**پێنجەم:**

لە فەرموودەكەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە بەناوی خۆشو جوانەوە قوتابیو منداڵان بانگ بكرێت وەك لە وشە جیاجیاكانی ڕیوایەتەكاندا هاتووە وەك (یا غلام) ئەی منداڵە جوانەكە یان (یا غلیم) واتە: منداڵە چكۆلەكە یان (یا بنی) واتە: كوڕی شیرینم...

**شەشەم:**

لە فەرموودەكەدا ئەوەی لێ وەردەگیرێت كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا چ ئاستێكی بەرز گرنگی بە فێركردنی منداڵان داوە بەتایبەت بواری یەكتاپەرستیو شوێنكەوتنی سوننەت.

**حەوتەم:**

ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گرنگی بە بیرو باوەڕو یەكتاپەرستی منداڵانی موسڵمان داوە پێش ئەوەی فێری قورئانیان بكات.

* (جندب)ی كوڕی (عبدالله) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((كنا غلماناً حزاورة مع رسول الله (ﷺ) فيعلمنا الايمان قبل القرآن، ثم يعلّمنا القرآن، فازددنا به إيماناً، وانكم اليوم تعلمون القران قبل الايمان))[1].

واتە: ئێمە كۆمەڵێك منداڵی تازە پێگەیشتوو بووین لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووینو ئەو بیروباوەڕو یەكتاپەرستی فێر دەكردین پێش ئەوەی قورئانمان فێربكات،

١ رواه ابن ماجه (٨١). واسناده صحيح، سەيری (مصباح الزجاجة (١/٥٥).

بۆیە باوەڕمان بە قورئان زۆر زیادی کرد، پاشان قورئانی فێردەکردین، بەڵام ئێوە ئەمڕۆ سەیرن قورئان فێری خەڵکی دەکەن پێش ئەوەی بیروباوەڕیان تێبگەیەنن‌و فێریان بکەن.

**هەشتەم:**

زانایان‌و پیاوچاکان (سەلەفی صالح) لەسەر ئەم پرۆگرامە ڕاست‌و دروستە کاریان دەکردو منداڵەکانیان لەسەر پەروەردە دەکرد، سەرەتا یەکتاپەرستی‌و بیروباوەڕیان تێ دەگەیاندن‌و سوننەتی پێغەمبەریان بۆ باس دەکردن هەر لە منداڵیەوە.

تا دەبینی ئەو منداڵە دەبێتە لاوێکی باوەڕ بتەوی یەکتاپەرست‌و شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پاشتر هیچ ئاشوب‌و خراپەیەك لە ڕێگەی ڕاست لای نادات.

* عەلی کوڕی حوسەین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) منداڵەکەی خۆی فێر دەکردو پێی دەفەرمو: بڵێ، باوەڕم بە خوا هەیەو بێ باوەڕم بە هەموو ملهوڕو خودا درۆینەکان.[1]

* ئیبراهیمی تیمی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: موسڵمانانی پێش ئێوە حەزیان دەکرد یەکەمین شت فێری منداڵ بکرێت وشەی (لا إله إلا الله)بوو و حەوت جار (لا إله إلا الله)یان بەسەردا دەخوێندو پاشان ئەو وشەیەیان پێ لەبەردەکرد، کەواتە یەکەمین وشە کە قسە فێردەبوو وشەی (لا إله إلا الله)بوو))[2].

* حەمادی کوڕی زەید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: من لەناو کۆمەڵێك قوتابیدا بووم دەرسم دەخوێند، لەو کاتەدا منداڵ بووم پەلکەکانم درێژبوون، عەمری کوڕی عوبەید (یەکێك لە سەرانی موعتەزیلە بوو) هات‌و لەسەر سەرم وەستاو پێی وتم:

---

١ رواه ابن ابي شيبة (١/٣٤٨).

٢ رواه ابن شيبة (١/٣٤٨) عبدالرزاق (٧٩٧٧).

ئەی کوڕە چکۆلەکەم دەربارەی ئەم بانگەوازە چی دەڵێی تۆ؟ وتم: بانگەواز بۆ هەموو مرۆڤایەتیە بەڵام بەهرەمەندبوون بە باوەڕ تایبەتیە، حەماد دەڵێت: بەتوندی پەلکەکانمی ڕاکێشتو وتی: چاك هەر بە منداڵی کوفرو بیّ باوەڕیان لە مێشکتدا چەسپانووە.

عەمری کوڕی عوبەید (موعتەزیلەبوو) باوەڕی بەوە نەبوو کە خودا ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆ باوەڕهێنان، بۆیە تورەبوو کاتێك بیستی کە منداڵێك پێچەوانەی بیروباوەڕەکانیەتیو قەدەری خوایی دەچەسپێنێت.

**تویەم:**

لەبەر یەك شت وا زاناو پیاوچاکانی پێشووی ئوممەت هەوڵیاندەدا منداڵەکانیان سەرەتا لەسەر بیروباوەڕی یەکتاپەرستیو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردە دەکرد– ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ئەوان ئەوەیان زانیوە کە منداڵ لەسەر چی گەورەبوو دواڕۆژ هەر بەو چەشنەی لیّ دەردەچێت.

ئەگەر سەرەتا لەسەر بیروباوەڕی پاكو ڕاستو دروستو خۆشەویستی سوننەتو ڕێڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردە بکرێت ئەوە بە یارمەتی خوا تا مردن لەسەر ئەو ڕێڕەوە دەڕوات.

بەڵام ئەگەر ئەو منداڵە لەسەر گومڕاییو بیدعەو پێچەوانەی سونەت پەروەردە بکرێت ئەوە پەنا بەخوا تا مردن لەناو ئەو گومڕاییەدا دەژی مەگەر خوای گەورە ڕەحمی پیّ بکات خێرو چاکەو ڕزگاری بۆ بنێرێت إن شاءالله.

* (ابو اسحاق الجبیانی) دەڵیّ: ((منداڵەکانتان مەنێرنە لای هیچ مامۆستایەك مەگەر مامۆستایەکی خاوەن دینو خواناس چونکە قوتابی لەسەر ئاینی مامۆستاکەیەتی)).

دەڵیّ: مامۆستایەك دەناسم کە لە ژێرەوە پەنا بەخوا (باوەڕی وابوو قورئان دوایی هاتۆتە کایەوەو مەخلوقە) کاتێك خەڵکی پێی زانی دووریان خستەوەو سزایان داو وازیان پیّ هێنا لە وانە وتنەوە.

ئەویش پێش هەڵاتن قوتابیەكانی كۆكردەوەو پێی وتن: دەربارەی قورئان چی دەڵێن؟ وتیان: نازانین بڵێین چی، ئەویش وتی: ئەی قورئان مەخلوق نیە، بیشتان كوژن هەر لەسەر ئەم بیروڕایە لانەدەن پاشان هەڵاتو خۆی شاردەوە.

(ابن اسحاق) دەڵێ: بیستم كە ئەو منداڵانە هەر هەموویانن لەسەر ئەو بیروباوەڕە چەوتە مردن.

پاشان دەڵێ: بیستوومە مامۆستایەكی پاكو باوەڕ بتەو لە دەوری كەعبەی پیرۆز دەسوڕایەوەو دەیووت: ئەی پەروەردگارم هەر قوتابیەك من فێرم كردووەو پەروەردەم كردوون، بیانكە بە یەكێك لە پیاوچاكان.

دەڵێ: بیستوومە (٧٠) قوتابی لەسەر دەستی ئەو فێربوونو هەر (٧٠)كەیان لە ڕێزی كاروانی صاڵحاندا بوون... ئای لەو دوو مامۆستایە چەند پێچەوانەی یەكن.[١]

* عەمری كوڕی قەسی مەلائی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هەر كاتێك گەنجێكت بینی سەرەتای تەمەنی لەگەڵ ئەهلی سوننەو جەماعەدا بەسەربرد ئەوە هیوای چاكەت پێی هەبێت لە دوارۆژدا، بەڵام ئەگەر لەگەڵ بیدعەچیو گومڕاكاندا بینیت ئەوە لێی بێ هیوابە، چونكە گەنج لەسەر بنەمای سەرەتای گەورە دەبێت،

وە دەڵێت: گەنج ئەگەر بۆی بلوێو لە خزمەت زانایاندا گەورەبێت بە دڵنیاییەوە بێ وەی دەبێت لە دوورلە خواییو خراپە، بەڵام ئەگەر لابدات بەم لاولادا لەلای كەسانی لارو باوەڕ لاوازو بیدعەچی پەروەردە بێت، كاتێك گەورەبوو زۆر دوورە لە سەرگەردانیو گومڕایی.

* (ابن شوزب) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە نیعمەتو بەخششی خوایە بەسەر گەنجی خوێندكارو ئەوانەشی كە هەر عەرەب نین (عەجەمین) ئەگەر خواناس بن ئەوە خوایش مامۆستایەكی چاكیان بۆ دەنێرێت كە بیانخاتە سەر ڕێڕەوی

---

[١] ابن عساكر فی (تأريخ دمشق) (٢٣٧/٣٦).

سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) چونكە غەیرە عەرەب چاولێكردنی زیاترە لە تێگەیشتن لە دەقەكان)[١].

**دەیەم:**

هەروەها لەسەر پەروەردەكاران‌و مامۆستایان پێویستە فێری ئەوەیان بكەیت كە عیلم‌و زانست لە كێ وەردەگرن چونكە زانست‌و زانیاری خۆی لەخۆیدا ئاینداریە.

بۆیە دەبێت ناوی زانا چاكەكانی ئەهلی سوننەو جەماعەیان تێ بگەیەنێت، لەبەرامبەریشدا ناوی زانا خراپ‌و بیدعەچیەكانیشیان پێ بڵێت‌و ئاگاداریان بكاتەوە لە خراپەو شەڕیان، چونكە دڵ لاوازە، چاو لەیەك كردن ئاساییەو ئەگەر ئەومنداڵە دووچار ببێت بە خەڵكانی بیدعەچیەوە ئەوە دواجار قەناعەت دەكات‌و شوێنیان دەكەوێت.

*حەمادی كوڕی یەزید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەنەسی كوڕی سیرین نەخۆش بوو چووین بۆ سەردانی‌و ئەویش ووتی پێمان:

(ئەی كۆمەڵی لاوان لەخوا بترسن، بڕوانن بزانن لەكێوە فەرموودە وەردەگرن چونكە ئەوە بەشێكە لە ئاینەكەتان)[٢].

* مەعمەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): دەڵێت لەلای مامۆستا (طاوس)بووم لە ماڵەكەی خۆیدا.. وە لەو كاتەدا پیاوێك هات ناوی ((ساڵح))بوو دەستی كرد بە هەندێك قسە لەسەر قەزاو قەدەر (پەنا بەخوا)، طاوسیش پەنجەی خستە هەردوو گوێچكەی‌و بە كوڕەكەی خۆیشی وت: پەنجەت بخەرە گوێچكەت‌و توند بیگرە با گوێت لە قسەكانی نەبێت چونكە دڵ لاوازە)[٣].

١ هەمان سەرچاوە (٥١٧).

٢ رواه الخطیب في (جامع الاخلاق الراوي) (١٤٣).

٣ رواه ابن بطة في (الابانة الكبرى) (١٧٧٨).

* (عاصم)ی کوڕی (أبی النجود) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئێمە خوێندکاری تازە پێگەیشتوو بووین‌و لە خزمەت (أبو عبدالرحمن السلمی)دا بووین‌و پێی وتین:

نەچنە کۆڕی چیرۆك خوانەکان‌و گوێیان بۆنەگرن مەگەر (أبو الاحوص) نەبێت، لە وانەکانی شەقیقی (ضبيّ)و سەعدی کوڕی عوبەیدەدا دامەنیشن (کە هەردووکیان لەسەر بۆچوونی خەواریجەکان بوون)[١].

* (أبو جعفر العقیلی) دەڵێت: بە (عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)م وت: بۆچی فەرموودەت لە عەلی کوڕی جەعدەوە وەرنەگرتووە؟ لە وەڵامدا وتی: باوکم نەیدەهێشت بچم بۆ لای، چونکە بۆیان باس کردبوو کە بە خراپە باسی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردبوو[٢].

* عامری کوڕی عبداللەی کوڕی زوبێر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: جارێکیان باوکم پێی وتم: ئەوە لە کوێ بوویت؟ منیش وتم: لەناو هەڵقەی کۆمەڵێکدابووم کە لەوان باشترم نەدیوە (زیکرو یادی خوایان دەکرد)وهەیان بوو جەزبە دەیگرت‌و دەلەرزی تا لە ترسی خوای تەعالا لەهۆش خۆی دەچوو، منیش لەلایان دانیشتم.

باوکم وتی: لەمەودوا هەرگیز لەلایان دامەنیشە، وەك بڵێی پێی ناخۆش بوو کە بەشداری کۆڕی زیکرەکەیانم کردبوو، بۆیە وتی: من بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام بینیوە قورئانی خوێندووە، هەروەها ئەبوبەکرو عمرم دیوە (خوایان لێ ڕازی بێت)

---

١ رواه مسلم في صحيحه (٥٨)

٢ الضعفاء (عقیلی) (٣/٢٢٥).

قورئانیان خوێندووەو بەو جۆرەی ئەو جەماعەتەیشیان لێ بەسەر نەهاتووە، دەی ئایا تۆ وا دەزانی ئەمانە لە ئەبوبەکرو عمر لەخواترسترن؟ بۆیە زانیم مەسەلەکە بەو جۆرە نیە بۆیە وازم لێهێنان)[١].

* مالیکی کوڕی ئەنەس (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زیادی کوڕی ئەبی زیاد کە خواناسێك بوو بە منی وت کە لەو کاتەدا من منداڵ بووم: دەتبینم لەگەڵ (رەبیعە)دا دادەنیشی؟ کەواتە زۆر ئاگاداری خۆت بە)[٢].

*سوفیانی کوڕی عویەینە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: شەوێکیان لە کەعبەدابووم چاوم کەوت بە (سەرکردەی موعتەزیلەکان)عەمری کوڕی عوبەید کە لە پاڵ مەقامی ئیبراهیمدا دانیشتبوو نوێژی نەدەکردو منیش چوم بۆلای، ئەویش سەیری کردم ووتی: سوفیان ئەمە تۆی؟ ئەی باوکت پێی نەووتی نەیەیت بۆلای ئێمە؟[٣].

* وەهەبی کوڕی مونەبەه (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەی لاوو تازە پێگەیشتوان تێکەڵی حەروریەکان (واتە خەواریجەکان) مەکەن، تا نەتانبەنە سەر ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان، چونکە ئەوانە خراپەو عاری ئەم ئوممەتەن.[٤]

نووسەریش دەڵێت: بەڕاستی جێگای داخو ئەسەفە! کە زۆرێ لە باوکانو دایکانو پەروەردەکاران لەم پرۆگرامە جوانو دروستە لایان داوە (کە سەلەفی صالح) (رەحمەتی خوایان لێ بێت) منداڵەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە تێکەڵیکردنی بیدعەچیانو ئارەزووکاران، ئەو کارەیش دوای خوای گەورە باشترین هۆکارە بۆ ئەوەی منداڵەکانیان لانەدەنو سەریان لێ تێك نەچێت، یان نەچنە ناو هەندێك حیزبو لایەنی

---

١ رواه أبو نعيم في (الحلية) (٣/١٦٧-١٦٨).

٢ رواه ابن عساكر (١٩/٢٣٧).

٣ رواه الفاكهي في (أجناد مكة) (٩٩٤).

٤ تهذيب الكمال (٣١/١٥١).

سەرلێ تێکدەرو گومڕاکەر، یان ئارەزووچیان ئەوانەی کە زۆربەی بیرو بۆچوونیان هەڵگرتنی چەکە دژی حکومەتەکانیان بەبێ وردبوونەوەو بیرکردنەوە لە چارەسەرێکی تر جگە لە جەنگی نابەرامبەری خۆبەزێن یان کوشتنی خەڵکی مەدەنی بێتاوان.

ئەوە (ابو قلابە)یە (رەحمەتی خوای لێ بێت) جوانی وتووە کە دەڵێ: ((ما ابتدع قوم بدعة الا استحلوا السیف))[١].

هەروەها (سەلامی کوڕی ئەبی مطیع) دەڵێت: زانای گەورە (ئەیووب) هەموو ئەوانەی شوێن بیدعەو داهێنراو دەکەون بە خەواریجی ناودەبردن، دەیووت: خەواریجەکان لە ناودا جیاوازیان هەیە بەڵام هەموویان لەسەر چەك هەڵگرتن بە ڕووی حکومەتەکاندا یەکن.[٢]

دەی لە خوا بترسن ئەی پەروەردەکارانو ئاگاتان لە منداڵی خۆتانو منداڵی موسڵمانان بێت، سوننەتی پێغەمبەرو پەیڕەوانی خۆشەویست بکەن لەلایان، ئاگاداریان بکەنەوە لە هەموو فیکرەو بۆچوونە بیدعەو داهێنراوەکان، لەبەر چاویان قێزەونیان بکەن، چونکە ئەوان ئێستا منداڵن نە زانستیان پێیەو نە تێگەیشتن، بەڵکو زانست وەردەگرنو ئەوانەی ئەمان لەگەڵیان دادەنیشن کاریان تێ دەکەن.

دەی تا بۆتان دەکرێت لە منداڵەکانتان نزیك ببنەوە، قسەیان لەگەڵدا بکەن، سەیری بۆچوونو پرۆگرامەکانیان بکەن کە لە مامۆستاکانیانەوە فێری دەبن، ئەگەر بینیتان سونەتی پێغەمبەریان هەڵگرتووەو خۆشیان لێی دێت، ئەوە سوپاسی خوای لەسەر بکەنو یارمەتیان بدەن بەردەوام لەسەر ئەو ڕێگایە بڕۆنو لێی لانەدەن. بەڵام ئەگەر شتێکی شاراوەو گوماناویتان تێدا بەدی کردن (ئاگادارین لێیان) ئەوە سەرەتاو نیشانەی بیدعەچێتیو لادانە لە ڕاستە شەقام.

---

١ رواه اللالكائی (٢٤٧).

٢ رواه الفريابي في القدر (٣٧٥).

ئەوەتا عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (إذا رأيت قوماً يتناجون في دينهم بشيءٍ دون العامة، فاعلم أنهم على تأسس ضلالة)[1].

واتە: (هەرکاتێك تاقمێکتان بینی بە دزی خەڵکیەوە لە ئاینەکەیاندا چفەچفیان دەکرد، ئەوە بزانە خەریکی دامەزراندنی کارێکی گومڕایین).

بەڵام ئەگەری کەمتەرخەمیتان کردو ڕۆڵەکانتان دایە دەستی کەسانێك کە دڵنیا نەبوون لە چاکیو پاکی خۆیو ڕێڕەوو بۆچوونەکانی، شوێنکەوتەی سوننەتو سەلەفی صالح نەبوون ئەوە چاوەڕوان بن ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە لەوانەو فەرموویەتی:

* ((يَأتى فِى آخِرِ الزَّمَان قَومٌ حُدَثَاءُ الأسنانِ، سُفَهاءُ الأحلامِ، يَقولُونَ مِن خَيرِ قَـولِ البَرِيَّة، يَمرُقونَ مِن الإسلامِ كَمَا يَمـرُقُ السَّهمُ مِـن الرَّميـة، لا يُجَاوِزُ إيمَـانُهم حَنـاجِرَهم، فأينَما لَقِيتُمُوهُم فَاقتُلوهم، فَإنَّ قَتْلَهُم أجرٌ لِمَن قَـتَلَهُم يَـومَ القِيَامَـة))[2]. واتە: لە ئاخر زەماندا کۆمەڵێك گەنجی تازە دان کردووی بیرکۆڵ کە فەرموودەی پێغەمبەری خوا باس دەکەن بەڵام لە ئیسلام دەچنە دەرەوە وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، باوەڕ لە گەروویان نەچووەتە خوارەوە (بۆ ناو دڵیان) ئەگەر گەیشتن بەو جۆرە کەسانە بیانکوژنو کوشتنیان پاداشتی گەورەی لەسەرە لە ڕۆژی قیامەتدا.

**یانزەهەم:**

ئاگاداربە، ئەی ئەو کەسەی منداڵەکانت لەسەر یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی سوننەتن، نەکەی شەیتانی (نەفرەت لێکراو) وەسوەسەت بخاتە ناو دڵ سەرت لێ تێکبداتو پێت بڵێت: وازی لێ بهێنە با تێکەڵی هەموو موسڵمانان بکات ئیتر با پێڕەی بیدعەچیانو شوێن ئارەزوو کەوتووانیش بن، چونکە هەر کە گەورەبوو بەرگری لێ

[1] رواه اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة) (٢٤٧).

[2] رواه البخارى (٣٦١١).

دەکەمو نایەڵم تێکی بدەن، بزانە نزیکبوونەوەو تێکەڵیکردنی ئارەزووچیانو بیدعەکاران شەڕو خراپەیە بۆ دینو دنیات، زانایانی سوننەت بەرگریان لێکردووەو هەر هەموویشیان لەسەر ئەوەن کە دوورکەوتنەوە لێیانو بەئاگابوون لێیان واجبە.

فەرمووشیانە: ئەگەر مرۆڤ گوناهکەرو سەرپێچی کار بێت باشترە بۆی لەوەی کە بیدعەچیو گومڕاکەر بێت.

لەم بارەیەوە دەگێڕنەوە:

* شوعبەی کوڕی حەجاج (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە خزمەت یونسی کوڕی عوبەیددا بووم (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەو کاتەدا پیاوێك هاتو وتی: ئەی باوکی عبدالله جەنابت بەرگریمان لێ دەکەیت کە تێکەڵی عەمری کوڕی عوبەید بکەین (پێشەوای موعتەزیلەکان بوو لەو کاتەدا) کەچی کوڕەکەی خۆت چوو بۆ لای، یونس فەرمووی: کوڕی من؟ وتی: بەڵێ، بۆیە یونس زۆر ناڕەحەت بوو، ئەوەندەی نەخایاند کوڕەکەی هاتو باوکی پێی وت: کوڕی خۆم تۆ چاك دەزانی عەمری کوڕی عوبەید چ ڕاو بۆچوونێکی هەیە کەچی دەبیستم سەردانت کردووە؟!

ئەویش خەریکی بیانوو هێنانەوەبوو وتی: ئاخر فلان کەسم لەگەڵدابوو!.

یونس وتی: من بەرگری دەکەم لە زیناکردنو دزیو مەی خواردنەوەو پێم خۆشە بەم کارانەوە بگەڕێیتەوە حزوری پەروەردگار نەك بە هەڵگرتنی ڕاو بۆچوونەکانی عەمری کوڕی عوبەیدو پێڕەکەی (واتە قەدەریەکان).

دەربارەی ئەم زانا مەزنەش سەعیدی کوڕی عامیر دەڵێ: هەرگیز نەماندیوە زانایەك چاکترو باشتر بێت لە ئەو پیاوە (واتە یونس ی کوڕی عوبەید)[1].

---

١ رواه ابن بطة في (الابانة الكبرى) (٤٦٤). وابن حجر في مسنده (١٣٧١)

* سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لأن يصحب إبني فاسقاً شاطراً سنياً، أحب اليَّ من أن اصحب عابداً مبتدعاً)[١].

واتە: (ئەگەر کوڕەکەم هاوڕێیەتی سوننیەکی گوناهباری لار بکات پێم خۆشترە لەوەی هاوڕێیەتی خواناسێکی بیدعەچی بکات).

* عەوامی کوڕی حەوشەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (سوێند بە خوا ببینم عیسای کوڕم هاوڕێیەتی مۆسیقاژەنەکانو ئارەق خۆرەکان بکات پێم خۆشترە لەوەی کە ببینم هاوڕێیەتی بیدعەچییان بکات (واتە ئەوانەی لە مەسەلەکانی بیرو باوەڕدا عەقڵو ئارەزووی خۆیان بەکاردەهێنن نەك قورئانو سوننەت)[٢].

دوانزەیەم:

دەبێت منداڵ لەسەر بنەمای یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی سوننەتو لەسەر بەرنامەو پرۆگرامی پێشینەو سەلەفی صالح پەروەردە بکرێت (کە فەرموودەو بەسەرهاتی هاوەلان) بنەمای بیرو بۆچوونەکانیان بووە.

لەسەرخۆو قۆناغ قۆناغ فێر بکرێتو لە مەسەلە گەورەو گرنگەکانەوە دەست پێ بکات کە پێویستە هەموو موسڵمانێك بیزانێت وەك: سێ بنەما سەرەکیەکە: بنچینەی ئیسلامو پایەکانی ئیسلامو بنەمای چاکەکردنو بەرز ڕاگرتنی خوا لە هەموو دروستکراوەکانیو چەندان مەسەلەی تریش کە منداڵان پێویستە فێربکرێن.

دەبێت زۆر نەرمو نیان بێت لە پرۆسەی فێرکردنیانداو کتێبی چاكو بەسوودیان پێ بدات کە لە نوسەرەکانی دڵنیابێتو بشگونجێت لەگەڵ قۆناغی تەمەنو بیرکردنەوەیاندا، وەك کتێبەکانی (امام محمدی کوڕی عبدالوهاب) لە (توحید العبادة)داو نوسراوەکانی زانایانی سوننەتو فەرموودە لە (الاسماء وصفات)دا کە

---

١ رواه ابن بطة في (الابانة الصغرى) (٨٩).

٢ (ابن وضاح) لە کتێبی (البدع والنهی عنها) لاپەڕە (١٣٣)دا گێڕاویەتیەوە.

هەموو بوونو گەورەیی خوا دەچەسپێنێت لە ڕێگای فەرموودەو وتەی سەلەفی صالحەوە کە دوورن لە تەئویل کردنو لێچواندنو دانەدەستی پەروەردگار(تفویض).

بە هیچ جۆرێك ڕێگە نەدات کتێبی ئەوانە بخوێنێتەوە کە لەسەر بنەمای بیرو بۆچوونو ئارەزوات بیروباوەڕ تاوتوێ دەکەن، زۆر بەدووریان بگرێت لێیان وەك سەلەفی صالح دەیانکرد.

وە لەو مەسەلانە بەدووریان بگرن کە عەقلو ژیریان پەی پێ نابات و ئاکامەکەیشی خراپ دەبێت لەسەریانو گومانیان لە ئاینەکەیاندا بۆ دروست دەکات، فەرموون لەگەڵ هەندێك نمونەی سەلەفی صالح (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت):

* عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (حَدثوا النّاس بِمَا يَعرِفون، أتُحِبون أن يكذب الله ورسوله)[١].

واتە: بە پێی ئاستی زانیاری خەڵکی قسەیان بۆ بکەن، ئایا پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەکەی بەدرۆ بخرێنەوە؟.

* عبداللەی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (مَا أنت بمحدث قوماً حَديثاً لاتبلغه عقولهم الا كان لبعضهم فتنة)[٢].

واتە: تۆ هەر کاتێك شتێك بۆ کۆمەڵێك باس بکەیت کە عەقڵیان نەیبڕێت بێگومان بۆ هەندێکیان دەبێتە فیتنەو ئاژاوە.

* وەهەبی کوڕی مونەبیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (زانا دەبێت وەك چێشت لێنەرێکی شارەزا وابێت، بۆ هەر تاقمێك خواردنێکی تایبەتی لێ دەنێت کە

---

١ رواه (البخاري) معلقاً في كتاب العلم

٢ رواه مسلم في مقدمة صحيحه (١٥).

حەزیان لێیەتی، هەروەك لەسەر هەموو زاناو مامۆستایەك پێویستە زانیاریەك باس بکات بۆ خەڵکی کە عەقلیان بیبڕێتو مێشکیان تەقەبولی بکات)[1].

* (المروزی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: دەربارەی بابەتێکی دادپەروەری پرسیارم لە احمدی کوڕی حەنبەل کرد (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: لەم بارەیەوە پرسیار مەکە چونکە لێی تێ ناگەیت[2].

* (بخاری) (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە (صحیح)ەکەیدا لە بابی (زانست پێش وتەو کردار)دا لەسەر ئایەتی ﴿كُونُوا رَبَّانِيِّينَ﴾ دەفەرموێت: ڕەبانی ئەو کەسەیە کە خەڵکی لەسەر زانیاری سادەو وردەکان پەروەردە دەکاتو پاشان دەڕوات بۆ زانستە قورسو گرانەکان.

**سیازدەیەم:**

دەبێت منداڵان فێری هەموو ئەو مانایانە بکرێن کە فەرموودەکە دەیگەیەنێتو دەیدات، چونکە لەم فەرموودەیەدا کۆمەڵێك ئامۆژگاری مەزنو بنەمای گشتگیری باس کردووە کە گرنگترینو بەرزترین مەسەلەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە:—

* (ابن رجب) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لەم فەرموودەیەدا ئامۆژگاریەکی زۆر گەورەو گرنگی لە ئامێز گرتووە. مەبەستی لە (پاراستنی خوای عزوجل) واتە: سنورەکانی ڕەچاوی مافەکانی بکات، کە ئەوەش ئەوپەڕی بەندایەتی کردنی خوایە، ئەمەش یەکەمین خاڵی دەستپێکردنی ئامۆژگاریەکانی فەرموودەکەیە، هەر کەسیش ئەوەی کرد پارێزگارکردنی بەندەی لەلایەن خواوە دەست دەکەوێت کە ئەوەش لوتکەی ئاواتو داواکاری بەندەکانە لە خوای خۆیان کە لێیان ڕازی بێت.

---

١ الجامع لاخلاق الراوي وأداب السامع, للخطيب (١٣٦٣).

٢ الاداب الشرعية (١٥٥/٢).

پاشان باسی ئەوە دەکات کە بەندە لە کاتی خۆشیو فەرحانەدا خوای خۆی بناسێتو بیپەرستێتو ئەوەش وا دەکات لە پەروەردگار (عز وجل) کە لە کاتی ناخۆشیو تەنگانەدا بگاتە فریای، ئەوەش ئەوپەڕی ئاگاداریو پاراستنی بەندەیە لەلایەن خوای پەروەردگاریەوە.

چونکە لە حاڵەتی خۆشیو فەرحانەدا دەبێت خوا بناسرێت وە ئەگەر وا نەبێت ئەوە بێ باوەڕانیش لەکاتی ناڕەحەتیو بەڵاو ناگەهانیدا باوەڕ بەخوا دێننو لێی دەپاڕێنەوەو لەوە دڵنیان کە جگە لە خوا کەس ناگاتە فریایان.

بەڵام ئەوەی موسڵمانی باوەڕ بتەو لە بێ باوەڕان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە باوەڕداران لەکاتی نەمانی ناڕەحەتیەکانیشدا هەر خوای خۆیانیان لەبیرەو دەیپەرستن، بەڵام بێ باوەڕان وەك قورئان باسیان دەکات دوای نەمانی نەهامەتیەکە خوایان لەبیر نامێنێت، وەك ئەوەی هەر بانگیشیان نەکردبێت لەوەو پێش.

پاشان دوابەدوای ئەو باسە یەکسەر داوای لێ دەکات کە تەنها هاوار لە خوا بکاتو داوای کۆمەکیو هاوکاری هەر لە ئەو بکاتو لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا.

پاش ئەوە باسی بنەمایەکی گەورەو گشتگیر دەکات کە هەموو ئەم داواکاریانە لەخۆ دەگرێت: کە یەکەم شت ئەوەیە کەوا سەیری خوای عز وجل بکرێت کە ئەم شتانەی خوارەوە تەنها بە دەستی ئەوەو کەسی تر دەخاڵەتی تێدا ناکات: زیان گەیاندن، سوود گەیاندن، بەخشین، گرتنەوە، بەندەکان توشی هیچ شتێك نابن جگە لەو شتانە نەبێت کە خوا لەسەریان نووسیویەتی لە عیلمی خۆیدا، هەموو خەڵکی سەر زەوی بە جنۆکەو ئینسانەکانەوە ناتوانن قازانجێك یان زیانێك بە کەس بگەیەن، مەگەر شتێك کە خوا نووسیبێتیو قەراری دابێت.

ئەمەش وادەکات لە بەندەکە پێویست بێت لەسەری خۆی پەیوەست نەکات لەگەڵ خەڵکیداو داواکاریو پشت بەستنو داوای سودو قازانج گەیاندن لە کەس نەکات جگە

لە خوا، گوێڕایەڵی ئەو بخاتە پێش گوێڕایەڵی هەموو دروستکراوەکانی تر، خۆی لە خەشمو قینی ئەو لا بدات، ئیتر با هەموو خەڵکی قینی لێ هەڵبگرنو ڕقیان بێت لێی[١].

**چواردەهەم:**

لە فەرموودەکەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە منداڵانی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) تا چەندێ ڕەوشتی بەرزیان تێدابووەو بە چ شێوازێکی جوان لەگەڵ گەورەکاندا ئاخافتنیان کردووە، وەك بینیمان چۆن (ابن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی کوڕە جوانەکە، ئەویش لە وەڵامدا وتی: (لبیك) واتە: لە خزمەتتدام...پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرۆسەی زانیاری فێرکردنی خستە بەردەستیو ئەویش زۆر سوربوو لەسەر زانستو زانیاری وەرگرتن وتی: (بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە ڕیوایەتی (ابن السری) لە (الزهد) لاپەڕە (٥٣٦)دا بەم جۆرە وەڵامی پێغەمبەری دایەوە: وتی: (بلى فِداكَ أبي وأمي يَا رسول الله (ﷺ)).. واتە بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بە دایكو باوكم بە قوربانت بن.

* * *

١ نور الاقباس في مشكات وصية النبي (صلى الله عليه وسلم) لابن عباس (رضي الله عنه) لا (٧٩-٨٠)

# فەرموودەی سێیەم

## صاڵح بوونی منداڵان

عن ابي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال ((إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە (المسند) (٣٧٢/٢) گێڕاویەتیەوە، مسلم لە (صحيح)ەکەیدا (٤٢٣٢)، أبو داود لە (السنن)دا (٢٨٨٠)و لە باسی (خێرکردن بۆ مردوو)دا، (الترمذی) لە (السنن)دا (١٣٧٦) لە باسی (وقف)دا وتوشیەتی: ئەم فەرموودەیە (حسنٌ صحیح)ە، (النسائی) لە (السنن)دا (٣٦٥١)و لە باسی خێرکردن بۆ مردوو، (ابن ماجة) لە (السنن)دا (٢٤١)و لە باسی پاداشتی مامۆستای خەڵکیدا هێناویەتی.

### ئەو حوکمانەی پەیوەستن بەم فەرموودەیەوە:

یەکەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە چاکیو صاڵحی منداڵ سوودی هەیە بۆ دایكو باوکی لەپاش مردنیان، کردەوەیان بەردەوامەو ناپچڕێت بەهۆی صاڵحی منداڵەکانیانەوە لەپاش خۆیان.

دووەم:

دەقەکانی قورئانو سوننەت ئەوە دەگەیەنن کە منداڵ هەر کردەوەیەکی چاکە دەکات باوكو دایکی بەشداری پاداشتەکەیەتی وەك خۆی، چونکە منداڵ ئاکامو

سەرئەنجامی هەوڵو تێکۆشانی دایكو باوکیەتی، خوای گەورەیش فەرموویەتی ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾[١]

واتە: مرۆڤ پاداشت نادرێتەوە مەگەر کاری خۆی کردبێتیو هەوڵو تێکۆشانی بۆ دابێت.

*عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمویت: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویتی: ((إن أطيب ماأكل الرجل من كسبه، وانّ ولد الرجل من كسبه))[٢].

واتە: پاکترین خواردن کە کەسێك بیخوات، هەوڵو تێکوشانو ڕەنجەشانی خۆیەتی، (منداڵیش) ڕەنجەشانی دایكو باوکیەتی.

سێیەم:

پلەی دایكو باوك بەرز دەبێتەوە لە بەهەشتدا بە دوعای خێری منداڵەکانی بۆی:-

* أبوهريرة (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی((ان الله عزوجل ليرفع الدرجة للعبد الصالح فى الجنة، فيقول: يارب أنّي هذة؟ فيقول: بإستغفار ولدك لك))[٣].

واتە: ئەبوهورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: خوای عزوجل پلەو پایەی بەندە صالحەکان لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، تا خۆی دەڵێ: پەروەردگارم بەهۆی چی یەوە وا پلەم بەرز دەبێتەوە؟ پێی دەڵێن: بەهۆی ئەوەوە کە منداڵەکەت لەدوای خۆت دووعاو نزای لێخۆشبوونی بۆ کردویت.

١ سورەتی (النجم) ئایەتی (٣٩).

٢ رواه ابوداود(٣٥٢٨)و(ترمزی)(١٣٥٨). (النسائی)(٤٤٤٩)، و(ابن ماجه)(٢١٣٧)و دەڵێ: فەرمودەیەکی (حسن صحيح)ە

٣ رواه احمد (٥٠٩/٢) واسناده صحيح، تفسير ابن كثير (٤٣٤/٧).

* سەعیدی کوری موسەیب (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (مرۆڤ بەدوعای منداڵی صاڵحی لەپاش مردنی پلەو پایەی لەلای خوا بەرزتر دەبێتەوە)[١].

**چوارەم:**

لەبەر ئەوەی منداڵ جێگای دڵخۆشی و ئومێدی دایكو باوکانەو سودەکانی چ لە دنیاو چ لە ئاخیرەتدا زۆر زۆرن، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) داوایان لە خوای عزوجل کردوە کە رۆڵەیەکی صاڵحیان پێ ببەخشێت..

* ئەوە ئیبراهیم خەلیلە (علیه السلام) چۆن داوا لە خوا دەکات کە رۆڵەیەکی صاڵحی پێ ببەخشێت وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ الصافات (١٠٠).

* هەروەها ئەمە زەکەریایە (سەلامی خوای لێ بێت) لەکاتی پیربووونداو ژنەکەشی نەزۆك بوو کەچی هەر داوای لە خوا دەکرد کە رۆڵەیەکی پێ ببەخشێت تا دوای خۆی درێژە بە کاروانی خواپەرستی بدات: وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ۝٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا﴾ مريم (٥-٦).

**پێنجەم:**

گرتنەبەری هەموو ئەو هۆکارانەی کە منداڵ بەرەو صاڵحبوون دەبەن (بە یارمەتی خوا) تا لە دنیاو لە ئاخیرەتیشدا سودیان لێ وەربگرێت واتە دوای مردنیشی، لەم بارەیەوە ئایەتو فەرموودەی زۆر هەیە لەوانە:

١- دووعای پاڕانەوە لە خوای عز وجل تا منداڵەکانی صاڵح بکات، وەك چۆن پێغەمبەران ئەو نزایەیان زۆر کردووە:

---

١ رواه مالك في الموطأ (١/٢١٧).

* خـوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ ال عمران (٣٨).

واتـە: ئـا لـەو سـاتەدا زەکـەریا هـاواری کـردە پـەروەردگاری وتـی: ئـەی خـوای پەروەردگار لەلایەن خۆتەوە نەوەی صالْحو باشم پـێ ببەخـشیت چونکە بێگومـان تـۆ بەجوانی دوعاو نزاکان دەبیستی.

* لەسەر ئەم ئایەتە عبداللەی کوڕی عباس (خوای لێ ڕازی بێت) لەسەر ئەم ئایەتـە شـتێکی جـوان دەفـەرموێت ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ الفرقان (٧٤)

واتە: بەندەکانی پەروەردگار لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئـەی پـەروەردگارمان لـە خێـزانو منداڵـەکانمان چـاوو دڵ ڕۆشـنیمان پـێ ببەخـشەو بـشمانکە بـە پێـشەوای لەخواترسەکان.

ابن عبـاس دەفـەرموێت: هـەرگیز منـداڵ جێگـای دڵخۆشـیو چـاو ڕونـی نیـە ئەگـەر جوانو لەش ساغ بێت بەڵکو ئەو کاتەی ببینن گوێڕایەڵی خوای (عز وجل)ە.[1]

٢- ئەگـەر خـوای گـەورە منـداڵی پـێ بەخـشی، بـا زۆر لـەخوا بپاڕێتـەوە کـە ڕۆڵەیـەکی صـاڵحو چـاکو بـۆ خـواو خـەڵکی بـشێن، هـەر بـەوە واز نـەهێنی کـە پەروەردەیەکی ئیسلامییانەی بکاتو ڕەوشتی جوانیان فێربکات.

ئەوەتا خوای گەورە لەسەر زمانی باوکێك کە نزا دەکات بۆ ڕۆڵەکەیو دەفـەرموێت: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ الاحقاف (١٥).

١ رواه ابن أبي الدنيا في (العيال) ٤٢٧.

واتە: ئەی پەروەردگارم مۆڵەتم پێ بدە تا شوکرانە بژێرت بم لەسەر ئەو هەموو بەخششەی ڕژاندوتە بەسەر خۆمو دایكو باوكمداو كردەوەگەلی چاكە بكەم كە تۆ پێی ڕازی بیت، ڕۆڵەو نەوەكانم صالح بكەیت من پەشیمانیت بۆ دەردەبڕمو من لە ڕیزی موسڵمانانم).

* مالیكی كوڕی میغوەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) جارێكیان (أبو معشر) شكاتو سكاڵای كوڕەكەی خۆی بردە لای (طلحة)ی كوڕی (مصرِّف) (رەحمەتی خوای لێ بێت)و (طلحة)یش پێی فەرموو: كۆمەكی بكە بەم ئایەتە تا چاكو صالح دەبێت: ﴿رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾[1]

٣-منداڵەكانی بباتە خزمەت ئەو زانایانەی كە دڵنیایە لە چاكیو پەیڕەوی كردنیان لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و گیرابوونی دوعاكانیان، تا دەست بهێنن بەسەریانداو نزای صالبوونو بەفەڕو بەرەكەتیان بۆ بكەن.

هەروەك چۆن هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) منداڵەكانیان دەبردە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا دوعایان بۆ بكاتو فەڕو بەرەكەت ڕوویان تێ بكات، لە فەرموودەی (٣٢)دا بە درێژی باسی دەكەین.

* (أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت) حەسەنی بەسری (منداڵ بوو) دەیگرت بە باوەشیەوەو دەیبردە خزمەت هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەوانیش نزای خێریان بۆ دەركرد، بردیە خزمەت عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت)و ئەویش دوعای خێری بۆ كردو فەرمووی: (اللهم فقهه في الدين، وحبِّبه الى الناس)[2]

---

١ أخرجه ابن أبي حاتم في الدر المنثور (٧/٤٤٣) وأبو نعيم في الحلية (٥/١٩).

٢ تهذيب الكمال (٦/١٠٣-١٠٤).

واتە: خوای پەروەردگارم لە ئاینی ئیسلام شارەزایی پێ ببەخشەو لە دڵی خەڵکیدا خۆشەویستی بکە.

* ئیبراهیمی کوڕی ادهم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (أدهم) (واتە باوکی خۆی) پیاوێکی صالح بوو، ئیبراهیمی کوڕی لە کەعبەدا لەدایك بوو (واتە خۆی)و پێچای بە قوماشێکەوەو بردیە خزمەت خواناسو پیاوچاكو دنیا نەویستەکانەوە، پێی دەوتن: دوعای خێری بۆ بکەن، وادیارە دوعای هەندێکیان هاتۆتە دی[١].

٤-هۆیەکی صالحبوونی منداڵ پەیوەستە بە صالحبوونی دایكو باوکیەوە:

لە چیرۆکی موسیو خضردا (سەلامی خوایان لێ بێت) کە چۆن صالحبوونو پیاوچاکیو خواناسی دایكو باوك کاریگەری هەیە لەسەر منداڵو سوودیان پێ دەگەیەنێت.

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا﴾ الكهف (٨٢).

لەسەر ئەم ئایەتە (ابن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت ((وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا)) واتە باوکیان پیاوچاك بووە خوایش بەهۆی پیاوچاکی باوکیەوە چاکەی لەگەڵ منداڵەکەی کردو سامانەکەی بۆ پاراستن.[٢]

---

١ رواه أبو نعيم في الحلية (٧/٣٧١).

٢ رواه ابن أبي الدنيا في العيال (٣٦٠).

* لە جابری کوڕی عبداللەوە دەگێڕنەوە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ان الله يصلح بصلاح الرجل ولده وولد ولده وأهل دويرات حوله، فما يزالون في حفظ الله مادام فيهم))[١].

واتە: خوای عز وجل لەبەر خاتری چاکیو صاڵحی کەسێك، کوڕی ئەو کەسەو کوڕی کوڕەکەشیو خزمو کەسەکانی چواردەورەیشی دەپارێزێت، بەردەوام لەژێر پارێزگاری خوادا دەبن تا لەناویاندا بژیو بمێنێتەوە.

* هیشامی کوڕی حەسان دەڵێت: سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (من کۆمەڵێ نوێژی زۆری تر دەکەم لەپێناوی ئەم کوڕەمدا) واتە: تا خوا بەهۆیەوە ئەویش صاڵح بکات، هشام دەڵێت: واتە بەڵکو بەو هۆیەوە خوای گەورە کوڕەکەم بپارێزێت)[٢].

٥-هۆیەکی تری صاڵحبوونی منداڵ- چاکە کردن لەگەڵ دایكو باوکدا:

چونکە وەك عەرەب دەڵێن (الجزاء من جنس العمل) واتە پاداشت بەپێی کالاّیەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((برّوا اباءكم تبرّكم أبناءكم، وعفوا تعف نساؤكم))[٣].

٦- هۆیەکی تری صاڵحبوونی منداڵ: هەڵبژاردنی ژنی صاڵحەو خواناس:

* ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((تُنكَحُ المَرأةُ لِأربَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَبجَمالِها وَلِدينها، فَاظفر بِذات الدين تَرِبَت يَداك))[٤].

---

١ ابن مردوية كما في الدر المنثور (٤٢٢/٥). رواه ابن مبارك وابن شيبه كما في الدر المنثور (٤٢٢/٥).

٢ رواه أبونعيم في الحلية (٢٧٩/٤).

٣ رواه الطبراني في (المعجم الاوسط)(١٠٠٢) والحاكم من حديث جابر (رضي الله عنه) وقال المنذري في (الترغيب والترهيب) (٢١٨/٣): رواه الطبراني باسناد حسن

٤ رواه البخاري (٥٠٩٠).

واتە: ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەكرێت: لەبەر سامانی، نـەژادی، جوانیەكـەی، دینداریو خواناسیەكەی، دیندارو خواناس هەڵبژێرە دەستت دەچێت بە خێرو بێردا.

* (أبو الاسود) ڕۆژێـك بـە منداڵـەكانی خـۆی وت: مـن چـاك بـووم لەگەڵتانـدا چ بـە منداڵی چ بە گەورەییو چ پێش لەدایكبوونیشتان! وتیـان: چـۆن پـێش لـەدایكبوونمان چاكەت لەگەڵ كـردووین؟ لـە وەڵامـدا وتـی: دایكێكم بـۆ هەڵبـژاردوون كـە بـەناوبردنی شەرم ناتانگرێت، لە ڕیوایەتێكی تردا (دایكێكم بۆ هەڵبـژاردوون كـە كـەس عەیبـدارتان ناكات پێی).

٧- هۆیەكی تری صالحبوونی منداڵ: هەڵبـژاردنی بـاوكو بـرای ژن كـە ئاقـڵو ژیرو خواناسو خێرخوازبنو سیرەتیان پاك بێت:

چونكە لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە سەیری خاڵوان بكرێت چونكە تۆو دزە تێكـەڵ دەبێـتو منداڵــەكانی دەچــنەوە ســەر بــاوكو براكــانی وەك پێغەمبــەر دەفــەرموێت: ((تزوجوا في الحي الصالح فان العرق دسّاس))

* (أبو سفيان الحميری) دەڵێت: جارێكیان عبداللـەی كـوڕی زوبـێر قـسەی دەكـردو زوبێریش (خوای لێ ڕازی بێت) لەوێ بوو فەرمووی: ئێی عبدالله كوڕی خۆم، هـەر دەڵـێ ئەبوبەكری صدیقی قسە دەكەیتو تا وام لێهات وامزانی ئەبوبەكر هاتۆتـەوەو قـسەمان بۆ دەكات، دەی جوان وردبەرەوەو بزانە چ كچێك داوا دەكەیت چـونكە منـداڵ لـە بـراو باوكی دایكەوە نزیكترەو لەوان دەكات)[١].

---

١ رواه ابن أبي الدنيا في (الاشراف في منازل الاشراف) (٢٧٧) وإبن عساكر (تأريخ دمشق) (١٨٠/٢٨)

٨- هۆیەکی تر بۆ صالْحبوونی منداڵ: جوان پەروەردەکردن‌و تەربیەتیان دابدات:

واتە هەردوو هۆکارەکە بەکاربێت لە (هاندان‌و ترساندن) واتە دەبێت منداڵ بەرەو چاکەو صالحبوون ببرێت، بۆ ئەم کارە دەبێت جار بەجاریش بترسێنرێت‌و هەڕەشەی لێ بکرێت، ئەگەر تاوانێك یان سەرپێچیەکی لێ دەرکەوت تا دووبارەی نەکاتەوە)*

(إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((علّقوا السوط حيث يراه أهل البيت فإنه له أدب))[١].

واتە: (دار یان قەمچییەك لە جێیەکی بەرز هەڵواسن لە ماڵدا بەجۆرێك ئەندامانی ماڵەکە بیبین‌و لە سنور لانەدەن) (بەڵام لە فەرموودەکەدا نەهاتووە کە دایبگرێت بۆیان واتە باوك دەبێت وەك هەور جار بەجار بگرمێنێت بەڵام زۆر بە دەگمەن ببارێنێت‌و لێدان بکاتە ئاخر چارەسەرو لێدانەکەش سوك بێت‌و لەجێی ترسناك نەدات)*.

* (إبن عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) بە پیاوێکی وت: (أدِب ولدك، فانك مسؤل عن ولدك فاذا أدبته، وهو مسؤل عن برِّك، وطواعيته لك)[٢].

واتە: ئەدەبی منداڵەکەت دابدە چونکە تۆ بەرپرسیاری لە ئەدەب دادان‌و پەروەردەکردنی‌و لەبەرامبەریشدا ئەویش بەرپرسیارە لەوەی لەگەڵتدا جوان ڕەفتار بکات‌و گوێڕایەڵت بێت.

---

* وتەی وەرگێڕ

١ رواه عبدالرزاق (٢٠١٢٣) والطبراني في (المعجم الكبير) (١٠٦٧١) واسناده صحيح.

* وتەی وەرگێر.

٢ رواه أبونعيم في تأريخ اصفهان (٤٦٥/١). والطبري في المعجم الكبير (١٠٦٧١) واسناده حسن.

٩- هۆیەكی تر: سەرەمەشق و چاولێكەری چاك:

خوای عزوجل ـ كاتێك باسی گومڕایی بتپەرست و بێ باوەڕانمان بۆ دەكات، باس لەوە دەكات كە بەبێ بەڵگە وەك چاولێكەری باوك و باپیرانیان ئەم بتە درۆینانە دەپەرستن وەك لە ئایەتی ٢٣ سورەتی (زخرف)دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ﴾.

* (فضیل)ی كوڕی (عیاض) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: مالیكی كوڕی دینار پیاوێكی بینی نوێژی دەكرد بەڵام هەر لە نوێژ نەدەچوو، زۆر هەڵەی تێدا دەكرد، بۆیە فەرمووی: ئای چەند بەزەییم بە منداڵەكانیدا دێتەوە، پێیان وت: ئەی (أبو یحیی) ئەم لە نوێژدا هەڵەدەكات چ پەیوەندیەكی هەیە بە منداڵەكانیەوە؟ مالیك فەرمووی: بەڕێزانم: ئەم پیاوە گەورەیانە، لەوەوە شتەكان فێردەبن)[1].

* (مقاتل)ی كوڕی (بنان العكی) دەڵێت: جارێكیان لەگەڵ باوكمو براكەمدا چوومە خزمەت (أبو اسحاق) واتە ئیبراهیم (الحریری))، (أبو اسحاق) بە باوكی وت: ئەمانە كوڕی خۆتن؟ وتی: بەڵێ. وتی دەی دەخیلت بم، ئاگاداربە، با نەتبینن سەرپێچی خوا بكەیت، چونكە لەبەرچاویان دەكەویت[2].

١٠- هۆیەكی تر: وتنی بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ لەكاتی كاری شەرعیدا:

(ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((لو ان أحدهم أراد ان يأتي أهله قال: بِسمِ الله، اللّهُمَ جَنُّبنَا الشَّيطَانَ وَجَنِّب الشَّيطَانَ مَارَزَقتَنا، فَإنّه ان يُقدِّر بَينهما ولد في ذلك، لَم يَضره الشّيطان أبَداً))[3].

---

١ رواه أبو نعيم في الحلية (٢/٣٨٣).

٢ رواه الخطيب في تأريخ بغداد (٦/٣٧).

٣ رواه البخاري (٦٣٨٨).

واتە:ئەگەر كەسێ لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانەكەی‌و بڵێ: بە ناوی خواوە، پەروەردگارم ئێمەش‌و ئەو ڕۆڵەیشی پێمان دەبەخشی، لە شەیتان بە دوورمان بگرەو بمانپارێزە، ئەگەر لە ئەنجامی ئەو كارە خوا منداڵێكی پێدان، هەرگیز شەیتان ناتوانێت زیانی پێ بگەیەنێت‌و زەبەردی پێبەرێت.

* حەسەنی بەسری (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: دەڵێن: هەر كاتێك پیاو ویستی كاری شەرعی لەگەڵ خێزانی خۆیدا بكات بڵێ: بەناوی خوا، خوایە بەرەكەت بخەرە ئەو ڕۆڵەیەی پێمان دەبەخشی، شەیتان كەمترین سودی لێ نەبینێت، دەڵێ: هیوا زۆرە ئەگەر منداڵیان بوو، دەبێت بە یەكێك لە صالحین)[١]. وە شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.

١١- هۆیەكی تر: دۆزینەوەی ناوی جوان‌و مانابەرز:

عمری كوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((أسلَم سَالَمَهَا اللهُ، غِفَار غفرَاللهُ لَها، وعصية عصتِ الله ورسوله))[٢].

واتە: بەناوی ئەسلەم (بێوەی) خوا بێوەی بكات، لێبوردە خوا لێی ببورێت، سەركەش‌و بێ گوێ سەركەشی خوا و پێغەمبەرەكەی دەبێت).

* لە (ابن المسيب)و ئەویش لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە باوكی چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەویش لێی پرسیوە: ناوت چیە؟ (ما اسمك)؟ وتی: حەزن، واتا: غەمبار، پێغەمبەر (ﷺ) وا دیارە ناوی ڕەشینی پێ ناخۆش بووەو گۆڕیویەتی، بۆیە پێی فەرموو: ((انت سهل)) واتە تۆ (ئاسان)یت. كابرایش ئەوەندە گیردەبێت

---

١ رواه عبدالرزاق (٦/٣٧).

٢ البخاري (٣٥١٤), احمد (٢/٢٠).

دەڵێت: ئەم ناوە باوكم بۆی دیاری كردووم نایگۆڕم! (ابن المسيب) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لەدوای ئەو ڕووداوە پشتاوپشت غەمباری لەگەڵماندا هات)[١].

١٢- هۆیەكی تر: گۆشكردنی بە نانی حەڵاڵ:

* جابری كوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((ياكَعب بن عُجرَة، انهُ لايدخل الجنة لحم نَبتَ من سحت))[٢].

واتە: ئەی كەعبی كوڕی عوجرە! (جوان گوێ بگرە) دەزانی ئەوەی لەسەر پارووی حەرام گۆشت بگرێتو قەڵەو ببێت ناچێتە بەهەشتەوە؟.

منیش دەڵێم: كەسێك لەسەر حەرام گۆشتو ئێسقانی گەورەبووبێت! دەبێ چ هیوایەكت پێی بێ و چۆن صالح دەبێت.

*موعاویەی كوڕی قوڕڕە (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوای تەعالا لە یەك ڕۆژدا ڕۆزی مانگێك بۆ بەندە دیاری دەكات، ئەگەر بە چاكە پەیدای بكاتو بە چاكە سەرفی بكات ئەوە ماوەی ئەو مانگە خۆیو منداڵەكانی لە خێرو خۆشیدا دەژین، بەڵام ئەگەر بە حەرامی پەیدای بكاتو لە خراپە سەرفی بكاتەوە ئەوە ماوەی ئەو مانگە خۆیو خێزانەكە لە خراپەو شەڕدا دەژین)[٣].

١٣- هۆیەكی تر: بە پارەی حەڵاڵ ژن بهێنێت:

عوروە لە دایكی باوەڕداران (عائیشەوە) دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێت) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إن من يمن المرأة تيسير خطبتها، وتيسير صداقها، وتيسير رحمها))[٤].

---

١ رواه البخاري (٦١٩١).

٢ رواه احمد (٣٢١/٣) والحاكم (٤٢٢/٤)، واسناده صحيح.

٣ رواه ابو نعيم في الحلية (٢٩٩/٢)

٤ رواه أحمد (٧٧/٦)، والحاكم (١٨١/٢) واسناده حسن.

واتە: لە فەڕو بەرەکەتی ژنو ژنخوازی (ئەوەیە) کە دیاریکردنو داواکردنی خۆش دەستو ئاسان بێت، مارەییەکەشی کەمو ئاسان بێت، بە ئاسانی منداڵی ببێت).

هەر ئەم فەرموودەیە (ابن حبان) لە صەحیحەکەیدا (٤٠٩٥) هێناویەتیو بە زیادەی وتەیەکی جوانی عورروە (کە فەرموویەتی): منیش دەڵێم لە شومو نەگبەتیو بێ بەرەکەتی ژنە، کە داواکردنو مارەکردنی قورس بێتو مارەیشی زۆرو بێ ئەندازە بێت.

هەروەها (امام البیهقی) لە (السنن الکبری)دا (٧/٢٣٥) هێناویەتی بە زیادەی وتەیەکی تری عورروە کە دەفەرموێت: (تیسیر رحمها) واتە: ڕەحمی بە ئاسانی منداڵی لێ دێتەدەرەوە.

منیش دەڵێم: لە فەرو بەرەکەتی ژن بێت کەم مارەییەکەی، دەی (پەیداکردنی مارەییەکەی لە پارەی حەلاڵو زەلال پەیداکردبێت) زیاتر کاریگەری هەیە لەسەر صالحبوونی منداڵەکانی نێوانیان.

* فەرقەدی سەبخی دەڵێت: پێم وایە بەنی ئیسرائیل بۆیە ڕۆڵەی پێغەمبەرانیان تیاهەڵدەکەوت چونکە بە حەلاڵترین پارەی ڕەنجەشانیان مارەیی ژنیان دەردەکرد).

١٤- هۆیەکی تر: شیری ئافرەتی صالحەو خواناسی پێ بدرێت، لە فەرموودەی ژمارە (١٩)دا بەدرێژی باسی لێوە دەکەین (إن شاء الله)

١٥- هۆیەکی تر: دوورخستنەوەیان لە هاوڕێی خراپ:

* (ابراهیم الحزنی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) (منداڵەکانتان لە هاوڕێی خراپ بەدوور بگرن پێش ئەوەی لە بەلاو خراپە هەڵیان کێشن وەك چۆن جلو بەرگ لە ڕەنگ هەڵدەکێشرێتو ڕەنگاوی دەبێت)[1].

* هەروەها دەفەرموێت: (اول فساد الصبیان بعضهم من بعض)[2].

---

١و ٢ رواه ابن الجوزي في (ذم الهوی) ص ٩٧.

* عەلی کوڕی جعفر دەڵێت: باوکم بردمی بۆ خزمەت (احمدی کوڕی حەنبەل) (رەحمەتی خوای لێ بێت)و باوکم پێی وت: ئەی (أبو عبدالله) ئەمە کوڕی خۆمە! ئەویش دوعای خێری بۆ کردمو پاشان بە باوکمی فەرموو:

فێری کاسبیو بازاڕی بکەو لە ڕەفیقی خراپ زۆر بیپارێزە)[١].

١٦- هۆکارێکی تر: لە دراوسێی خراپ دوربخرێنەوە:

* (أبو حاتم) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: گوێم لە (احمد)ی کوڕی (سنان) بوو دەیفەرموو: هەر کاتێك پیاوێك خاوەن بیدعەیەك بوو بە دراوسێی، ئەگەر بۆی کرا با خانووەکەی بفرۆشێتو باربکات بۆ جێیەکی تر، ئەگەر وا نەکات ئەوە منداڵەکانی خۆیو دراوسێکەشی لەناو دەبات) و(ابن سنان) ئەم وتەیەی لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەیەکی پێغەمبەردا دەربڕیوە کە دەفەرموێت: ((مَن سمع مِنكُم بالدَّجَال فَلينأ عنه، فَان الرجل ياتيه وهو يرى انه كاذب فيتبعه لما يرى من الشبهات))[٢].

واتە: هەر کەسێکتان گوێی لە دەجال بوو با لێی دووربکەوێتەوە چونکە دێت بۆ لایو دڵنیایشە کە درۆزنە کەچی شوێنی دەکەوێت لەبەر کۆمەڵێ مەسەلەی گوماناوی).

١٧- هۆکارێکی تر: تێکەڵ کردنیان بە دنیای زانایانو دنیانەویستان:

* (أبوهريرة) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە دەربارەی کۆڕی قورئان خوێندنو زانایانو خواناسان فەرموویەتی: ((هم قوم لايشقى بهم جليسهم))[٣].

---

١ (الحث على التجارة) للخلال ل٢٩.

٢ رواه (ابن بطة) في (الابانة الكبرى) (٤٧٤).

٣ رواه مسلم (٢٦٨٩).

واتە: ئەو کەسانە کۆڕگەلێکی وایان هەیە کە هەر کەسێك بەشداریان بکات نائومێدو بیّ بەش نابێت لە خێرو پاداشتو بەرەکەتیان.

* مەیمونی کوڕی مەهران دەفەرموێت: (العلماء هم ضالتي في كل بلدة وهم بغيتي، ووجدت صلاح قلبي في مجالسة العلماء)[١].

واتە: لە هەر ناوچەیەك کە سەفەری بۆ دەکەم یەکەمین شت کە بیاندۆزمەوە زاناکانو ئەوانە وونبووی منن‌و بەدوایاندا کون بەکون دەگەڕێم‌و من بە ژیان لە خزمەت زانایاندا صالحبوونی دڵم بەدی دەکەم).

* زەکەریای کوڕی زیاد (النحوی) دەڵێت: مامۆستا گەورەکانمان دەیان فەرموو: (جالس العلماء، فانك ان اصبت حمدوك، وان اخطأت علموك، وان جهلت لم يعنفونك، ولاتجالس الجهال، فانك ان اصبت لم يحمدوك، وان اخطأت لم يعلموك، وان جهلت عنفوك، وان شهدوا لك لم ينفعوك)[٢].

واتە: لەگەڵ زانایاندا هەڵسەو دانیشە، چونکە ئەگەر چاکە بکەیت دەستخۆشیت لیّ دەکەن، ئەگەر هەڵە بکەیت ڕاستت دەکەنەوە، ئەگەر گەوجییەکت لیّ وەشایەوە لێت توڕە نابن، بەڵام هاوڕێیەتی نەفامان نەکەیت، چونکە ئەگەر چاکەت کرد دەستخۆشیت لیّ ناکەن‌و ئەگەر هەڵەت کرد فێرت ناکەن، ئەگەر گەوجییەکت لیّ دەرکەوت دنیات لیّ دەهێنەیەك‌و لێت توڕە دەبن، ئەگەر شایەتیت بۆ بدەن سوودت پیّ ناگەیەنن).

* لوقمانی حەکیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) بە کوڕەکەی دەفەرموێت: (يا بنيّ جالس العلماء، وزاحمهم بركبتك، فان الله تعالى يحيي القلوب بنور الحكمة كما يحيى الارض بوابل السماء)[٣].

---

١ رواه أبو نعيم في الحلية (٨٥/٤).

٢ رواه الوكيع في (أخبار القضاة) (١١٣/٣).

٣ رواه ابن مبارك في الزهد (١٣٨٧).

واتە: كوڕی شیرینم بچۆرە خزمەت زانایانو ئەزنۆكانت بنوسێنە پێیانەوە، چونكە خوای گەورە دڵەكان بە نوری حیكمەتو ئامۆژگاری جوان زیندوو دەكاتەوە وەك چۆن لە ئاسمانەوە بە باران سەر زەوی زیندوو دەكاتەوە.

* صالحی كوڕی أحمدی كوڕی حەنبەل دەڵێت: هەر كاتێك پیاوێكی دنیانەویستو خواویست بهاتایە بۆ لای باوكم، یەكسەر باوكم جوابی دەنارد بە دوای مندا تا بێمو سەیرێكی بكەمو بیناسم، چونكە زۆر حەزی دەكرد منیش بەو جۆرەم لێ دەربچێت)[١].

شەشەم:

ئەم هۆكارانەی پێشوو كە باسمان كرد سوودێكی باشی هەیە لە بواری صالحبوونی منداڵداو بە (یارمەتی خوا) بەرهەمێكی چاكی دەبێت، بەڵام وادەبێت مرۆڤ زۆر خۆی ماندوو دەكات لەگەڵ منداڵەكانیدا، بەڵام دەبینی هەندێكیان صالح نابنو خوای گەورە نیازێكی تری پێیانە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەركی سەر شانی خۆی جێ بەجێ بكاتو لە پەروەردەكردنیان سستی نەنوێنێت، بەو كارەی پاداشتی ئەوەی دەست دەكەوێت كە مەبەستی بووە صالح دەرچن، ئیتر ئەگەر كەسێكی خراپیش دەربچن دوای هەوڵی ئەم ئەوە (ان شاء الله) هیچ گوناهبار نابێت.

لەو كاتەدا پێویستە لەسەری بە ئارامو خۆگربێت لەسەر ناصالحی كوڕەكەیو بەو هۆیەوەیە باوكان تووشی ئەو بەڵایە دەبنو ئەجرو پاداشتیان لەو ڕێگەیەوە چنگ دەكەوێت.

ئەوەتا (نوح) پێغەمبەری خوایە (علیە السلام) زۆر هەوڵی دا كوڕەكەی هیدایەت وەربگرێت، بەڵام نەیتوانی وای لێ بكاتو لە ئاكامدا لەناو لافاوەكەدا بە خنكاندن لەناوچوو.

---

١ رواه الخطيب في تأريخ بغداد (٩/٣١٧).

* وەلیدی كوڕی نومەیری كوڕی ئەوس دەڵێت لە باوكمم بیست دەیووت: (الصّلاح من الله والادب من الادباء)[١]. واتە: صالحبوون لە خوایەوەیەو پەروەردەكردن لە باوكانو ئەو كەسانەوەیە كە پەروەردەی ڕۆڵەكانیان دادەدەن.

* (مصعب)ی كوڕی (الزبیر) دەڵێ: كوڕێكی مالیكی كوڕی ئەنەس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە سەربانەوە هاتەخوارەوەو كۆترێكی بەدەستەوەبوو كە داپۆشتبوو تا كەس نەیبینێت، دەڵێ: ئیمام مالیك زانی كە خەڵكەكە زانیویانە بۆیە فەرمووی: (الادب أدب الله، لاأدب الاباء والأمهات، والخير خيرالله لاخير الاباء والمهات)[٢].

واتە: پێشەوا مالیك ڕووی كردە میوانەكانیو فەرمووی: ئەدەب دادانی منداڵ بەدەست خوایە نەك بەدەستی دایكو باوكان، خێرو چاكەیش هەر لە خواوەیە نەك لە دایكو باوكانەوە.

**حەوتەم:**

پەروەردەكردنی منداڵ بۆ چاك بوونیو گوێڕایەڵی كردنی خوای تەعالا، وای لێ دەكات كە لە ڕۆژی قیامەتدا لەو ڕۆژەی كە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری عەرشی پەروەردگار، دەخرێنە ژێر سێبەری عەرشەوەو لە گەرمای ساحەی مەحشەر ڕزگاری دەبێت.

* (أبو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((سَبعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَومَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ الإِمَامُ العَادِل، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ الله...))[٣].

---

١ رواه البخاري في الادب المفرد (٩٢).

٢ رواه الرامهرمزي (المحدث الفاصل) (١٤٨).

٣ رواه البخاري (٦٦٠).

واتە: حەوت كۆمەڵ، خوای گەورە دەیانباتە ژێر سێبەری خۆیەوە لە ڕۆژێكدا كە جگە لە سێبەری ئەو هیچ سێبەرێك شك نابرێت.

ئیتر لە بەرەی پێشووانی ئەم ئوممەتەوە بەسەرهاتی زۆر هەیە دەربارەی ئەو گەنجانەی بە گوێڕایەڵی پەروەردگارەوە گەورە دەبن، وا دەكات لە مرۆڤ كە هەواڵ بدات منداڵی صاڵحو ڕەوشت بەرزی ببێتو لەسەر خۆشەویستی ئیسلامو شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

هەموو ئەجرو پاداشتی ئەو ڕۆڵە صاڵحە بۆ باوكو دایكشیەتیو ئەگەر چاكیو صاڵحیو بۆخوا ژیان لەخۆتدا بەو جۆرە نەهاتبووە دی، دەی هەوڵ بدە لە ڕۆڵەكەتدا بیهێنیتەدیو خوا كۆمەكت بێت:

* موریح كوڕی مەسروق (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (هەر گەنجێك لەبەر خاتری خوا واز لە خۆشیەكانی دنیاو ئارەزووات بهێنێتو گەنجێتییەكەی بۆ خوا تەرخان بكات، ئەوە –سوێند بەو كەسەی كە گیانی موریحی بەدەستە– ئەجرو پاداشتی (٧٢) (صدیق)ی هەیە)[١].

* عەتەبەی كوڕی عەبدی سەلەمی (خوای لێ ڕازی بێت) كە یەكێكە لە هاوەڵە دڵسۆزەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ان الشباب المؤمن لو يقسم على الله لأبره)[٢].

واتە: گەنجو لاوی بڕوادار –ئەوەندە لای خوا خۆشەویستە– ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات بۆ هەر شتێك خوای تەعالا بۆی دەكات.

* * *

---

١ رواه ابن المبارك في (الزهد) (٣٤٨) واسناده صحيح.

٢ رواه ابن المبارك في (الزهد) (٣٤٨) واسناده صحيح.

## فەرموودەی چوارەم

## قورئان فێرکردنی منداڵان:

**عن ابن عباس** (رضى الله عنهما): (توفي رسول الله (ﷺ) وَأَنَا إِبنُ عَشرِ سنين، وَقَد قَرَأتُ المُحكم، قال شعبة: قُلتُ لِأبي بِشرٍ، ما المُحكَم؟ قال: المُفصَّل).

**واتە:** عبداللەی کوڕی عەباس (خوا لە هەردووکیان ڕازی ببێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی فەرموو لە دنیا دەرچوو، من تەمەنم دە ساڵان بوو، هەموو سورەتە (مەحکەمەکانم) خوێندبوو، شوعبە دەڵێت: بە باوکی بیشرم ووت: مەحکەم یانی چی؟ لە وەڵامدا وتی: واتە سورەتە درێژەکان.

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

احمد لە (المسند)دا (٢٨٧/١) و (البخاری) لە (الصحيح)دا (٥٠٣٥) لە باسی قورئان بە منداڵان وتنەوەو (الطبراني) لە (المعجم الكبير)دا (٢٣٤/١٠) (١٠٥٧٧).

ئەو ئەحکامو ئادابانەی لەم فەرموودەیەوە دەستمان دەکەوێت:

**یەکەم:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانی باوکانی داوە بۆ ئەوەی منداڵەکانیان فێری قورئان بکەنو پێیان لەبەر بکەن:

* عثمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خَيركُم مَن تَعَلمَ القُران وَعَلَمه)).[1] واتە: چاکترینو باشترینتان ئەو کەسانەتانن کە خۆیان فێری قورئان دەبنو خەڵکانی تریش فێردەکەن.

* (بريده الاسلمی) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَن قَرأَ القران وتعلمه وعمل به، اُلبس يوم القيامة تاجاً مِن نور،

---

١ رواه البخاري (٥٠٢٧).

ضوءه مثل ضوء الشمس، ويكسى والداه حلّتان لايقوم بهما الدنيا، فيقولان: بم كُسينا؟ فيقال: بأخذ ولدكما القرآن)).[١]

واتە: هەر کەسێك قورئان بخوێنێتو فێری ببێتو کردەوەی پێ بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا تاجێکی نورین دەکرێتە سەری، کە وەك ڕووناکی خۆر بریقە دەداتەوە، باوكو دایکیشی دوو خشڵیان لەبەر دەکەن کە هەموو دنیا شتی وای بەخۆوە نەدیوە: هەردووکیان دەڵێن: بەهۆی چییەوە ئەم خشڵە جوانەمان پیاکراوە؟ دەڵێن: بەهۆی ئەوەی منداڵەکەتان قورئانی دەخوێند لە دنیادا.

**دووەم:**

پێشینەی صاڵحی ئوممەتی ئیسلام (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر گرنگیان داوە بەوەی کە منداڵەکانیان فێری قورئان بن، هەر لە سەرەتای تەمەنیانەوە خێرا قورئانەکەی پەروەردگاریان پێ خەتم کردوون، کردوویانە بە یەکەم زانست کە دەبێت منداڵ فێری بکرێت بێگومان لەدوای یەکتاپەرستیو بیروباوەڕ چەسپاندن لە دڵو دەروونیاندا.

* زەیدی کوڕی ثابت (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە شاری مەدینە من تەمەنم (١١) ساڵان بوو، بردمیانە خزمەتیو وتیان: ئەمە منداڵێکی هۆزی خەزرەجە (١٦) سورەتی قورئانی خوێندووە)[٢]

* (عەکرمە) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: عبداللەی کوڕی عباس (خوای لێ ڕازی بێت) لەپێناوی ئەوەی قورئانو سوونەتم فێربکات ئەیبەستمەوەو کۆتی دەکردە قاچەکانم).[٣]

---

١ رواه ابن ابي شيبه (١٠٠٩٤). وأحمد (٣٤٨/٥) والحاكم (٥٦٧/١) وقال هذا حديث صحيح على شرط مسلم.

٢ رواه الحاكم (٤٢١/٣) وابن عساكر في تأريخ دمشق (٣٠٢/١٩)

٣ رواه أبونعيم في (الحلية) (٣٢٦/٣) وابن عساكر في (تأريخه) (٨٢/٤١).

* عەقەبەی كوڕی نافیع (خوای لێ ڕازی بێت) لەكاتی گیان سپاردندا وەسیەتی كرد بۆ كوڕەكەی‌و پێی وت: (كوڕی شیرینم من لە سێ شت بەرگریم لێ كردوون، ئاگاتان لێی بێت‌و لەبیرتان نەچێت، یەكێكیان پێی وتن: هەرگیز خۆتان بە شیعرو شتەوە خەریك نەكەن با لە قورئان خوێندن مەشغوڵتان نەكات).[١]

* (ابن ابی حاتم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: باوكم نەیهێشت دەست بكەم بە خوێندنی فەرموودە تا هەموو قورئانم لەلای (فضل)ی كوڕی (شازان) خوێندو خەتم كرد).[٢]

سێیەم:

لەبەر ئەم هۆیەیە كە پێشینەی صاڵحی ئوممەت یەكەمین كاریان لەبەركردنی قورئان بووە لە منداڵیدا:

* ئەیاسی كوڕی موعاویە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: حەفسەی كچی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خوشكی محمدی كوڕی سیرین بوو لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا هەموو قورئانی خوێند)[٣]

* سوفیانی كوڕی عویەینە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە تەمەنی چوار ساڵیدا دەستم كرد بە قورئان خوێندن، دەستم كرد بە نوسینەوەی فەرموودە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا).[٤]

---

١ الطبراني في (المعجم الكبير) (١٧/٢٦٨). الخطيب البغدادي في الكفاية (٤٩).
٢ تذكرة الفاظ للذهبي (٣/٨٣٠).
٣ السير (٤/٥٠٧).
٤ فتح المغيث (٢/١٤٧).

* ئیمام شافیعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لە تەمەنی حەوتساڵیدا هەموو قورئانم لەبەرکردو (موطأ)ی ئیمام مالیکم لە دە ساڵیدا لەبەرکرد)[١]

* وەکیع (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: ئیبراهیم الحربی (رەحمەتی خوای لێ بێت) کوڕێکی هەبوو یانزە ساڵان بوو قورئانی پێ لەبەرکردبوو، فیقهێکی زۆریشی فێرکردبوو)[٢]

* ئیبراهیمی کوڕی سەعید الجوهری دەڵێ: منداڵێکم بینی لە تەمەنی چوار ساڵان بوو هێنایانە خزمەت هەندێك لە خەلیفەکانی عەباسی (کە هەموو قورئانی لەبەرکردبوو و ڕاوبۆچوونی فیقهی هەبوو، تەنها ئەوە نەبێت کە برسی ببوایە دەگریا بۆ نان)[٣]

* (أبو محمد اللبان) دەڵێ: لە تەمەنی پێنج ساڵیدا هەموو قورئانم لەبەرکرد.[٤]

**چوارەم:**

ئاستی گرنگی دانیان بە قورئان خوێندنی منداڵەکانیانو لەبەرکردنی گەیشتبووە ئاستێك کە نەیان دەهێشت زانستی فەرموودە بخوێنن تا قورئانیان بەجوانی ڕەوان نەکردایە، ئەمەش لەبەرئەوەی هیچ شتێك لە قورئان فێربوون خەریکیان نەکات.

* (أبو العیناء) محمدی کوڕی قاسم دەڵێ: منداڵ بووم چووم بۆ خزمەتی عبداللەی کوڕی داود الحُزیبی، پێی وتم: بۆچی هاتووی؟ وتم: بۆ فێربوونی فەرموودە، ئەویش وتی: لەپێشدا بڕۆ قورئان تەواو بکە، وتم: هەموویم لەبەرکردووە، ئەویش وتی: ئادەی لەوێوە بیڵێ: ﴿وَاتلُ عَلَیهم نَبَأَ نوحٍ﴾ منیش دەستم پێ کرد تا تەواوم کرد بۆی)[٥].

---

١ طبقات الحفاظ (السيوطي) (١٥٤).

٢ رواه الخطيب في تأريخ بغداد (٣٧/٦).

٣ السير (١٥٠/١٢).

٤ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥ تهذيب الكمال (٤٦٦/١٤).

* (حفص)ی کوڕی (غیاث) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: چوومە خزمەت ئەعمەش‌و پێم وت: فەرموودەم پێ بڵێ، فەرمووی: قورئانت تەواو کردووەو لەبەریشت کردووە؟ وتم: نەء، فەرمووی: بڕۆ جوان لەبەری بکەو پاشان وەرە بۆ لام، دەڵێ: ڕۆیشتم قورئانم خوێندو لەبەرم کرد بە تەواوی، پاشان هاتمەوە خزمەتی ئەویش قورئانی پێ خوێندم‌و منیش بۆم خوێند، ئەوجا فەرموودەی پێ وتم)[1]

**مەسەلەیەك:**

* مەیمونی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): کامەیانت پێ خۆشە: سەرەتا قورئان فێری کوڕەکەم بکەم یان فەرموودە؟ فەرمووی: نا، قورئانی فێربکە لە سەرەتای ژیانیدا منیش وتم: هەمووی پێ تەواو بکەم؟ فەرموی: بەڵێ مەگەر زۆر ناڕەحەت بێت لەسەری، چونکە ئەگەر لە سەرەتاوە لەگەڵ قورئاندا ڕات هێنا تا کۆتایی ژیانی لەگەڵی دەڕواتو دەوری دەکاتەوە)[2]

**پێنجەم:**

سەلەفی صالح (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) منداڵەکانیان وا ڕاهێنابوو کە بە پەلەپەل قورئانەکەیان بێ خەتم نەدەکردن بەڵکو کەم کەم‌و پاش ئەوەی ئەوەیان لەبەردەکردو کاریان پێ دەکرد ئایەتی تریان پێ دەوتن، تەنانەت مامۆستای وا هەبووە لە (دە) ئایەت زیاتری نەدەدا بە قوتابی.

* (ابو عبدالرحمن السلمی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەو هاوەڵانەی قورئانیان فێردەکردین وەك عوسمانی کوڕی عەففان‌و عبداللەی کوڕی

---

١ رواه الرامهرمزی (المحدث الفاصل) (٨٦).

٢ (ابن مفلح) لە (الاداب الشرعیه) (٣٣/٢). دەڵێ: تا ئەم ساتە وەختەش لەسەر ئەو ڕێڕەوەی احمد موسڵمانان کار دەکەن.

مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب (خوایان لێ ڕازی بێت) قورئانیان لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوێندووەو (١٠) ئایەتی پێ وتنەوەو لەوە تێنەدەپەڕین تا بە وردی کردەوەیان پێ دەکردو دەیان وت: قورئانەکە بە جوانی فێربووینو کردەوەشمان بە هەموویان کرد، پاشان أبو عبدالرحمن فەرمووی: لەدوای ئێمەوە بەرەیەك دێنەکایەوە ئەم قورئانە دەخوێنن وەك چۆن ئاو دەخواتەوە بەڵام لە گەرویان زیاتر ناڕواتە خوارەوە (دەستی برد بۆ قوڕگی خۆی).[١]

* هەشیان بووە لە (٥) ئایەت زیاتری نەوتۆتەوە: (یونس)ی کوڕی (ابی رجاء) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (ابو موسی الاشعری) (خوا لێی ڕازی بێت) لە (٥) ئایەت زیاتری پێ نەدەوتینو پێنج پێنج فێری دەکردین.[٢]

* (ابوالعالیە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (تعلموا القران خمس ایات، فانە أحفظ لکم) واتە: پێنج ئایەت، پێنج ئایەت قورئان فێربن،چونکە بۆ لەبەرکردن ئەوە باشترە).[٣]

* هەشیان بووە یەك ئایەتی فێری قوتابیەکانی کردووە لە ڕۆژێکدا.

أبوبکر بن عیاش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: عاصمی کوڕی ابی النجود (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وتم: ئایا وەك عوبەیدی کوڕی نەزلە قورئانت پێ بڵێم کە هەموو ڕۆژێك یەك ئایەتی بۆ خوێندۆتەوە)[٤]

---

١ رواه عبدالرزاق (٦٠٢٧). وابن أبي شيبة (٩٩٧٨). وابن جرير في تفسيره (٨٢).

٢ جمال القران للسخاوى (٢/٤٤٦).

٣ ابن أبي شيبه (٩٩٨). أبو نعيم في الحلية (٢/٢١٩).

٤ غاية النهاية (ابن الجوزي) (١/٤٩٨).

* تەیبی كوڕی اسماعیل دەڵێ: (قورئانم لەلای حوسەین دەخوێند هەموو ڕۆژێ یەك ئایەتی فێردەكردمو لە ماوەی (١٥) ساڵدا پێی خەتم كردم)[١]

شەشەم:

ئەمەش لەبەرئەوە بوو كە بە ئاسانتر لەبەر بكرێتو جوانتر فێری خوێندنەوەكەی ببێتو بیر لە ماناكانی بكاتەوەو پاشتر لە ژیاندا بە كردەوە جێ بەجێی بكات، مەبەست ئەوە نیە بە پەلەپەلو زۆر خێرا قورئان تەواوبكرێت بەڵام لێی تێ نەگاتو لەبەری نەكاتو كاری پێ نەكات وەك حاڵی زۆرێك لە قورئان خوێنەكانی ئەمڕۆ.

* (جندب)ی كوڕی (عبدالله) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ئێمە كۆمەڵێ منداڵی تازە پێگەیشتوو بووین بە دەوری پێغەمبەردا بووینو پێش ئەوەی قورئانمان فێربكات ئیمان وباوەڕی دەچەسپاند تێمانداو پاشان قورئانی پێ دەگوتینەوەو بەو جۆرە ئیمانمان بە قورئانەكە زۆر زیادی دەكرد، بەڵام ئێوە ئەمڕۆ فێردەبن پێش ئەوەی ئیمانو باوەڕ فێرببنو تێبگەن لێی).[٢]

* عبداللەی كوڕی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ماوەیەكی زۆر تێپەڕیو هەموو یەكێ لە ئێمە بیروباوەڕ فێردەبووین لەپێش قورئان خوێندن، سورەتێك دەهاتە خوارەوە بۆ محمد (ﷺ) ئێمەش حەڵالو حەرامو داواكاریو بەرگریكردنەكانی فێر دەبووینو ئێمە بەم شێوەیەی ئێوەو ئێستا سورەتەكانی قورئانمان وەرنەدەگرت، من لەم دواییانەدا كەسانێكم دیوە قورئان فێربووە پێش فێربوونی ئیمانو بیروباوەڕو تا

---

١ هەمان سەرچاوە (١/٢٤٤).

٢ لە فەرموودەی دوو خاڵی حەوتەمدا دەرهێنراوە.

وای لێهاتووە لە سەرتاوە بۆ کۆتایی قورئان دەزانێت بیخوێنێتەوە بەڵام حەڵاڵو حەرامو فەرمانو بەرگریەکانی نازانێت، کە دەبێت لەسەر ئەوانە بوەستایەو بەپەلە پەرشو بڵاوی نەکردایەتەوە).[١]

**حەوتەم:**

وشەی (المفصل) واتە: سورەتە درێژەکان، ئایەت زۆرەکان، کە سورەتەکانی کۆتایی قورئان دەگەیەنێت لە (الحجرات)ەوە دەست پێ دەکات، دەڵێن وای ناونراوە لەبەر زۆری برگەکانی کۆتایی هەموو ئایەتێك.

*   *   *

١ رواه ابن مندة في الايمان (٢٠٧)، والحاكم في المستدرك (١/٣٥) وصححها.

# فەرموودەی پێنجەم

## منداڵان و زانست فێركردنیان

لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: ان النبي (ﷺ) دخل الخلاء، فوضعتُ له وَضوءاً، قال: مَن وضع هذا؟ فَأُخبِر، فَقَال: (( اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ (وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

(بخاری) ڕیوایەتی كردووە (١٤٣) لە باسی دانانی ئاو لەپاڵ سەرئاودا، احمدیش (٢٦٦/١) (٣١٤/١) (٥٣٤/١) و (ابن حبان) (٧٠٥٥) زیادكرنەكەی كۆتایی هی ئەمانەی دواییە نەك بخاری.

### ئەحكام و ئادابەكانی فەرموودەكە:

**یەكەم:**

فەرموودەكە مانای ئەوە دەبەخشێت كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گرنگی داوە بە فێركردنی منداڵان و ئەوەش لە پاڕانەوەی لە خوای گەورە بۆ عبدالله كە عیلم و زانستی پێ ببەخشێت.

**دووەم:**

دوعاكردنی مامۆستاكان بۆ قوتابیەكانن ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ)چەند جارێك دوعای بۆ كردووە بۆ (ابن عباس) تا خوای گەورە عیلم و زانستی پێ ببەخشێت لەوانە:

١- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ((اللهم فقهه في الدين وعلمه التأويل)).

٢- پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: ((اللهم علمه الحكمة وتأويل الكتاب)). رواه ابن ماجه (١٦٦)

٣-(ابن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) وشاردمی بەخۆیەوەو فـەرمووی: ((اللـهم علمـه الحكمـة)) واتـە: خوایـە ژیـری و کاردروسـتی پـێ ببەخشە). رواه البخاری (٣٧٥٦)

٤- (ابـن عبـاس) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: (دعـا لـي رسـول الله (ﷺ) أن يؤتيني الحكمة مرتين).[١] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعـای بـۆ کـردم کـە حیکمـەتم پێ ببەخشرێت دوو جار.

٥- هـەروەها دەفـەرموێت: (دعـا رسـول الله (ﷺ) ان يزيـدني الله فهمـاً وعلمـاً)[٢] واتـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخوا پاڕایەوە بۆم کە زانستو تێگەیشتنم پێ ببەخشێت.

سێیەم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر سووربووە لەسەر پەرەوەردەردنی منداڵانو یەکێك لـەو گرنگی پێدانانە فێرکردنی منداڵانی ئەنسارەکان بۆ نووسین:

* (ابن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: هەندێك لە دیلەکانی جەنگی بـەدر پارەو سامانیان نەبوو خۆیانی پێ دەرباز بکەن لە دیلی، بۆیە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بڕیاریـدا ئازادیـان بکـات ئەگـەر منداڵـە ئەنـصاریەکان فێـری نووسـین بکـەن، دەڵـێ: جارێکیان یەکێك لەو منداڵانە بە گریانەوە دەهاتەوە بۆ لای باوکی، باوکیشی پێـی وت: خێرە وا دەگریت؟ وتـی: مامۆسـتاکەم لێـی دام، ئـەویش وتـی: پیـسی گـەڕ دەیـەوێت تۆڵەی بەدر بکاتەوە، وەڵاهی هەرگیز ناتنێرمەوە بۆ لای).[٣]

---

١ رواه الترمذي (٣٨٢٣).

٢ رواه الحاكم (٣/٥٣٤).

٣ رواه أحمد (١/٢٤٧) ، والحاكم (٢/١٤٠).

* موسڵمانەکان لەو ساتەدا زۆر پێویستیان بە پارەو چەك بوو، کەچی لەپێناوی خوێندنو فێربوون نووسیندا دەستیان لەو پارەو چەکە هەڵگرتو ئەمەش دوو مانای هەیە:

١ـ ئەوپەڕی گرنگی دانە بە زانستو زانیاری.

٢ـ دروستە مامۆستای کافر دەرس بە موسڵمان بڵێت، کە مادەم پەیوەندی بە ئایینەوە نەبێت، وەك ئەوەی ئەمڕۆ لە پیشەسازیو ئەندازیاریو پزیشکیو بورای کشتوکاڵیو جەنگدا.[1]

منیش دەڵێم: ئەمە ئەگەر لە ڤایرۆسی شەڕو گومڕاییو کوفریان دڵنیاببینو لەناو موسڵمانانیشدا کەسێك نەبێت بەو ئەرکە هەستێت.

**چوارەم:**

سەلەفی صالحیش (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر سووربوون لەسەر گرنگی دان بە فێرکردنی منداڵان:

* (مسکین)ی کوڕی (بەکر) دەڵێ: پیاوێك دای بەلای ئەعمەشدا کە دەرسی فەرموودەی بە منداڵاندا دەوتەوە، پێی وت: تۆ فەرموودە بە منداڵو مەزمە دەڵێیتەوە؟!

ئەعمەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بەڵێ هەر ئەمانەن لە دواڕۆژدا ئاینەکەی تۆ دەپارێزن)[2]

١ (اضواء البيان) (٣٥٧/٩).

٢ رواه الرامهرمزي في (المحدث الفاصل) (٦٥). والخطيب له (شرف اصحاب الحديث)دا لاپەڕە (١٣٤).

* سەعیدی کوڕی ڕەمحەی (الاصبحی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: منو کۆمەڵێك منداڵی هاوڕێم پێش بڕکێمان دەکرد لە شەودا بۆ وانەکانی عبداللەی کوڕی موبارەك، دوای ئێمەو خۆی کۆمەڵێك لە پیاوان دەگەیشتن، پێیان وت: ئەو منداڵانە پێش ئێمە گەیشتوون؟! ئەویش فەرمووی من دڵم بە ئەوان خۆشترە تا بە ئێوە، ئێوە چەند ساڵی ترتان ماوە بژین؟ بەڵام ئەوانە لەوانەیە زۆری تر بژین، سەعید دەڵێ: ڕۆژانێك هات جگە لە من کەسی ئەو وانەیە نەمانو مردن)[1].

* عبداللەی کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێ: ئا لێرەدا لە پشتی کەعبەوە هەڵقەیەکی وانەی فەرموودە هەبوو، عەمری کوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێت) تەوافی کەعبەی دەکردو هەر کە لێ بوویەوە هات بۆ هەڵقەکەو پێی وتین: ئەوە چیە دەتانبینم ئەو کۆمەڵە منداڵەتان لەوانەکەتان دوورخستۆتەوە؟! وامەکەن، جێیان بکەنەوەو نزیکیان بکەنەوە، لە فەرموودە بەهرەمەندیان بکەن، ئەوانە ئەمڕۆ منداڵی هۆزن بەڵام سبەینێ گەورەو ڕیش سپی خەڵکانی ترن.

ئێمەش کاتی خۆی منداڵ بووین، کەچی پاشتر بووین بە گەورەو ڕیش سپی خەڵکانی تر)[2]

* (ابن مفلح) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (ئەمە ڕاستەو گومانی تێدانیە کە وەرگرتنی زانست لە منداڵیدا بەهێزترە، پێویستە گرنگی بدرێت بە منداڵە خوێندکارەکان بەتایبەت وریاو زیرەكو مێشکدارەکان ئەوانەیان کە حەزیان لە وەرگرتنی زانستەو هەرگیز نابێت لەبەر کەم تەمەنی یان هەژاری یان لاوازی پشتگوێ بخرێنو گرنگی بەبواری زانستیان نەدرێت)[3].

١ الرامهرمزي (المحدث) لا (٦٧)، والخطيب في الجامع لا (٦٨٧).

٢ ابن سعد في الطبقات (١٩٣/٤) والبيهقي في السنن الكبرى (٦٣١).

٣ الاداب الشرعية (٢٢٥/١).

**پێنجەم:**

وەك حەزکردنو سووربوونیان لەسەر فێرکردنو پێگەیاندنی منداڵەکانیان پێشینەی صالّحی ئوممەت بەشداری کۆڕو وانەکانی فەرموودەیان کردوونو هانیان داون فەرموودە بنوسنەوە.

* (ابو عاصم) دەڵێ: کوڕەکەم لەگەڵ خۆم برد بۆ لای (ابن جریج) کە تەمەنی لە خوار سێ ساڵانەوەبوو، قورئانو فەرموودەی بۆ باس دەکرد، بۆیە (ابو عاصم) دەڵێ: (زۆر ئاساییە قورئانو فەرموودە باس بکرێت بۆ منداڵێکی لەو تەمەنە)[١].

* (احمدی کوڕی عبدالوهاب الحوطی) دەڵێ: باوکم لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ لای (أبی المغیرە) —عبدالقدوسی کوڕی حجاج الخولانی الحمصی—و پێشر باوکمو براکەم لەلای ئەو فەرموودەیان دەخوێندو کاتێك چاوی پێم کەوت بە باوکمی وت: ئەمە کێ یە؟ باوکم وتی: کوڕی خۆمە، ئەویش فەرمووی: ئەی بۆچی هێناوتە؟ وتی: بۆ ئەوەی گوێت لێ بگرێت! وتی: جا بۆ تێدەگات؟!

جا لەو کاتەدا لە مزگەوت بووین باوکم پێی وتم: هەستە دوو ڕکات نوێژ بکەو بە دەنگی بەرز هەموو زیکرەکانی بخوێنە، منیش وامکرد، (ابو مغیرە) وتی: زۆر باشە!

باوکم پێی وتم: فەرموودەیەکی بۆ بگێڕەرەوە، منیش وتم: باوکمو براکەم بۆیان گێڕامەتەوە لە (ئەبوموغیرە)وە ئەویش لە (ام عبداللەی کچی خالدی کوڕی مەعدان)و ئەویش لە باوکیەوە کە فەرموویەتی: یەکێك لە مافەکانی منداڵ بەسەر دایكو باوکیەوە ئەوەیە کە جوان پەروەردەی بکاتو بیخاتە بەر خوێندن، ئەگەر بوو بە دوانزە ساڵان ئیتر ئەو ئەرکەی نامێنێت، دوای ئەوە باوکەکە مافی هەیە لەسەر منداڵەکەیو ئەگەر ڕازی بوو لێیو گوێڕایەڵ بوو ئەوە بیکاتە دۆستو هاوڕێی خۆی، ئەگەر لێی ڕازی نەبوو (لاسار بوو) وەك نەیارو دوژمن سەیری بکات)

---

١ رواه الخطيب في الكفاية لا ١٥٥.

ئەبو موغیر فەرمووی: ئیتر لەم ڕۆژە بەدوا پێویستت بە باوكو براكەت نیەو بڵێ ئەبو موغیرە بۆی گێڕامەوە، وەرە دانیشە باسی ئەم فەرموودەیەم بۆ بكە كە گێڕاتەوە هەی (بارك الله فيك)[1]

* احمدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی (ابن عُیینە)ی دەكردو دەیفەرموو: منداڵبوو باوكی لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ مەككەو بەشداری وانەكانی عەمری كوڕی دینارو ابن ابی نوجەیحی دەكرد لە فیقهدا، دەیخستنە ناو هەر پۆلە قوتابیەكەوە لە هەموویان زیرەك تر دەبوو)[2]

* حەسەنی كوری عەلی كوری بندار (الزنجانی) دەڵێ: (احمدی كوری صالح) پێی ڕازی نەدەبوو كە قوتابی (لوس) یان (كۆسە) بەشداری وانەكانی بكات ئەمەش لەبەر خۆپارێزی و لە بەر قسەی خەلكی.

ئەبو داود بەشداری وانەكانی دەكردو گوێی لێ دەگرت، بەلام كوڕێكی كۆسەی هەبوو (لوسو جوان بوو) پێی خۆش بوو لەگەڵ خۆیدا بیهێنێو بەشداری وانەكان بكات بەلام دەیزانی كە احمدی كوری صالح پێی ناخۆشەو ڕازی نابێت، بۆیە هەستا بە مووی ڕەش كەمێك ڕیشی بۆ كوڕەكەی كرد تا مامۆستا وابزانێ ڕیشدارەو گەورەیە، ماوەیەك فەرموودەی پێ وتەوە تا ڕۆژێك ئاگاداری دەكەن، ئەویش بە (أبو داود) دەڵێ: ئایا وێنەی من دەبێت شتی وای لەگەڵدا بكرێت؟

ئەبوداودیش داوای لێبووردنی كردو پێی وت: لێم مەگرە لەسەر ئەم كارەی كردوومە، بەڵكو ئادەی لەگەڵ هەموو ڕاویو فیقهزانەكاندا كۆی بكەرەوەو تاقی كەرەوەو ئەگەر بەسەر هەموویاندا سەرنەكەوت، مافی خۆتە لە گوێ گرتن بۆ فەرموودە دەری بكەو بێ بەشی بكە لە وانەكانت.

---

١ رواه البيهقي في شعب الايمان (٨٣٠٦).

٢ رواه الخطيب في الكفاية (١٤٠).

مامۆستا أحمدیش هەموو قوتابیە زیرەك‌و پێشکەوتووەکانی خۆی کۆکردەوەو بەرامبەری ئەو منداڵە داینان، منداڵەکە دەستی کرد بە پرسیارکردن لێیان، سەرکەوت بەسەر هەموویاندا لە زیرەکی‌و تێگەیشتندا..

مامۆستا أحمد دوای ئەو کێبڕکێیەش هەر نەیهێشت بەشداری وانەکان بکات، بەڵام کوڕەکەی (أبو داود) زۆر شانازی بەو ڕووداوەوە دەکرد کە لە سەردەمی منداڵیدا لێی ڕووی داوە).[1]

* عبداللەی کوڕی سلیمان بن ابی داود السجستانی- دەڵێ باوکم لە سجستانەوە گەڕانمی بەناو هەموو شارە گەورەکانی وڵاتی یەکگرتووی ئیسلامداو بردمیە خزمەت زۆربەی زانا گەورەکانی ئیسلام، لە خۆراسان‌و جبال ئەسفەهان‌و فارس‌و بەسرەو بەغدادو مەدینەو مەککەو شام‌و مصرو جەزیرەو سەر سنورەکان، لە ئاکامدا لە بەغداد گیرسایەوەو لەوێ ژیاین).[2]

* عبداللەی کوڕی أحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێك یەحیای کوڕی ئەکسەم یەکەمین وانەی لەلای (ابن المبارك) خوێند، لە خۆشیاندا باوکی خەڵکی کۆکردەوەو خواردنێکی باشی بۆ دروست کردن‌و پاشان پێی وتن: ئێوە بە شایەت بن کوڕەکەم بە منداڵی وانەی لەلای (ابن المبارك) خوێند)[3]

**شەشەم:**

پێشینەی صاڵحی ئەم ئوممەتە ئەوەندە سووربون لەسەر فێرکردنی منداڵەکانیان، وەسیەتیان بۆ کردوون بۆ دوای مردنیان:

* شەرحەبیلی کوڕی سەعد دەڵێ: حەسەنی کوڕی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) براکانی‌و برازاکانی کۆکردەوەو پێی وتن: ئەی کوڕە شیرینەکانم، ئەی برازا

---

١ رواه ابن عساكر في تأريخه (٨١/٢٩).

٢ الخطيب البغدادي لە (تاریخەکەیدا لا (٤٦٤/٩).

٣ العلل ومعرفة الرجال (١٦٣٣).

خۆشەویستەکانم! بەڵێ ئێوە ئەمڕۆ منداڵانی ناو هۆزەکەن، بەڵام نزیکە ماوەیەکی تر ببنە گەورەو ڕیش سپی خەڵکانی تر، بۆیە شت زۆر فێربن‌و بخوێنن، هەر کەسێکتان نەیتوانی فەرموودەکان لەبەربکات، دەی با بینووسێتەوەو لە ماڵەکەیدا هەڵی بگرێت)[١]

* یوسفی کوڕی ماجەشون (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: منو برایەکەم‌و ئامۆزایەکم چووینە خزمەت (ابن شهاب)و دەربارەی هەندێك فەرموودە پرسیارمان لێ دەکرد ئەویش پێی وتین: خۆتان بەکەم نەزانن، بڵێن منداڵ‌و کەم تەمەنین، عمری کوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) ئەگەر مەسەلەیەکی قورسی بهاتایەلا خێرا گەنجەکانی کۆدەکردەوەو ڕاوێژی پێ دەکردن‌و سوودی لە ژیریە تیژیەکەیان وەردەگرت)[٢]

* زەنجی کوڕی خالد دەڵێ: کۆمەڵێ گەنج بووین چووینە خزمەت پێشەوا (الزهری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وتین: (اطلبوا العلم، فان اردتم الدنيا نلتم وان اردتم الاخرة نلتم)[٣]

واتە : هەوڵی دەسخستنی زانست‌و زانیاری بدەن، چونکە ئەگەر دنیاتان بوێ لەو ڕێگەیەوە دەستان دەکەوێت‌و ئەگەر قیامەتیشتان بوێت هەر لەو ڕێگەیەوە دەستتان دەکەوێت.

**حەوتەم:**

دەبێت مامۆستا گرنگی بەو زانستانە بدات کە منداڵ سوودی لێ دەبینێ وبە کردەوە جێ بەجێیان دەکات، وەك حوکمی نوێژو ڕۆژوو و حەج‌و زەکات‌و ئاداب‌و ڕەوشتە بەرزەکان‌و شتی تریش کە پێویستیان پێیەتی‌و لە ئاستی ژیریاندا بێت.

---

١ رواه الخطيب له (تقليد العلم) لا (٩١)، وابن عساكر في تأريخه (١٣/٢٥٩).

٢ رواه ابن أبى خيثمة في تأريخه (٢٣٢)، وأبو نعيم في الحلية (٣/٣٦٤).

٣ رواه الدينورى في (المجالسة) (٤٧٠).

با وا پەروەدە بکرێت لەسەر بەڵگەی قورئانو فەرموودەو بەدوور بخرێت لە ڕاوبۆچوونی بێ بەڵگەو لاوازیان دژ بە دەقەکان.

* وەکیع (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (یا فتیان، تفقهوا قبل الحدیث، فإنکم ان تفقهوا فقه الحدیث لم یقهرکم اهل الرأي)[١] واتە: ئەی لاوەکان، لە حەدیث تێ بگەن پێش ئەوەی حەدیس بخوێننو لەبەری بکەن، ئەگەر تێگەیشتن لە قورئانو فەرمووده هیچ تاقمی بۆچووندارانو عەقل بەکارهێنەران ناتوانن بتانبەزێنن).

* احمدی کوڕ جیان القطیعی دەڵێ: چوومە خزمەت أحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێم وت: ئایا بە ئاوی (النوره)[٢]..........دەستنوێژ دەگیرێت؟ وتی: پێم خۆش نیە، وتم: ئەی بە ئاوی پاقلە؟ فەرمووی: پێم خۆش نیە، دەڵێ: پاشان ویستم هەستم لەلایو بڕۆم لەدواوە جلەکانی گرتمو فەرمووی: ئەگەر بچیتە مزگەزت چی دەڵێیت؟ بێ دەنگ بووم! فەرمووی: ئەی ئەگەر لە مزگەوت چوویتە دەرەوە چی دەڵێیت؟ هەر بێ دەنگ بووم، ئەویش فەرمووی: دەجارێ تۆ بڕۆ ئەم شتانە فێرببە).[٣]

* ئەحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێك پرسیارێکی لێ بکردایە لە لای ئەو کەسانەی کە تاقمی عەقل بەکارهێنەر دروستیان کردبوون، تووڕە دەبوو دەیفەرموو: بێ قەزا بیت زانستێك وەربگرە سودی لێ وەربگریت، دەخیلت بم لەو شتانە بەدووربە کە داهێنراون، شتێك وەربگرە فەرموودەی لەسەربێت)[٤]

* (ابن وهب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: مالیك وتی: پیاوێك پرسیاری کرد لە پیاوێکی بەهەشتی دەربارەی هەوڵدانی دەستخستنی زانستو زانیاری، لە وەڵامدا پێی

---

١ رواه السلفي في (الطوريات) (٦١٠) والحاكم في معرفة علوم الحديث (٦٦).

٢ ئاوی (النوره) لە زمانی عەرەبیدا بەو ئاوە دەڵێن لەگەڵ کلسو شتی تردا گیراوەتەوەو بۆ لابردنی مووی شەرمگە بەکاردەهێنرا، ڕەنگی ئاوەکە وەك (دۆ) وایە (وەرگێڕ).

٣ الاداب الشرعية (٢/٦٩-٧٠)

٤ الاداب الشرعية (٢/٦٩).

وت: هەوڵدانی دەستخستنی زانست شتێکی باشە، بەڵام لەوە باشتر ئەوەیە کە وردبەرەوە بزانە چی پێویستە لە بەیانی تا ئێوارە دەکەیتەوەو لە ئێوارەوە تا بەیانی دەکەیتەوە کە بیانزانیتو بیانڵێیت، دەستیان پێوە بگرەو هەرگیز وازیان لێ نەهێنیت)[1]

قۆناغ بەندی لە کرداری فێرکردنی منداڵدا شتێکی زۆر پێویستەو نابێت ئایەتو فەرموودەی زۆر بخات بەسەریدا کە بۆی لەبەرنەکرێت:-

* حەسەنی بەسریو قەتادەو نافع وتویانە: (الحفظ في الصغر كالنقش على الحجر)[2] واتە: لەبەرکردن لەکاتی منداڵیدا وەك نووسینو هەڵکۆڵین وایە لەسەر بەرد.

*زوهەری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (من طلب العلم جملةً فاته جملةً، وانما يدرك العلم حديث أو حديثان)[3]

واتە: هەر کەسێ بیەوێت هەموو عیلم لەیەك کاتدا فێرببێت، ئەوە بە یەك کاتیش لەدەستی دەچێت، بەڵکو عیلم وەرگرتن بە فەرموودە فەرمودەو دوو فەرموودە دوو فەرموودەیە.

* شوعبە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: سەردانی قەتادەم دەکردو داوام دەکرد دوو فەرموودەم پێ بداتو ئەویش بۆی باس دەکردمو پاشان دەیفەرموو: زیاترت بۆ باس بکەم؟ منیش دەم وت: نەخێر، تا ئەم دووانە لەبەردەکەمو تێیان دەگەم)[4].

* ئیمام شافیعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئامۆژگاری مامۆستای منداڵەکانی خەلیفەی دەکردو پێی دەوتن: لە زانستێکەوە مەیان گوێزەرەوە بۆ زانستێکی تر تا

---

١ رواه البيهقي في المدخل (٣٢٨).

٢ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە.

٣ رواه الخطيب في الجامع (٤٥٢).

٤ رواه الخطيب في الجامع (٤٥١).

بەتەواوی لێی تێبگەن‌و فێری ببن، چونکە قەرەباڵغکردنی زانست لە مێشکی قوتابیدا سەری لێ تێك دەدات)[١]

**هەشتەم:**

پێویستە لەسەر باوك‌و دایك‌و مامۆستایان کە لە پێناوی هاندانی رۆڵەو قوتابیانیاندا بۆ دەستخستنی زانست دیاری‌و خەڵاتیان پێ ببەخشرێت.

زۆر دایك‌و باوك هەبوون لە رێگەی هاندان‌و خەڵاتکردنەوە رۆڵەکانیان گەیاندۆتە ئەوپەڕی بەرزی‌و بڵندی.

* ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (باوکم پێی وتم: کوڕی خۆم فەرموودە لەبەر بکە، چونکە هەر فەرمودەیەك لەبەربکەیت لەلایەن منەوە درهەمێکت پێ خەڵات دەکەم، لەبەر ئەو خەڵاتە هەموو فەرموودە فێربووم.)[٢]

* محمدی کوڕی قاسمی کوڕی خەلاد دەڵێ: (ئەوقەس) مرۆڤێکی کورتە باڵای ناشیرین‌و ناحەزبوو، دایکی پێی وت: کوڕی شیرینم، تۆ بەجۆرێك دروستکراویت بۆ ناو خەڵکی ناشێیت، هەوڵ بدە ئیسلامەتیت بەهێز بکەیت‌و زانست دەست بخەیت چونکە بەو هۆیەوە خەڵکی سەیری کورتی‌و ناشیرینیت ناکەن! ئەوقەس دەڵێ: ئەو قسەیەی دایکم زۆر بەسود بوو بۆم‌و وای لێکردم بەردەوام فیقهو فەرموودە بخوێنم‌و دواجار بووم بە قازی)[٣]

* مالیکی کوڕی ئەنەس (رەحمەتی خوای لێ بێت): دەفەرموێت: منداڵ بووم بە دایکم وت: دەڕۆم دەخوێنم؟ دایکیشم پێی وتم: دەی وەرە با جل‌و بەرگی زانایانت لەبەربکەم ئەوجا برۆ دەست بکە بە خوێندن، بردمی جل‌و بەرگی پان‌و پۆڕی زانایانی

١ رواه ابو نعيم في (الحلية) (٩/١٤٧)، و(ابن ابي دنيا) في العيال (٣٤١).

٢ رواه الخطيب في شرف أصحاب الحديث (١٤٠).

٣ رواه الدينوري في (المجالسة) (٢١٢٦) والخطيب في (الفقه والمتفقه) (١/٣١،٣٢).

کردە بەرەو کڵاوی کردە سەرمو پاشان عەمامەی لێ بەست بۆم وتی: ئا ئێستا بڕۆ بەدوای زانستو زانیاریدا.[1]

* وەکیعی کوڕی جیراح (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: دایکی سوفیانی سەوری بە سوفیانی وت: بڕۆ بخوێنەو زانست بەدەست بهێنەو خەمت نەبێت من بە تەشییەکەم مەسروفت دەکێشم، ئەگەر (٢٠،٣٠) فەرموودەت نووسیەوە، سەیری دەروونی خۆت بکە بزانە بەرەو خێرو چاکی دەتبات، ئەگەر زانیت نەیبردووی بەرەو صالحبوون دەی ئیتر خۆت ماندوو مەکە بە درۆوە)[2]

**تۆیەم:**

ئەگەر باوکو دایك یان مامۆستا بۆی دەرکەوت قوتابییەکەیان خاوەنی زیرەکیو تێگەیشتنو دەرککردنە بەڵام تاقەتی خوێندنی نیە! بۆیان هەیە زۆری لێ بکەن تا لەسەر خوێندن بەردەوام بێت.

* عەکریمە دەڵێ: عبداللەی کوڕی عباس (خوای لێ ڕازی بێت) لەکاتی فێرکردنی قورئانو فەرموودەدا هەردوو قاچی دەبەستمەوە[3]- تا ڕانەکەمو واز نەهێنم!.

* سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: بۆ مرۆڤ هەیە زۆر لە منداڵەکەی بکات بۆ بەردەوامی لەسەر خوێندنو تەواوکردنی قورئانو فەرموودە چونکە ئەو بەرپرسە لێی لە قیامەتدا)[4].

---

١ رواه الرامهرمزي في (المحدث الفاصل) (٨٠).

٢ رواه الجرجاني في (تأريخ جرجان) ل٤٩٢، تأريخ الاسلام (١٠/٢٢٥).

٣ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە

٤ رواه الخطيب في (شرف أصحاب الحديث) (٢٩٧).

دەیەم:

دەبێت گرنگی بە ڕەوشتو هەڵسوکەوتی خوێندکار بدرێت چونکە ئەوە جوانی زانستو ڕازاندنەوەیەتی.

* حەمدانی ئەسبەهانی دەڵێ: من لە خزمەت زانای گەورە (شەریك)دا بووم (رەحمەتی خوای لێ بێت) هەندێك لە کوڕەکانی خەلیفە مەهدی هاتن بۆ لایو پرسیاری لێ دەکرد دەربارەی فەرموودەو لەو کاتەدا بە پێوە پاڵی دابوویەوە بە دیوارەکەوە – بۆیە شەریك وەڵامی نەدایەوەو لای کرد بە لایەکی تردا–و ئەویش دووبارە پرسیارەکەی لێ کردەوە –ئەمیش هەر لای لێ نەکردەوە، ئەویش خۆی پێ نەگیرا وتی: دەڵێی سوکایەتی بە کوڕانی خەلیفە دەکەیت؟!

شەریکیش فەرمووی نەخێر: بەڵام زانستو زانیاری زۆر لەوە گەورەترو جوانترە کە خەڵکی لەناو خۆیاندا بێ ڕێزی بکەنو بیفەوتێنن، دەڵێ: کوڕی خەلیفە ئەو قسەیەی بیست خێرا دانیشت لەسەر ئەژنۆ لە خزمەت مامۆستا شەریکداو پرسیارەکەی لێ کردەوە؟

شەریکیش فەرمووی: ئا بەم شێوەیە داوای زانستو زانیاری دەکرێت.[١]

* مالیکی کوڕی ئەنەس (رەحمەتی خوای لێ بێت) بە کۆمەڵێك لە لاوانی قوڕەیشی فەرموو: (یا ابن اخي الادب قبل أن تتعلم العلم)[٢]

واتە: (ئەی برازاکەم ئەدەبو ڕەوشتی بەرز فێربە پێش ئەوەی زانستو زانیاری فێرببیت).

---

١ رواه ابن الجعد في (مسنده) (٢٥٣٨). والخطيب في (٣٤٦).

٢ رواه أبو نعيم في (الحلية) (٦/٣٣٠).

* ئیبراهیمی کوڕی حەبیبی کوڕی شەهید دەڵێ: باوکم پێی وتم: کوڕی شیرینم بڕۆره خزمەت زانایانو فیقهزانان، زانستیان لێ وەربگرەو لە هەڵسو کەوتو ڕەوشتیان کەڵك وەربگرەو کاری پێ بکە، من ئەمەم پێ خۆشترە لە زۆر لەبەرکردنی فەرموودە)[1].

* سوفیانی سەوریو محمدی کوڕی نەزری حارسی (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: (ان أول العلم الصمت، ثم الاستماع له، ثم العمل به، ثم النشر)[2]

واتە: سەرەتای زانست بێ دەنگیە، پاشان گوێگرتن بۆی، پاشان کردەوە کردنە پێی، پاشان گەیاندنو بڵاوکردنەوەی.

**یانزەهەم:**

لەم فەرموودەیە ئەوەمان دەست دەکەوێت کە دەبێت بچوك خزمەتی کەورە بکات.

**دوانزەهەم:**

لەم فەرموودەیەوە ئەوەمان دەست دەکەوێت کە دوعاو نزا بکەین بۆ منداڵەکانمان تا تاکێکی بەسودو چاکەخواز دەرچن..

**سیازدەهەم:**

لە وتەکەی (ابن عباس)دا (خوای لێ ڕازی بێت) کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوشاردمی بە سنگیەوەو پێی فەرمووم: ((خوایە حیکمەتو ژیربێژی فێربکە)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە لە بابی سۆزو بەزەیەوە منداڵ بگوشرێت بە سنگەوە.

١ رواه الخطيب في (الجامع) (١١).

٢ رواه أبو نعيم في (الحلية) (٦/٣٦٢) (٨/٢١٦).

**چواردەهەم:**

لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و كاری هاوەڵاندا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ئافرەتانیش وەك پیاوان مافی ئەوەیان هەیە فێری پەروەردەو زانست بكرێن:

* شیفاءی كچی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: من لەلای (حفصە) بووم (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەژوورەوەو پێی فەرمووم: ((الا تعلّمين هذه رقية النملة كما علمتيها الكتابة))[1]

واتە: ((ئەم ژنە فێری دوعای نەخۆشی (مێرولە) ناكەیت هەروەك چۆن فێری نووسینت كردووە)و نەخۆشی مێرولە لەوەوە هاتووە كە ئازارەكەی دەڵێی مێرولە گازت لێ دەگرێتو ئاو و كێمە لە هەردوولای مرۆڤەوە دەردەچێت.

* عائیشەی كچی طلحة دەڵێ: من لەخزمەتی عائیشەدا بووم (خوای لێ ڕازی بێت)و زانایان لە هەموو لایەكەوە دەهاتنە خزمەتیو لەبەرئەوەی من زۆر نزیك بووم لێیەوە ئەو زانایانە دەهاتنە لای منو گەنجەكانیش ڕێزی منیان زۆر دەگرتو نامەو پرسیارو مەسەلەی شەرعیان بۆ دەنووسیمو لەگەڵیشیدا دیاریان دەنارد، منیش بە عائیشەم دەووت: پورێ گیان، ئەمە نووسینی فلان كەسەو دیاریەكیشی لەگەڵدایە، ئەوەیش دەیفەرموو: كچی شیرینم، وەڵامی هەموو نامەكان بدەرەوەو لەسەر دیاریەكانیشیان پاداشتیان بدەرەوەو ئەگەر هیچت پێ نەبوو، من ئاگاداركە با شتێكت پێ بدەم بۆیان، دەڵێ: شتیشی پێدەدام.[2]

* * *

---

١ رواه أحمد (٦/٣٧٢) وأبوداود (٣٨٨٧) وهو حديث صحيح.

٢ رواه البخاري في (الادب المفرد) (١١١٨).

## فەرموودەی شەشەم

## دەربارەی میزی منداڵ

عن أُم قيس بنت محصن (رضي الله عنها): انها أتت بابن لها صغير، لَم ياكل الطعام الى رسول الله (ﷺ)، فاجلسه رسول الله (ﷺ)في حجره، فبال على ثوبه، فدعاه بماءٍ، فنضحه ولم يغسله).

### دەرهێنانی فەرموودەکە :

ئیمام بخاری گێڕاویەتیەوە لە (کتاب الطهارة) (باسی میزی منداڵ)داو مسلم (٥٩١)و (النسائی) (٣٠٢) لە باسی (میزی منداڵ کە نەکەوتۆتە خواردن)و (أبوداود) لە (٣٧٤) لە باسی میزی منداڵ بەری جلو بەرگ بکەوێت، (ابن ماجة) (٥٢٤)و (ابن خزيمة) (٢٨٥).

### ئەو ئەحکامو ئادابانەی لەو فەرموودە وەردەگیرێت:

**یەکەم:**

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە میزی منداڵ ئەگەر بەر جلو بەرگی کەسێك کەوت ئەگەر کوڕبوو ئاوی لێ دەپرژێنرێت

**دووەم:**

لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە جیاوازی هەیە لەنێوان میزی منداڵی کوڕو منداڵێ کچدا لە سەردەمی شیر خواردنیدا:-

* (ابی السمح) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: من خزمەتکاریی پێغەمبەری خوام دەکرد (حەسەن یان حسین)یان (خوا لێیان ڕازی بێت) هێنا بۆلای پێغەمبەرو گرتی بە باوەشو ئەویش میزی کرد بە خۆیداو منیش ویستم بە ئاو جێگاکەی بشۆم فەرمووی: ((يغسل من بول الجاريه ويرش من بول الغلام))[1].

---

[1] رواه أبوداود (٣٧٦) وابن ماجة (٥٢٦) وابن خزيمة (٢٨٣) و بخاری دەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنە.

واتە: جلو بەرگ ئەگەر كچی شیرەخۆرە میزی پێدابكات دەشورێت، بەڵام ئەگەر كوڕ میزی پێداكرد تەنها ئاوی لێ دەپژێنرێت.

سێیەم:

لە سوننەتدا هاتووە كە نەشۆردنی جلو بەرگ كاتێك كوڕ میزی پێدا بكات بە دوو مەرجە:

١- دەبێت منداڵەكە كوڕبێت.

٢- دەبێت نەكەوتبێتە خواردنو تەنها شیرەخۆرە بێت.

* عەلی كوڕی ئەبوطالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: میزی كچ بەری جلو بەرگ كەوت دەشورێت بەڵام میزی كوڕ ئەگەر نەكەوتبووە خواردن ئاوی لێ دەپژێنرێت.[1]

* قەتادەیش دەڵێت: ئەمە ئەگەر نەكەوتبوونە خواردن بەڵام ئەگەر كەوتبوونە خواردن دەبێت لە هەردووكیان بشۆرێت.[2]

* ئیسحاق كوڕی راهەوی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بەردەوام سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)وابووە كە میزی كوڕ ئاوی لێ پژاوەو میزی كچ شۆراوە ئەمە ئەگەر نەكەوتبنە خواردن.

پاشان دەڵێ: هەموو زانایانی هاوەڵانو دوای ئەوانیش لەسەر ئەمە كۆكن، لە پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانو شوێن كەوتوانی دوای ئەوانیش لە كەس نەبیستراوە كە بە یەك چاو یان بە یەك حوكم سەیری میزی كۆرپەلەی كوڕو كۆرپەلەی كچیان كردبێت.[3]

---

١ رواه ابوداود (٣٧٧)، اسناد صحيح.

٢ ابوداود (٣٧٨)، والترمذي (٦١٠)، وابن خزيمة (٢٨٤).

٣ تحفة المودود باحكام المولود (ابن القيم) (٣٦٠).

چوارەم:

دەربارەی هەندێك لە هۆیەکانی جیاوازی کردن لەنێوان میزی کوڕو کچدا:

* (ابو یمان المصری) دەڵێ: دەربارەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((یرش من بول الغلام ویغسل من بول الجاریه)) پرسیارم لە ئیمام شافعی کرد وتم خۆ هەردوو میزەکە یەك شتن؟

لە وەڵامدا فەرمووی: چونکە میزی کوڕ لە ئاوو خاك دروستبووە، بەڵام میزی کچ لە خوێنو گۆشت دروست بووەو پاشان پێی وتم: تێگەیشتی، وەرت گرت؟ وتم نەء، وتی: کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، لە خۆڵو ئاو دروستی کرد بەڵام دوایی حەوای لە پەراسویەکی کورتی ئادەم دروستی کرد، میزی کوڕ لەو خۆڵو ئاوەو میزی کچ لە خوێنو گۆشت، پاشان وتی پێم: خۆ ئێستا تێگەیشتی؟ وتم بەڵێ، وتی: خوا سودبەخشی بکات بۆت)[١]

* هۆیەکی تریش لەبەرئەوەیە کە کوڕ میزەکەی بەملاولادا هەڵدەداتو زۆر ناڕەحەتە شۆردنی، بەڵام کچ میزەکەی دەکاتە یەك جێگاو شۆردنی ئاستەمو قورس نیە.

* میزی کچ بۆنی ناخۆشترە لە میزی کوڕ چونکە گەرمای کوڕ بەهێزترەو کاریگەری زۆرە لەسەر کەمکردنەوەی بۆنەکەیو سوك کردنی.

ئەگەر ئەم جیاوازیانە جێگیر بن ئەوە شتێکی باشو سروشتیە، ئەگەرنا دەبێت پشت بەوە ببەستین سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ)و ئەو وای کردووە.[٢]

---

١ رواه ابن ماجة في (السنن) (٥٢٥).

٢ ذكر الفرق (٣،٢) تحفة المودود لا٣٦٠.

**پێنجەم:**

چۆنیەتی پاککردنەوەی جلوبەرگ کاتێك کوڕ میزی پێدا دەکات:

* (البغوی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هەر بەوەندە دەبێت کە ئاو لێ پژانە کە بەجۆرێك بێت بە دەست بیپژێنێتو پرژی ئاوەکە بگاتە هەمو جێگا تەڕەکانو ئیتر دەست پێداهێنانو سوینی ناوێت)[١]

**شەشەم:**

دەبێت ئەندازەی ئەو ئاوەی لێی دەپژێنێت چەندبێت؟

* عبداللەی کوڕی عباس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەربارەی میزی کوڕ دەفەرموێت: بە ئەندازەی میزە کە ئاوی لێ دەپژێنرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو چەشنەی کرد کاتێ: حوسەینی کوڕی عەلی میزی کرد بە باوەشیدا.[٢]

**حەوتەم:**

* میزی کوڕ وەك میزی کچ پیسەو نوێژی نیە، ئیتر با شیرەخۆرە بن یان نان خۆر.

* حەسەنی بەسری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: میز هەمووی وەك یەك وان.[٣]

* (البغوی)یش دەڵێت: میزی ئەو کوڕەی کە شیرەخۆرەیەو نەکەوتۆتە خواردن هەروەك هەموو میزێکی تر پیسە، بەس ئەوەیە بە ئاو لێپژان خاوێن دەبێتەوە.[٤]

---

١ (شرح السنة) (٨٥/٢).

٢ رواه عبدالرزاق (١٤٩).

٣ رواه ابوداود في سننه (٣٧٦).

٤ شرح السنة (٨٥/٢).

**هەشتەم:**

كەی ئەو منداڵە بە نانو چێشتخۆر دادەنرێتو ئیتر جێ میزەكەی دەشۆرێت وەك جێ میزی كچ؟

* احمدی كوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) منداڵ كاتێ خواردنی خواردو خۆی داوای دەكردو حەزی لێ دەكردو هەڵپەی بۆ دەكرد، نەك هەر خواردنی خوارد چونكە منداڵ وادەبێ هەر لە دایك دەبێت كەوچكی هەنگوینی دەكەن بە دەمدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پەنجە خورمای كردووە بە دەمی كۆرپەدا، بەڵام كاتێك دەبێت كە خواردن بخواتو داوایشی بكات.[1]

* (ابن قدامە)یش (رەحمەتی خوای لێ بێت): هیچ كاتێك ئاودان یان خواردن پێدان نابێتە هۆی ئەوەی دەبێ جێگا تەڕەكە بشورێ، ئەو خواردنە بە نان خواردن دادەنرێت كە منداڵەكە حەزی لێ بكاتو هەڵپەی بۆ بكاتو ئەوە پێویستە بشورێت (خوایش باشتری لێ دەزانێت).[2]

**نۆیەم:**

دوو شتی گرنگ دەربارەی میزی منداڵ:

١- پاككردنەوەو شۆرینی جێگای لەنوێژچوو دەستنوێژ ناشكێنێ بەهیچ جۆرێك.

٢- كەسێك دەستی بەری دوو عەورەتەكەی منداڵ بكەوێت ئایا دەستنوێژەكەی دەمێنێت یان دەشكێت؟:

* زانایان جیاوازیان هەیە تیایدا زۆربەیان دەڵێن بەڵێ دەستنوێژەكە دەشكێت لەوانە عطا، شافیعی، ابوثور، أحمد، اسحاق (رەحمەتی خوا لە هەموویان بێت).

---

١ المغني (٤٩٧)

٢ المغني هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

* بەڵام کۆمەڵێکی تریش کە کەمترن لە کۆمەڵی یەکەم دەڵێن دەستنوێژ ناشکێنێت وەك زوهەری‌و ئەوزاعی‌و مالیك (رەحمەتی خوایان لێ بێت) کە بەڵگەی بەهێزیان پێ نیە، بەڵام کۆمەڵی یەکەم دەڵێن دەست بەرکەوتنی عەورەت بەبێ جل یان دەستکێش دەستنوێژ ناهێڵێت‌و بەڵگەشیان فەرمودەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((من مسَّ فرجه فليتوضأ))[1] واتە: ئەوەی دەستی دا لە عەورەتی خۆی با دەستنوێژ بگرێتەوە.

**دەیەم:**

ئەم فەرموودەیەش ئەوەی لێ وەردەگرین کە دروستەو شتێکی سوننەتە منداڵ بخەینە باوەشمان. تەنانەت بخاری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە (صحیح)ەکەیدا باسێکی تایبەت کردووە بە (منداڵ بە باوەشەوەگرتن‌و لەکۆش گرتنی).

مەسەلەیەکی تایبەت بەم فەرموودەیە:

ئەوەی پێشوو تایبەتە بە منداڵی کوڕەوە، بەڵام ئەی بۆ کچیش هەر وایە؟:

* (ئەبو حازم) لە سەهلی کوڕی ساعی یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە جارێکیان کچێکی بچکۆلەیان ڕازانبوویەوەو هێنایان بۆ لای‌و ئەویش داوای کرد بۆی بێنن‌و سەیرێکی کردو گرتی بە باوەشی‌و دەستی هێنا بەسەریداو نزای خێرو بەرەکەتی بۆ کرد.[2]

* بەڵام ئیمام احمد (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە یەك حاڵەتدا پێی باش نیە (ئەویش ئەگەر بە شەهوەتەوە بیخاتەباوەشیەوە)و ئەگەر لە ئەو مەسەلەی تێدا نەبێت شتێکی باشەو هیچی تێدانیە.[3]

* * *

١ رواه مالك في الموطأ (٤٢/١).

٢ رواه ابن أبي شيبة (٤١٠/٤) واسناده حسن.

٣ المغني (٥٠١/٩-٥٠٢).

# فەرموودەی حەوتەم

## خەتەنەكردنی منداڵان

عن ابي هريرة (ﷺ) قال: قال النبي (ﷺ) ((الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالاسْتِحْدَادُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ )).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

بوخاری لە (٦٢٩٧) لە باسی خەتەنە لە گەورەییداو (٥٨٨٩) لە باسی كورتكردنەوەی سمێڵداو (٥٨٩١) لە باسی نینۆك كردن‌و مسلم (٥١٨)و أبو داود (٤١٩٨) الترمذی (٢٧٥٦)و ابن ماجه (٢٩٢) لەباسی (الفطرة)دا.

### ئەو ئەحكام‌و ئادابانەی لە فەرموودەكە وەردەگیرێت:

**یەكەم:** مانای خەتەنەكردنی چیە؟ (ماناكەی لە پیاودا ئەو هەڵقەیەیە كە لەسەرەتای زەكەریدایەو زیاتر لە (٣٠٠) حوكمی لەسەر هاتووە. بەڵام لە ئافرەتدا بەرزاییەكە وەك پاپوكی كەڵەشێر وایەو ئەو بەشە بەرزە دەبڕدرێت.[1]

**دووەم:**

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە خەتەنەكردن دروستەو سوننەتی گشتی پێغەمبەرانە:

* ابن عبدالبر دەڵێ: هەموو زانایان لەسەر ئەوە كۆكن كە (إبراهیم پێغەمبەر) (سەلامی خوای لەسەر بێت) یەكەمین كەس بووە كە خەتەنەكردنی داهێنا، هەموویان لەسەر ئەوەن كە لە سوننەتە موئەكەدەكانی پێغەمبەرانەو لە فیطرەو سروشتی ئیسلامەو بۆ پیاوان نیە وازی لێ بهێنن.[2]

---

١ تحفة المودود– ابن القیم لا (٢٥٦–٢٥٨) بە كورتی.

٢ التمهید (٥٩/٢١).

سێیەم:

خەتەنەکردن واجب نیە بۆ ئافرەتان بەڵام لە سوننەتی (صحیح)دا هاتووە:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((اذا التقی الختان وجب الغسل))[١] واتە: هەر کاتێك دوو عەورەتەکە، دوو خەتەنەکراوەکە بەریەك کەوتن خۆشوردن پێویست دەبێت.

* ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە بۆ ئافرەتانیش سوننەتە خەتەنەکردن.[٢]

* (أم عطیة الانصاریه) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئافرەتێك لە شاری مەدینە خەتەنەی کچانی دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((لاتنهکی، فإن ذلك احظی للمرأة وأحب الی البعل))[٣] واتە: زۆری لێ مەبڕە لەم کارەتدا چونکە بۆ ئافرەت واباشترەو پیاویش وای پێ خۆشترە.

* ئەوەشی بەڵگەیە بۆ ئەم مەسەلەیە کردەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)و سەلەفی صالحی پاش ئەوانیش:

* أم علقمە دەڵێ: برازاکانی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) خەتەنەکرانو بە عائیشەیان وت: ئایا یاریو شتیان بۆ نەهێنین تا بێ ئاگایان بکەین لەو کاتەدا؟ فەرمووی: بەڵێ.[٤]

---

١ رواه مسلم (٧١١).
٢ المغني (١/١١٦).
٣ أبوداود (٥٢٧١).
٤ دواتر سەرچاوەکەی دەدەین.

* عبداللەی كوڕی عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: خەتەنەكردن بۆ پیاوان سوننەتەو بۆ ئافرەتان شتێكی باشە.[١]

* یحیای كوڕی سعید القطان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: خەتەنەكردنی ئافرەتان سوننەتێكەو موسڵمانان وازیان لێ نەهێناوە.[٢]

* مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ((الفطرة، ختان الرجل والنساء))[٣]

چوارەم:

حیكمەتەكانی خەتەنەكردن:

* لە (ابن تیمیە)یان پرسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئافرەت ئایا خەتەنە بكرێت باشە یان نا؟

لە وەڵامدا فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، بەڵێ خەتەنەبكاتو خەتەنەكردنیشی ئەو بەرزاییە لادەبات كە وەك پاپۆكی كەلەشێر وایە، پێغەمبەر (ﷺ) بە ئافرەتە خەتەنەكەرەكەی فەرموو: ((أشمي ولاتنهكي، فانه ابهى للوجه وأحظى لها عند الزوج)) واتە: زۆری لێ لامەبە چونكە ڕوو بەجوانی دەهێڵێتەوەو پیاویش زیاتر ڕووی دەداتێ، حیكمەتیش لە خەتەنەكردنی پیاوان ئەوەیە كە ئەو بازنە پێستەی دەوری ملی زەكەر پیسایی تێدا دەوەستێتەوە ئەگەر لانەبرێت.

بەڵام مەبەست لە خەتەنەكردنی ئافرەتان: كەمكردنەوەی شەهوەتو ئارەزووكردنی پیاوەتی، چونكە ئەگەر ئەو بەرزاییەی بمێنێ زیاتر شەهوەتی دەجوڵێ، هەر بۆیە كاتێك یەكێك جنێو بە یەكێكی تر دەدات دەڵێ: ئەی دایك قەلفاء واتە (دایكت سوتاوە بۆ پیاو)و زۆر حەزی لێ دەكات.

---

١ روا البيهقي –السنن الكبرى (٨/٨٢٤).

٢ رواه عبدالملك بن حبيب في (اداب النساء) (١٣٧).

٣ التمهيد (٢١) (٦).

بۆیە دەبینی ئافرەتانی فەرەنساو تەتەرەكان زۆرتر حەز بە پیاوانو بەدڕەوشتی دەكەن كە لە ئافرەتی موسڵماندا بوونی نیە، بەڵام ئەگەر زۆری لێ ببڕێت ئەوە حەزی شەهوەتی دادەبەزێتو لاواز دەبێتو حەزو ئارەزووی پیاو نامێنێتەدیو بەلام ئەگەر كەمێكی لێ قرتا حیكمەتەكەی تێدا دێتەدی (خوایش باشتری لێ دەزانێت)[1]

* (ابن القیم)یش (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەوەندەی لە خەتەنەكردنی پاكو خاوێنی هەیەو لە جوانكردنی دەمو چاو و كەمكردنەوەی ئارەزووكردنی جنسیدا هەیە بەڵام بەشێوەیەكی میانەڕەوی، چونكە ئەگەر لانەبرێت ئەوە مرۆڤ وەك ئاژەڵانی لێ دێتو حەزی جنسی زاڵ دەبێت بەسەر دڵو دەرونو گیانیداو ئەگەر زۆری لێ لابرێت حەزو ئارەزووی جنسی دەتوێتەوەو وەك بێ گیانەكان دڵی بۆ ئەو كارە لێ نادات، هەر بۆیە (قەلفاء) واتە خەتەنەنەكراوان چ لە پیاوان یان ژنان لەو كارە تێر ناخۆنو هەمیشە هەڵپەیان دێت بۆی.[2]

منیش دەڵێم: بەردەوام لێكۆڵینەوەی زانستیەكانی سەردەم سودو كەڵكەكانی ئەم یاسایەی پەروەردگار ئاشكرا دەكاتو هەندێك لەو حیكمەتانە:

١- خەتەنەكردن بۆڕیەكانی میز لە سوتانەوە (التهاب) دەپارێزێت یان لە تێكەڵبوونیان.

٢- پیاو لە شێرپەنجەی زەكەر دەپارێزێت.

٣- مرۆڤ دەپارێزێت لە نەخۆشیە جنسیەكان.

٤- كەمترین ڕێژەی ئێشو ئازارو نەخۆشی هەیە لەو منداڵانەی خەتەنە كراون.

٥- بەڵگە زانستیەكانی سەردەم ئەوە ئاشكرا دەكەن كە خەتەنەكراوان بەدوور دەبن لە نەخۆشی نەمانی بەرگری سروشتی واتە ئایدز.

---

١ مجموع الفتاوی (١١٤/٢١).
٢ تحفة المودود (٣٠٩-٣١٥).

٦-ئەو بیردۆزە شکستی هێنا کە دەڵێ پاکو خاوێنی کۆئەندامەکانی زاوزێ لە هەردوو ڕەگەزەکەدا هۆکارن بۆ ڕوونەدانی ئەم نەخۆشیانە.

وە لە سەرسامترین ئەو ئەنجامانەی کە لێکۆڵینەوەی سەردەم لەسەر ئەو کەسانە کردویانە کە موسڵمان نینو خەتەنە نەکراون، بە تایبەت ئەو تاقیکردنەوەیەی لەسەر شێرپەنجەی زەکەر کراوە، ئەوەش لە ساڵی ١٩٣٢ تا ساڵی ١٩٩٠ هەزارو شەش سەد حاڵەت تووشبوو هەبووەو یەك کەس لەوانە خەتەنەکراو نەبووە لەکاتی منداڵیدا.[١]

پێنجەم:

منداڵ کەی خەتەنە بکرێت؟

زانایان لە دیاریکردنی ڕۆژی خەتەنەکردنی منداڵدا جیاوازیان هەیە:

یەکەم/ دەڵێن لە ڕۆژی حەوتەمدا سوننەتە بەم بەڵگانە:

* جابری کوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی حەسەنو حوسەیندا عەقیقەی بۆ کردن.[٢]

* أحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پرسیاریان کرد لە وهبی کوڕی منبه دەربارەی خەتەنەکردن لە وەڵامدا فەرمووی: لە ڕۆژی حەوتەمدا سوننەتە، چونکە ئەوە ئازاری کەمترە بۆ منداڵو منداڵ لەو کاتەدا لەشی شێوە بەنجکراوێکەو هەست بە ئازار ناکاتو ئەگەر لەو حەوتەدا نەکرا ئەوە ئیتر وازی لێ بهێنرێت تا لەشی خۆی دەگرێت.

* وە أحمد دەفەرموێت: خەتەنەکردن لە ڕۆژی حەوتەمدا ئاساییەو هیچی تێدانیە.

* ئاگاداریەك: حەسەنی بەسریو مالکی کوڕی ئەنەس (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) خەتەنەکردنی منداڵیان پێ ناخۆش بووە لە ڕۆژی حەوتەمدا چونکە لاسایی کردنەوەی

١ أحكام الادوية في الشريعة الاسلامية لا (١١٢).

٢ البيهقي في (الكبرى) (٨/٣٢٤) وابن ابي الدنيا في (العيال) (٥٠) و (٥٨٢).

جولەكەی تێدایەو ئێمەش فەرمانمان پێكراوە كە سەرپێچیان بكەین، ئەحمدیش لە ریوایەتێكدا لەگەڵیاندایە بەلام پاشتر ئەوە جێگیربووە كە لەو رایە گەڕاوەتەوە. سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) خەتەنەكردنی لە رۆژی حەوتەمدا پێ مەكروه بووەو فەرموویەتی: زۆر ترسناكە لەسەر منداڵەكە.[١]

**رای دووەم/** دەڵێن خەتەنەكردن دوادەخرێت تا منداڵەكە كەمێك گەورە دەبێتو لەشی بەهێز دەبێت:

* سەعیدی كوڕی جوبەیر (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پرسیار كرا لە ابن عباس (خوا لێی رازی بێت) كە تەمەنت چەندبووە لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دنیا دەرچوو؟ لە وەلامدا فەرمووی: لەو كاتەدا من خەتەنەكرابووم.

دەڵێ: هاوەڵان كوڕەكانیان خەتەنە نەدەكرد تا گەورە دەبوونو هەستیان پەیدا دەكرد.[٢]

هەروەها (لیث)ی كوڕی سەعدو مالكی كوڕی ئەنەسو زەیدی كوڕی ئەسلەم (رەحمەتی خوایان لێ بێت) ئەم رایەیان هەبووە.

**رای سێیەم/** دەڵێت: كاتێكی دیاریكراو نیە بۆ خەتەنەكردنو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی داوە بە خەتەنەكردن، بەلام دیاری نەكردنی رۆژێكی تایبەتی لێوە سابت نەبووە:

* سوفیانی كوڕی عویەینە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لێی پرسیم: ئایا هیچ فەرموودەیەكت لەلایە كاتی خەتەنەكردن دیاری بكات؟ لە وەلامدا وتم: نەء، لێم پرسی ئەی لەلای تۆ شتێكی لەو جۆرە هەیە؟ فەرمووی: نەء.[٣]

---

١ شرح السنة للبغوي (١١١/١٢) والتمهيد لابن عبدالبر (٦١/٢١) وتحفة المودود (٣٠٥-٣٠٧).

٢ رواه البخاري (٦٢٩٩).

٣ التمهيد (٦١/٢١).

* لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان پرسی: ئایا لە چ تەمەنێکدا منداڵ خەتەنەدەکرێت؟ فەرمووی: پێ نازانم لەو بارەیەوە هیچم بیستبێت.

* (ابن منذر)یش (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەم باسەدا هیچ فەرموودەیەك نیە بە سابتی ڕۆژێکی قەدەغەکردبێت، کاتێکیش بۆ خەتەنەکردن سابت نەبووە کە پشتی پێ ببەسترێت، ئەسلیش لە شتەکاندا دروستیەتیو ڕێگەپێدان بەڵگەی پێویستەو ئەوانەی لە حەوتەم ڕۆژدا خەتەنەکردنیان پێ باش نیە بێ بەڵگەن.[1]

## کەڵکێك:

* (ابن عبدالبر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لە کۆمەڵێك لە زانایانەوە بە تەواتوری هاتووە کە وتوویانە: ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە (١٣)ساڵیدا خەتەنەکردو (اسحاق)یشی لە (٧) ساڵیدا خەتەنەکرد.

* ابن تیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لەوەودوا کوڕانی ئیسماعیل لەسەر شێوازی خەتەنەکردنەکەی باوکیان کاریان کردو کوڕانی ئیسحاقیش لەسەر شێوازی باوکیان واتە لە حەوت ساڵیدا.[2]

شەشەم:

بەڵگەی دروستی دروستکردنی خواردن (ولیمە) لە ڕۆژی خەتەنەکردندا:

عەرەب کۆمەڵێك ناویان لەو دەعوەتە ناوە وەك (العذیر، ، العذیرة، الاعذار)و خەلیلی کوڕی أحمد (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (العِذار) خواردنێکە دروست دەکرێت لە ڕۆژی خەتەنەکردنداو خەڵکی بۆ بانگ دەکرێت.[3]

---

١ سەیری (تحفە المودود) بکە لاپەڕە (٣٠٧).

٢ تحفة المودود لا (٣٠٨).

٣ کتاب العین لا (٦١٤).

دروستكردنی ئەم خواردنە لەو بۆنە دروستانەیە كە ئیسلام پێی جوانەو هاوەڵانیش كاریان لەسەر كردووەو خەڵكیان بۆ دەعوەت كردووەو ئەوانیش چوون بەدەم دەعوەتەكەیانەوە:

* القاسم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) (١٠٠) درهەمی بۆ ناردمو پێی وتم: خواردنی پێ دروست بكە بە بۆنەی خەتەنەكردنی كوڕەكەتەوە.[١]

* سالم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ابن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) منو نەعیمی خەتەنەكردو، بەرانێكیشی بۆ سەربڕین، ئێمەش دواتر لەناو منداڵاندا خۆمان بەوە هەڵدەنا كە لە بۆنەی خەتەنەكردنماندا بەرانێكمان بۆ سەربڕاوە.[٢]

* البغوی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: سوننەتە مرۆڤ كاتێك لەلایەن خواوە بەخششێكی دەڕژێت بەسەردا، سوپاسێكی بەدوادا ئەنجام بدات وەك دەعوەتكردن بۆ بۆنەی ناونانو خەتەنەكردنو هاتنەوە خزمێكت لە سەفەرێكی دوور، هەموو ئەمانە سوننەتنو وەك سوپاس گوزارین لەبەرامبەر ئەو بەخشـشانەی پەروەردگارداو سوننەتترینیان وەلیمەی شاییو خەتەنەكردنو كەوتنە قسەیە.

هەروەها سەلەفیش (رەحمەتی خوایان لێ بێت) گرنگیان بەم بۆنەیە داوەو وەڵامی دەعوەتیان بۆ داوەتەوە:

* مەكحول لە نافعی پرسی (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئایا ابن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) دەچوو بۆ بەشداری خواردنی بۆنەی خەتەنەكردن؟ فەرمووی: بەڵێ.[٣]

١ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٥٨٦).

٢ البخاري في الادب المفرد (١٢٤٦) لەباسی دەعوەت لە بۆنەی خەتەنكردندا، رواه ابن ابي شيبه (٣١٤/٤-٣١٥).

٣ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٥٨٥).

* هەروەها احمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بانگ کراوە بۆ خواردنی خەتەنەکردنو ئەویش چووەو لەوێ خواردوویەتی.[١]

شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: وەڵامدانەوەی دەعوەتی شایی واجبە، بەڵام ڕێگە نادەم بەوەی بەشداری نەکرێت لە بۆنەکانی دەستکەوتنی خانوو و زەویو منداڵبوونو خەتەنەکردنو ڕووداوی خۆشو ئەمانە وا نازانم جگە لە (ولیمە العرس) لەسەر وازلێهێنانو نەچوون بۆ دەعوەتەکانیان مرۆڤ بە گوناهبارو سەرپێچیکار لەقەلەم دەدرێت.[٢]

* ئەوەی لە (عثمان)ی کوڕی (ابی العاص)وە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە بانگکرا بۆ بۆنەی خەتەنەکردنی کچێكو ئەویش نەڕۆیشت، وە اسنادەکەی لاوازەو هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەگەر ڕاستیش بێت هۆکارەکەی ئەوەبووە کە سوننەت وایە خەتەنەکردنی کچ بشارێتەوە.

* بۆیە لەم بارەیەوە أبوزید القیروانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لە خەتەنەکردنی کچدا گرنگ دەعوەتکردنی خەڵکی نیە بەڵکو گرنگ ئەوەیە بشارێتەوەو باسی نەکرێت.[٣]

حەوتەم:

دروستە لەکاتی خەتەنەکردندا یاریو گەمە بۆ منداڵەکە سازبکرێت تا ئازاری لەبیر بچێتەوە:

هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) هەر کاتێك منداڵەکانیان خەتەنە بکردایە، بانگی گەمەو مەزاقیان دەکرد تا بەو هۆیەوە منداڵەکە ئازاری خەتەنەکردنەکەی بیربچێتەوەو هەروەها خۆشیو سرور دەربڕینیش بێت بەبۆنەی خەتەنەکردنەکەوە:

---

١ المغني (١٠/٢٠٨).

٢ الاستذكار (٥/٥٣١).

٣ النوادر والزيادات (٤/٣٣٨).

* ام علقمـه دەڵـێ: برازاکـانی عائیـشه (خـوا لێـی ڕازی بێـت) خەتەنـەکران، بـە عائیشەیان وت: ئایا گەمەو مەزاقو خۆشیان بۆ بـانگ نەکـەین تـا خەتەنەکـەیان لـەبیر بچێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ،

منیش جوابم نارد بۆ عەدیو ئەویش هات بۆ لایانو دەستی کرد بە گۆرانی وتنو سەرەلەقەی بوو کە قژە درێژەکەی دەلەقاندەوە، عائیشەیش (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئەو دیمەنەی بینی فەرمووی: بەسە با بڕواتە دەرەوە شەیتانە.[١]

* عەکریمـە لـە ابـن عباسـەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە کـە کوڕەکـانی خەتەنـەکردو منـی نـارد بـەدوای یاریزانێـکو هـاتو دەسـتی کـرد بـە یـاریکردن لـە بەردەمیانداو لە دواییدا چوار درهەمی پێدان یان سێ درهەم.[٢]

* البغوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: دەف لێـدان لـە شـاییو خەتەنەسـوراندا ڕێگەی پێدراوە.[٣]

* * *

---

١ رواه البخاري في الادب المفرد (١٢٤٧) واسناده صحيح.

٢ رواه ابن ابي شيبة (١٩٣/٤) وابن ابي الدنيا في العيال (٥٨٧).

٣ شرح السنة (٤٩/٩).

# فەرموودەی هەشتەم

## منداڵان و نوێژكردنیان

عن عبدالله بن عمرو (رضی الله عنه) قال: قال النبي (ﷺ) ((مُرُوا أَبْنَاءكُمْ بِالصَّلاَةِ لِسَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا لِعَشْرِ سِنِينَ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ))

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

(ابن أبی شیبه) لە (مصنف)ەكەیدا (١/٣٤٧) ڕیوایەتی كردووەو أحمد لە (مسند)دا (٢/١٨٠،١٨٧)و (أبو داود) لە (السنن)ەكەیدا (٤٩٥) لە باسی (كەی فەرمان بە منداڵ بدرێت بە نوێژكردن؟)و (الدار قطني) لە (السنن)ەكەیدا (١/٢٣٠)و (البغوی) لە (شرح السنة) لا(٥٠٥)دا.

وێنەیشی هەیە لە فەرموودەی سەبرەی كوڕی مەعبەدی جوهەنی (خوا لێی ڕازی بێت) كە دیسان (ابن أبی شیبه) (١/٣٤٧)و أحمد لە (مسند)دا (٢/٢٠١)و (أبو داود) لە (سنن)دا (٤٩٤)و (الترمذي) (٤٠٧)و (الدارمی) (٢/٨٩٧)و (ابن خزیمه) (١٠٠٢) و (الحاكم) (١/٢٠١). فەرموودەكە صحیحەو ترمذیو ابن خزیمەو حاكمو كەسانی تریش وتوویانە صحیحە.

### ئەو حوكمانەی پەیوەستن بەم فەرموودەیەوە:

**یەكەم:**

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە واجبە فەرمان بە منداڵ بدرێت كە نوێژ بكات كاتێك تەمەنی لەنێوان (٧) تا (١٠) ساڵاندابێت، پاشان فەرمانی داوە بە لێدانیان لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا تا بالق بوون ئەگەر ساردیو سڕیان لە كردنیدا دەنواند.

سەرپەرشتیاری منداڵ (چ باوكو دایكی یان مامۆستاكانی) بەرپرسیارنو لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرێت ئەگەر ئەم فەرمانەیان جێ بەجێ نەكردو

گەورەترین بنەمای ئیسلام (كە نوێژە) بە منداڵەكانیان نەكردوە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((كُلُكم رَاعٍ وكُلُكُم مَسؤول عَن رَعيته))[١]

* ئیمام شافعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لەسەر دایكو باوك واجبە ئەدەبی منداڵەكانیان بەجوانی دابدەن، فێری پاكو خاوێنیو دەستنوێژو نوێژیان بكەن، ئەگەر فامیشی پەیداكرد دەبێت لێی بدرێتو هەر كاتێك لەشی گران دەبوو یان كچەكە كەوتە سوڕی مانگانەوە یان پانزە ساڵی تەواوكرد، نوێژو ڕۆژووی لەسەر فەرز دەبێت).[٢]

دووەم:

فەرمان دان بە منداڵ بە نوێژكردن لە میانەی ڕاهێنانیەوەیەتی، ئەگەر بە منداڵی ڕاهات لەسەری بە گەورەیی نایفەوتێنێ، نەك لەبەرئەوەی كە فەرزە لەسەریان لەو ساڵانەدا واتە (٧ بۆ ١٤).

* عبداللەی كوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (بە نوێژ پێكردن منداڵەكانتان بپارێزنو لەسەر خێر ڕایان بهێنن، چونكە خێرو چاكە عادەت پێوەگرتنە)[٣]

* محمدی كوڕی نەسری مورووەزی (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر ئەم وتەیەی (ابن مەسعود) دەفەرموێت: بەم فەرمایشتەدا بۆمان دەردەكەوێت كە منداڵ پێویستە بە بچكۆلەیی نوێژیان پێ بكەیت تا ڕابێن بۆ كاتی گەورەیی، چونكە ئەگەر پێش ئەوەی فەرزبێت لەسەریان لەگەڵی ڕاهاتن، ئەوە زۆر ئاساییە كە لە كاتی گەورەبووندا لەگەڵی ڕادێنو پابەند دەبن پێوەی).[٤]

---

١ رواه بخاري (٨٩٣)، ومسلم (٤٧٥١).

٢ شرح السنة (٢/٤٠٧).

٣ رواه عبدالرزاق (٤٧٤٢)، و(ابن ابي شيبة) (١٦٤١٩).

٤ قيام الليل لا (٢٤٣).

* (ابـن المنـذر) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) جێگیربووە كە فەرموویەتی: ((رفع القلم على ثلاثـة: عـن الـصبي حتـى يحتلم)) واتـە: قەڵەمی گوناه نووسین لەسەر سێ كەس هەڵگیراوە یـەكێكیان منـداڵ تـا بـاڵق دەبێت، كەواتـە نوێـژی هـەینیو هـەموو نوێـژەكانی تـر واجـب نیـە لەسـەر منـداڵێك كـە بـاڵق نەبووبێت بە بەڵگەی قورئانو فەرموودەو كۆدەنگی زانایان)[1]

سێیەم:

لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە كە سەرپەرشتیار -دایكو بـاوكی- منـداڵ لەسەریانە لە منداڵـەكانیان بپرسـنەوەو دەربـارەی نوێـژەكانیان پرسـینەوەیان لەگـەڵ بكەن:

* (ابـن عبـاس) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: شـەوێكیان لـە مـاڵی پـوری مەیمونەم مامەوە، كە ئێـوارە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هاتـەوە بـە ماڵـەوەی فـەرموو: ((أصلّى الغلام)) واتە ئەم منداڵە نوێژەكەی كردووە؟ وتیان: بەڵێ.[2]

نووسەر دەڵێ: ئەمەش جێگای داخو ئەسـەفە كـە لـەم ڕۆژگـارەدا زۆری موسـڵمانان (مەگـەر ئەوانـەی خـوا ڕەحمـی پـێ كـردوون) كـە سەرپەرشـتیاری منداڵـەكانیان لـە كاروباری دنیایی وەك خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو شتی تر لێیان دەپرسنەوە..

دەبینی كابرا دوای ئەوەی چەندان كاتژمێر لە ماڵ دووركەوتۆتـەوە هـە كـە دێتـەوە دەبینـێ هـەموو منـداڵ'كـانی خـەوتوون ئـیتر ئـەو پرسـیارەی پێغەمبـەریان لێ ناكـات (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((ئایا نوێژەكانیان كردووە؟)) بەڵكو دەپرسێت: ئـەوە نانیـان خواردووە یـان چـەند پرسـیارێكی تـر كـە هـیچ پەیوەنـدیان بـە كاروبـاری ئیـسلامەتی

---

١ الاوسط (٤/١٥-١٦).

٢ رواه أبو داود (١٣٥٦).

منداڵەکانیانەوە نیە ! دەی سەیری ئەم دوو پرسیارە بکەو بزانە چ جیاوازییەکی گەورە بەدی دەکەیت لەنێوانیاندا، دەی خوا ڕەحم بکات بە سەرەنجامی ئەم ئوممەتە.

**چوارەم:**

هەر کەسێك فەرمان نەدات بە نوێژکردن لەناو ماڵەکەیداو نوێژ نەکات بە منداڵەکانی لەلای زۆرێك لە زانایان دەبێت سزا بدرێت بە سزای تەمێکاری کە پێی دەوترێت (تعزیر).

* (ابن تیمیە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (واجبە لەسەر هەر کەسێك کە خەڵکی بەقسەی دەکەن فەرمان بە ژێردەستەکانی بدات بە نوێژکردن تەنانەت ئەو منداڵانەیش کە هێشتا باڵق نەبوون، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: فەرمان بدەن بەسەر منداڵەکانتان لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە دەست بکەن بە نوێژو لە دە ساڵیەوە بەدواوە سزایان بدەن لەسەری و ئەگەر گەورەیش بوون کوڕان و کچان پێکەوە مەخەوێنن)).[1]

هەر کەسێك منداڵێکی خۆی یان هەتیوێك یان کوڕی کەسێکی تر، فەرمان دەرنەکات بەسەریاندا بە نوێژکردن ئەوە سزای گەورەکان دەدرێت ئەگەر فەرمان بە بچوکەکان نەدەن بۆ نوێژو سزایەکی تەمێ ئامێزی توند دەدرێت چونکە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووە)[2]

**پێنجەم:**

هەر لە سووربوون و گرنگی دانی سەلەفی صالح (خوایان لێ ڕازی بێت) بە نوێژو خواپەرستی منداڵەکانیان ئەوەبوو هەر لە منداڵیەوە فێری الحمدللەو تحیات و هەموو زیکرەکانی تریان کردوون لە پێش حەوت ساڵەکەی تەمەنیشیانەوە:

---

١ مجموع الفتاوی (٢٢/٥٠–٥١).

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو

* نافع لە (عبداللەی کوڕی عمر)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (يُعلّم الصبي الصلاة اذا عرف يمينه من شماله)[1] واتە: دەبێت منداڵ فێری نوێژ بکرێت لەو دەمەی کە ڕاستو چەپی خۆی دەزانێت.

* هشام لە عوروەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە هەر کاتێك منداڵێکی فامی پەیدا دەکرد فێری نوێژی دەکرد.

* جوندوبی کوڕی ثابت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (پێشینەکانی ئێمە منداڵەکانی خۆیانیان فێری نوێژ دەکرد کاتێك بیانتوانیایە تا ژمارە (٢٠) بژمێرن).[2]

**شەشەم:**

دەبێت منداڵ هان بدرێت بۆ نوێژو حەزی تیا دروست بکرێت کە بەردەوام لە مزگەوتدا ئەنجامی بداتو ئافەرینو بەخششو دیاری پێ بدرێت تا زیاتر ڕابێت لەسەر نوێژ بە مەرجێك دیاریەکان شتی بەسودو شەرعی بن.

* عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (كنا نأخذ الصبيان من الكتاب فنقدمهم يصلون لنا شهر رمضان ونعمل لهم القلية والخشكنات)[3] واتە: ئێمە وەك ئافرەتان لە شەوانی ڕەمەزاندا یەکێك لە منداڵە قورئان خوێنەکانمان دەهێناو بەرنوێژیمان پێ دەکردو لە پاشان خواردنو –خەشکەنانمان– پێ دەدان) کە وەك کێك یان کولیچەی ئەمڕۆیە.

* زیاد دەڵێ: زوبێدی ئەیامی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بانگبێژی مزگەوتەکەی خۆیان بوو، بە منداڵانی گەڕەکی دەووت وەرن بۆ نوێژ دوایی گوێزتان دەدەمێ، ئەوانیش دەهاتنو نوێژیان دەکردو پاشان دەوریان لێ دەدا بۆ گوێز خواردن، ئێمەیش

---

١ رواه عبدالرزاق (١٥٣/٤).

٢ ابن أبي شيبه (٣٤٧/١–٣٤٨). والعيال لابن أبي الدنيا (٤٦٣/١).

٣ رواه ابن المنذر في الاوسط (١٩٣٦/١٥٠/٤)

پێمان دەووت: بۆ ئەم كارە دەكەیت؟ لە وەڵامدا دەیفەرموو: دە چیم كردووە تەنها ئەوە نەبێت بایی پێنج درهەم گوێزم بۆ كڕیونو بەو هۆیەوە لەسەر نوێژكردنو هاتوچۆی مزگەوت ڕایان دەهێنم)[1]

حەوتەم:

منداڵێك كە فامی پەیدانەكردووەو نازانێ ئاگای نوێژو دەستنوێژو تارات گرتن نیە، نابێت فەرمانی نوێژی بەسەردا بدرێتو نابێت لە ڕیزی نوێژگەراندا بوەستێنرێت لەكاتی نوێژدا..

ئەم كارەش باوكان بە غەڵەت تێگەیشتوون لێیو وادەزانن چاك دەكەن منداڵەكانیان دەهێنن بۆ مزگەوت كە هاوار هاوار دەكەنو بە بەردەمی نوێژگەراندا دێنو دەچن لەو هەڵانە:

١- لە ڕیزەكاندا دەیوەستێنێ ئەویش لە نیوەی نوێژەكەدا تاقەتی نامێنێو ڕادەكات بە بەردەم نوێژگەرەكاندا بەمو لادا چونكە منداڵ حەوسەڵەی وەستانی نیە.

* عبداللەی كوڕی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((من وصل صفاً وصله الله ومن قطع صفاً قطعه الله))[2] واتە: هەر كەسێك ڕیزێك بگەیەنێت بە یەك، خوایش ئەو دەگەیەنێتو هەر كەسیش ڕیزێك تێك بدات یان نێوانی تێبخات ئەوە خوایش ئەو تێك دەداتو نێوانی تێدەخات.

٢- منداڵ لەو تەمەنەدا زۆر عەجولو جموجۆڵكەرەو ئازاری نوێژگەران دەدات سەریان لێ تێك دەداتو خشوعیان ناهێڵێت.

---

١ رواه أبونعيم في الحلية (٥/٣١).

٢ رواه أحمد (٢/٩٧-٩٨)، وابن خزيمة ١٥٤٩ إسناده صحيح.

**هەشتەم:**

دەبێت منداڵ كە فەرمانی نوێژی بەسەردا دەدرێت، فێری چۆنیەتی كردنەكەشی بكرێت لەسەر شێوزای نوێژی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و دەبێت لەسەر نەكردنی یان فەوتاندنی لێپرسینەوەی لەگەڵ بكرێتو ئەگەر پێویستیشی كرد لێی بدرێت لەسەری.

چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و سەلەفی صالّح لەدوای ئەو زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی كە چۆنیەتی ئەحكامو ئادابەكانی نوێژیان فێربكەنو لەسەر نەكردنی تەمێیان بكەن.

هەموو زانایان لەسەر ئەوەن كە نابێت بهێڵرێت منداڵ بەبێ دەستنوێژ نوێژ بكات.[١]

* (أبوعالیە) لە (إبن عباس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێ: (إبن عباس) فێری چۆنیەتی ركوع بردنی دەكردین وەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشتر فێری كردبوون، بەجۆرێك ركوعی دەبرد بۆمان كە ئەگەر تكەیەك ئاوت لەسەر پشتی دابنایە نە بۆ پێشەوەو نەبۆ دواوە نەدەڕۆیشت)[٢]

* (إبن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (كان رسول الله (ﷺ) یعلمنا التشهد كما یعلمنا السورة من القران)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (تەحیات)ی فێردەكردین وەك چۆن سورەتی قورئانی فێردەكردین).

* (أبو مالك الاشعری) (خوا لێی ڕازی بێت) هۆزەكەی خۆی كۆكردەوەو پێی دەووتن: ئەی خزمانی ئەشعەری خۆتانو منداڵو خێزانەكانتان كۆببنەوە تا نوێژی پێغەمبەرتان فێربكەم وەك چۆن لە مەدینە نوێژی بۆ دەكردین، هەموو هۆزەكە كۆدەبوونەوەو لەبەر چاویان دەستنوێژێكی دەگرت زۆر بە تەواوەتی، تا خۆر كەوت

---

١ فتح الباري (ابن رجب) (٨/٣٠).

٢ رواه الطبراني في المعجم الكبير (١٢/١٥٩) (١٢٧٥٥).

٣ رواه مسلم (٨٣٣).

بەو دیواو سێبەری هاتەوە، هەستاو بانگێکی دا، خەڵکەکەی ڕیزکرد بۆ نوێژی کۆمەڵ بەجۆرێك پیاوان لە پێشەوەو منداڵان لەدوای ئەوانو ژنانیش لەدوای ئەوانەوە داناو پاشان قامەتی کرد خۆی چووە پێشەوەو بەرنوێژی بۆ کردن)[1]

* (عمران الضبي) دەڵێ: سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دای بەلای زیادی کوڕی کثیردا کە کۆمەڵێ منداڵی ڕیز دەکرد بۆ نوێژو دەیووت: (ڕێك ڕاوەستنو ڕیزبنو شانو پەنجە پێتان پێکەوە بنووسێنن، خۆت بەلای قاچی چەپتا بخە، لای ڕاست قیت بوەستێنە، دەستەکانتان بخەنە سەر ئەژنۆکانتانو سڵاو مەدەنەوە تا ئیمام سڵاوی دووەم دەداتەوە).

سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەیری دەکردنو پاشان فەرمووی: (پێم گەیشتووە کە ڕەوشتو هەڵسوکەوتی جوان، تووڕەبوونی پەروەردگار دادەمرکێنێتەوە)[2].

**نۆیەم:**

هەروەها ئەگەر منداڵ نوێژی دەفەوتاند یان بە ناتەواوی دەیکرد لەپاش فێرکردن یان بەچاوی سوك سەیری دەکرد، دەبێت تەمێ بکرێت چونکە سەلەفی صالح ئەدەبی منداڵەکانیان داداوەو لێیان دەدان ئەگەر وەك شێوازی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژیان نەکردایە:

* موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکیان عمری کوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) چاوی کەوت بە یەکێك لە کوڕەکانی نوێژی دەکردو سەری

---

١ رواه أحمد (٣٤٣/٥).

٢ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٣١٥).

بردبوویەوە بۆ پشتەوەو پەلکەکانی کردبوو بە هەناو خستبوویە تەوقی سەری! عمریش چوو بۆی وا ڕایکێشت کوڕە لە ترساندا لەهۆش خۆی چوو.[١]

* موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێت) دای بەلای کوڕێکیدا نوێژی دەکردو پەلکەکانی بۆ تەوقی سەری بەرز کردبوویەوە، زۆر ناڕەحەت بوو، داوای شفرەیەکی تیژی کردو بۆیان هێناو یەك پەلکەیانی بڕیو پاشان وتی: ئەگەر حەزت کرد خۆت ئەویشیان ببڕەو ئەگەرنا بیهێڵەرەوە.[٢]

* (إبن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((امرت أن اسجد على سبعة، ولا اكف شعراً ولا ثوباً)).[٣] واتە: فەرمانم پێ دراوە لەکاتی کڕنووشدا حەوت جێگام بکەوێتە سەر زەوی، نە قژمو نە جلەکانم کۆنەکەمەوە).

* قەیسی کوڕی عوباد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بەرەو شاری مەدینە کەوتمە ڕێ بەو هیوایەی چاوم بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت لەناویاندا کەسم ئەوەندەی ئوبەی کوڕی کعب خۆشنەویست، قامەت کراو، عمری کوڕی خطابو هەموو هاوەڵان هاتن بۆ نوێژو من لە ڕیزی یەکەمدا وەستام، پیاوێك هاتو سەیری هەموو خەڵکەکەی کردو تەنها منی نەناسیەوە شانی گرتمو بردمی بۆ ڕیزی دواترو خۆی چووە جێگاکەم، نەمزانی ئەو نوێژەم چۆن کرد، کاتێك لێبوویەوە ڕووی تێکردمو وتی: ئەی گەنج، پێت ناخۆش نەبێت کە وام کرد، لە نەزانینەوە نەمکرد بەڵکو پێغەمبەری خوا

---

١ رواه عبدالرزاق (٢٩٩٢).

٢ رواه عبدالرزاق (٢٩٩٥).

٣ رواه البخاري (٨١٦).

(ﷺ) پێی دەفەرمووین: ((كونوا في الصف الذي يليني)) منیش سەیری خەڵکەکەم کرد هەموویم ناسی جگە لە تۆ.[١]

* ئیمام ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەوەی کە ئوبەی کوڕی کەعب (خوای لێ ڕازی بێت) قەیسی کوڕی عوبادەی بردە دواوە ، هۆکەی ئەوەبوو کە قەیس منداڵ بوو.[٢]

منیش دەڵێم ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە منداڵ ئەگەر لە ڕیزی یەکەمدا بوو دروستە بخرێتەوە ڕیزی دووەم، هەموو سەلەفی صالح لەسەر ئەمە بوونو بڕوا ناکەم نەیارێکیان بووبێت لەم مەسەلەیەدا.

* (ابن صهيب) دەڵێ: )هەردوو زانا (زرٌ وأبو وائل) ئەگەر ئێمەیان لە ڕیزی یەکەمدا بدیایە دەیانکردینە دواوە بۆ ڕیزی دووەم لەبەرئەوەی منداڵ بوین).[٣]

* (محاربي) دەڵێ: هەر کاتێك سوفیانی سەوری منداڵێکی بدیایە لە ڕیزی یەکەمدا لێی دەپرسی ئایا باڵق بوویت؟ ئەگەر بیووتایە: نەخێر دەیووت: بڕۆ دواوە بۆ ڕیزی دووەم.[٤]

* محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئێمە منداڵ بووین ئەگەر لە نوێژدا پێبکەنینایە (مامۆستایانمان) نوێژەکانیان پێ دووبارە دەکردینەوە)[٥]

* عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئێمە منداڵ بووین لە مەدینە ئەگەر لە نوێژدا دەستمان بەرز بکردایەتەوە تەمێیان دەکردین.[٦]

---

١ رواه عبدالرزاق (٢٤٦٠)، وأحمد (١٤٠/٥)، وابن خزيمة (١٥٧٣)، وحديث صحيح.

٢ بدائع الفوائد (ابن قيم) (٨١/١٣).

٣ رواه ابن أبي شيبه في (المصنف) (٤١٣/١).

٤ رواه ابونعيم في الحلية (١٥/٧).

٥ رواه ابن ابي شيبه (٣٨٨/١).

٦ رواه البخاري في رفع اليدين (١٧).

* لە مروانی كوڕی عبدالعزیزەوە دەگێڕنەوە كە عمری كوڕی عبدالعزیزی كوڕی نارد بۆ مەدینە تا لەوێ ئەدەبو ڕەوشتی بەرز فێرببێت، بۆ ئەو مەبەستە دایەدەستی زانا (صاڵحی كوڕی كیسان) تا ئاگای لێ بێت، بەردەوام نوێژەكانی بە كۆمەڵ پێ دەكرد بەڵام جارێكیان لە نوێژدا دواكەوت، صاڵح لێی پرسی: بۆچی دواكەوتی؟ وتی: قژداهێنەرەكەم قژی دادەهێنامو صاڵح وتی: یانی وات لێ هاتووە قژ داهێنانەكەت خۆشەویستتر بوو تا نوێژەكەت؟! بۆیە ئەم هەواڵەی ناردەوە بۆ باوكیو باوكیشی پیاوێكی نارد بۆ مەدینەو ڕای سپارد كە قسەی لەگەڵ نەكات تا سەری سفر دەكات)[1]

* موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: گوێم لە هاوەڵێكی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) وا دەزانم یەكێك بوو لە بەشدارانی جەنگی بەدر، بە كوڕەكەی خۆی وت: فریای نوێژ كەوتیت لە گەڵماندا؟ وتی: بەڵێ، وتی: فریای (الله أكبر)ی ئیمام كەوتیت؟ وتی: نەخێر! باوكی پێی وت: ئەوەی لە دەستت چوو لە (١٠٠) حوشتر باشتر بوو كە هەر هەموویان چاوڕەش بوونایە.[2]

ئەمەش هەندێك بوو لە ڕەوشتو هەڵسوكەوتی سەلەفی صاڵحان لەگەڵ منداڵەكانیان كاتێك سارديان نواندبێت لە نوێژەكاندا.

دەیەم:

هۆیەكی سەرەكی فەوتاندنی نوێژ لەلایەن منداڵانەوەو نەزانینی شێوازی دروستی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كەسەی كە سەرمەشقی چاكو صاڵح بەدی ناكەن لە ماڵەكاندا كە هەدیو ڕێنماییەكانی پێغەمبەر (ﷺ) جێ بەجێ بكەن لە نوێژدا و ئەوان چاویان لێ بكەن بەڵكو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەریان لێ دەبینن.

---

١ رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق (١٣٦/٤٥).

٢ رواه عبدالرزاق (٢٠٢١).

* (فضیل)ی كوڕی (عیاض) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: مالیكی كوڕی دینار پیاوێكی بینی لە نوێژدا هەڵەی دەكرد، فەرمووی: چەند بەزەییم بە منداڵەكانیدا دێتەوە؟! وتیان: ئەی باوكی یەحیا، سەیرە ئەو پیاوە نازانێت نوێژ بكات كەچی تۆ بەزەییت بە منداڵەكانیدا دێتەوە!! فەرمووی: ئەمە گەورەیان بێتو لەمەوە شت وەربگرن![1]

یازدەهەم:

لە فەرموودەكەدا وا دیارە دەبێت كوڕانو كچان لەیەك جیابكرێنەوە لە كاتی خەوتندا بەڵام مانای ئەوەشی لێ وەردەگیرێت كە كوڕانو كوڕانو كچانو كچانیش دەبێت پێكەوە نەخەون لەژێر لێفەیەكدا:

* احمدی كوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لە یەكتری جیادەكرێنەوە لەكاتی خەوتندا، كوڕانو لە كوڕانو كچان لە كچانیش، چونكە لە (١٠) ساڵی بەدواوە حەزو ئارەزوو دەخروشێت)[2]

دوانزەهەم:

لە فەرموودەكەشدا ئەوە دەگەیەنێت كە دەبێت منداڵ فێری ئادابی خەوتن بكرێت بەو شێوەیەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و سەلەفی صاڵحەوە گەیشتۆتە دەستمان:

* عبداللەی كوڕی عەمر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك دووعای فێر دەكردین كە پێش خەوتن بیخوێنین بۆ ترس شكاندن وەك ((بسم الله، أعوذ بكلمات الله التامة، من غضبه وعقابه وشر عباده، ومن همزات الشياطين وان

---

١ رواه ابو نعيم في الحلية (٢/٣٨٣).

٢ أحكام النساء (٨١) (لأحمد بن حنبل).

یحضرون)) عبدالله بەردەوام ئەم دووعایەی فێری نەوەکانی دەکرد ئەوانەی بالق بوون کە پێش خەوتن بیخوێنن)[1].

* ئیبراهیمی نەخەعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (مامۆستاکانمان کاتێك منداڵ بووین فەرمانیان پێ دەداین کە پێش خەوتن لەناو جێگەکانماندا (٣٣) (سبحان الله)و (٣٣) الحمد لله و(٣٤) الله أكبر و هەردوو سورەتی ﴿قُل أعُوذ بِربِّ النَّاس﴾و ﴿قُل أعُوذُ بِرَبِّ الفَلَق﴾ بخوێنین)[2]

* حەمیدە خزمەتکاری ئازادکراوی عمری کوڕی عبدالعزیز (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: نەیەڵیت کچەکانم بەدەما بخەون، چونکە شەیتان بەنیازە لەو حاڵەتەدا شتێکیان پێ بکات)[3] (واتە توشی گوناهیان بکات)

سێزدەهەم:

هەندێك لە زاهیربینەکان وا دەزانن کە منداڵ تا نەبێت بە دە ساڵ نابێت لێی بدرێت لەسەر نوێژنەکردن!

ناتەواوی‌و ناڕاستی ئەم وتەیە شاراوە نیە، چونکە منداڵ هەر دەبێت تەمێ بکرێت، لەکاتێکدا کە فامی هەبێت‌و لە مانای لێدان تێبگات.

تەنانەت ئەو بۆچوونەی کە دەدرێتە پاڵ سەلەف گوایە وتوویانە:

منداڵ لێی ناگیرێت هەرچی بکات وەك ئارەق خواردن‌و قومارکردن‌و شکاندنی شتی خەڵك‌و جنێودان بە دایك‌و باوکی خۆی یان خەڵکی‌و سەرپێچی‌و بێ گوێییەکانی‌و نابێت لەسەر ئەمە لێی بدرێت!! پێش تەمەنی (١٠) ساڵان!!.

---

١ لەمەولا سەرچاوەکەی باس دەکەین.

٢ رواه إبن أبي شيبه (٢٤٨).

٣ رواه إبن أبي شيبه (٣٨٣/٤).

نادروستی ئەم بۆچوونە شاراوە نیە لەلای پەروەردەكارانو مامۆستایان چونكە: هەر لە سەلەفی صالح زۆرێك هەبووە كە تەمێی منداڵەكانیان كردووە لێیان داون وەك:

* عبداللەی كوڕی زبیر (خوا لێیان ڕازی بێت) دای لە منداڵێكی بچوك، خەڵكی چواردەوری وتیان: نەدەبوا لێت بدایەو باشت نەكرد، تۆ لە منداڵێك دەدەیت كە هێشتا هیچ حوكمێكی لەسەر نیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: هەستم كرد كە زەرەرو قازانجی خۆی دەزانێت بۆیە پێم خۆشە ئەدەبی جوانی دابدەم.[١]

* ئەحمەدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر منداڵ بچوك بوو نەیدەفامی دروست نیە لێی بدرێت).[٢]

بەڵام لێدانی منداڵ مەرجی خۆی هەیە لە شەرعداو دەبێت ڕەچاوبكرێت ئەگەرنا زیانی لە سوودی زیاتر دەبێت.

* * *

---

١ رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق (٢٨/٢٠٠).

٢ الاداب الشرعية (١/٤٥١).

# فەرموودەی نۆیەم

## هەڵگرتنی منداڵ لە نوێژدا

عن ابي قتادة (ﷺ) صاحب رسول الله (ﷺ) قال: بينما نحن ننتظر رسول الله (ﷺ) للصلاة في الظهر أو العصر، وقد دعاه بلال للصلاة، اذ خرج الينا وأُمامة بنت أبي العاص بنت إبنته على عنقه، فقام رسول الله (ﷺ) في مصلاهُ، وقمنا خلفه، وهي في مكانها الذي هي فيه، قال: فكبَّر، فَكبَّرنا، قال: حتّى إذا أراد رسول الله (ﷺ) ان يركع اخذها فوضعها ثم ركع وسجد، حتى إذا فرغ من سجوده، ثم قام، اخذها فردها في مكانها، فما زال رسول الله (ﷺ) يصنع بها ذلك في كل ركعة حتى فرغ من صلاته)).

**مانای فەرموودەكە:**

واتە: (ئەبو قتادە) (خوا لێی ڕازی بێت) هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەكاتێكدا ئێمە چاوەڕوانی قدومی پێغەمبەری خوامان دەكرد (ﷺ) لە مزگەوت تا بەرنوێژیمان بۆ بكات، لە نیوەڕۆ یان عەسر، كە بیلال ئاگاداری كرد بۆ نوێژ، لەناكاو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتو ئومامەی كچی ئەبی عاص كە كچەزای بوو و بە قەڵادوشكانیەوە بوو، هەر بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە مینبەرەكەوەو هەر كچەكەشی بەقەڵادوشكانەوە بوو (الله اكبر)ی نوێژدابەستنی كردوو ئێمەیش نوێژمان دابەست، هەركە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بچێت بە ركوعدا لە تەنیشت خۆی كچەكەی داناو لەپاش تەواوبوونی سوژدە هەستایەوە بۆ ڕكاتی دووەم منداڵەكەی هەڵگرتەوەو خستیەوە قەڵادوشكانی، هەر بەو شێوەیەی كرد تا تەواوبوونی نوێژەكە).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

بوخاری (٥١٦) لە باسی هەڵگرتنی منداڵ لە نوێژدا، مسلم (١١٤٩) بەكورتی، أبو داود (٩١٧-٩٢٠) لە باسی ئیشكردن لە نوێژدا، وشەكان هی ئەوە، النسائي (١٢٠٤-١٢٠٥) لە باسی بردنی كۆرپە بۆ مزگەوت، (إبن خوزەیمە) لە (صحیح)ەكەیدا (٧٨٣) لە (باسی نوێژكردن بە جلوبەرگی منداڵەوە) هێناویانە.

## ئەو فەرمان و وانانەی لەم فەرموودە وەردەگیرێت:

**یەکەم:**

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە منداڵی بچوك بە باوەشەوەبگیرێت لەکاتی نوێژدا.

* (ابن جریج) دەڵێ: لە مامۆستا (عطا)م پرسی ئایا ئافرەت دەتوانێت لە نوێژدا منداڵەکەی بگرێت بە بەرۆکیەوە بۆ ئەوەی نەگری؟ فەرمووی: بەڵێ: چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژدا حەسەنی گرتووە بە باوەشەوەو هەر کاتێك چووبێت بۆ سوژدە لەسەر زەویەکە دایناوە، دەڵێ: وتم: لە نوێژی فەرزەکاندابوو؟ فەرمووی: دڵنیانیم).[1]

نووسەر دەڵێت: بەدڵنیاییەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە کە ئومامەی لە باوەشدابووەو لە نوێژی فەرزیشدا بوە وەك فەرمودەکەی قەتادە (خوا لێی ڕازی بێت).

* ئەبوبەکر (الاثرم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم لە أبو عبدالله (واتە احمدی کوڕی حەنبەل) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئایا پیاو دەتوانێت لە نوێژدا کوڕەکەی بە باوەشەوە بێت؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ‌و بەڵگەی فەرموودەکەی قەتادەی هێنایەوە)[2]

**دووەم:**

بەم فەرموودەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دەست دان لە کچی بچوك دەستنوێژ ناشکێنێت (لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن دەست دان لە ئافرەت دەستنوێژ دەشکێنێت).

---

١ رواه عبدالرزاق (٣٢٨٦).

٢ الاستذكار (٣٤٩/٢) الاوسط (ابن المنذر) (٢٧٧/٣).

* (ابـن المنـذر) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەربـارەی فەرموودەكـەی پێغەمبـەر (ﷺ) هەڵگرتنی ئومامە لە نوێژدا دەفەرموێت: (ئەمە بەڵگەیـە لەسـەر وتـەی زۆربـەی زانایان (كە لەناویاندا شتێكی ڕوونو ئاشكرایە كە هەڵگرتنی كچی بچكۆلانە بەدەرنیـە لەوەی دەستی بەر پێستی نەكەوێتو خۆی دەبێت لەگەڵ دەستنوێژ شكاندا دەستنوێژ بشورێتەوە دەی ئەگەر فەرز بێت دەبێت بە بەڵگەوە فەرز بكرێت.

بەڵام خەڵكی لە كۆنو نوێدا خوویان پێـوە گرتـووە كـە مـرۆڤ دەسـت دەكاتـە ملـی دایكیو نەنكی خـۆیو كـچەكەی مـاچ دەكـات لـە بـابی سـۆزو بەزەییـەوەو دەسـتنوێژ گرتنەوەشیان بۆ دانەناوە، ئەگـەر دەسـتنوێژی بـشكاندایە ئـەوە زاناكـان لـەو بـارەوە قسەیان دەكرد وەك چۆن لە باسی بەركەوتنی پێستی پیـاو لـە ژنـی خـۆی بـە درێـژی باسكراوە).[1]

سێیەم:

لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ڕێگەدراوە لە جلو بەرگی منداڵەكە نەكۆڵینەوەو بە ئاشكرا نوێژ پێیەوە دروستە مەگەر پیسی ئاشكرای پێوەبێت.

* ابـن خوزەیمـە (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: باسـی ڕێگـە پێـدان بـە نوێژكردن بە جلوبەرگی منداڵـەوە، مەگـەر بـە ئاشـكرا پیـسی پێوەبێـت، چـونكە بـە فەرموودەكەی هـەڵگرتنی كـچەكەی زەینەبـدا (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دیـارە كـە ئەگـەر نوێژكردن بە جلوبەرگی منداڵەوە دروست نەبووایە هەرگیز هەڵی نەدەگرت لـە نوێـژدا، هیچ جیاوازیەكیش نیە لەنێوان جلوبەرگی پیسو نێوان هەڵگرتنی جلوبەرگی پیس لـە نوێژدا.[2]

* هـەروەها ابـن المنـذر (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) لـە (الاوسـط)دا (٥/٦٤-٦٥)دا هێناویەتی.

---

١ (تحفة المودود) لا (٣٧٤). الاوسط (١/١٣٠-١٣١).

٢ ابن خزيمة في صحيحه (١/٣٨٢).

**چوارەم:**

بەم فەرموودەیەدا دیارە کە دروستە منداڵی بچوك خوار تەمیز پەیداکردن‌و فامگرتن ببرێتە مزگەوتەوە... بەم بەڵگانەی خوارەوەدا:

* (ابو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی عیشامان دەکرد، هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بچوایە بە سوژدەدا حەسەن‌و حسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) دەچوونە سەر پشتی موبارەکی‌و ئەگەر بیویستایە هەستێتەوە بە سوکی دایدەنانە سەر زەویەکەو هەرکە دەچووە سوژدە، دەچوونەوە سەر پشتی، کاتێك لە نوێژ بوویەوە یەکێکی لەم لای خۆی‌و ئەوی تری لەولای خۆیەوە دانا، منیش چوومە خزمەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیانبەمەوە لای دایکیان؟ فەرموی: نەء، لەو کاتەدا یەك بریقە دای لەسەر زەوی دنیا ڕۆشن بوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئادەی بڕۆنەوە بۆ لای دایکتان‌و تا خۆیان کرد بە ماڵدا ڕووناکیەکە بەردەوام بوو.[١]

* عبداللەی کوڕی شداد لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لە یەکێك لە نوێژەکانی نیوەڕۆ یان عەسر بوو هات بۆ مزگەوت‌و حەسەن‌و حسەینی بە باوەشەوە بوو، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە مینبەرەکەوە نوێژی دابەست هەردوو منداڵەکەی لەپاڵ خۆیدا دانا، کاتێك چوو بە سوژدەدا (سوژدەکەی زۆری خایاند)

دەڵێ: من خۆم پێ نەگیراو سەرێکم بەرزکردەوە دەبینم هەردوو منداڵەکە بەسەر پشتی پێغەمبەری خواوە بوون (ﷺ)و منیش چوومەوە بە سوژدەکەمداو کاتێك لە نوێژ بوویەوە، خەڵکی پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم نوێژەدا سوژدەیەکی وا درێژت برد، دڵمان شتێکی کرد کە شتێك ڕووی دابێت یان وەحی‌و

---

١ رواه احمد (٥١٣/٢) والحاكم (١٦٧/٣). وقال: هذا حديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه.

نیگات بۆ هاتبێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((فَكُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ وَلَكِنَّ ابْنِي ارْتَحَلَنِي فَكَرِهْتُ أَنْ أُعَجِّلَهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ))[١].

واتە: نەء، هیچ شتێك لەوانە ڕووی نەدا بەڵكو كوڕەكەم چووبووە سەر پشتمو منیش نەمویست پەلەی لێ بكەم تا بە ویستی خۆی دادەبەزێت.

ئەم ڕوودانی چوونە سەرپشتەی حەسەنو حسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) بۆ سەر پشتی پێغەمبەر (ﷺ) لە زۆر فەرموودەی تردا دووبارەبۆتەوە.

نووسەر دەڵێت: ئەو فەرموودەیەی كە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕنەوە كە بەرگری دەكات لەوەی منداڵ بهێننە ناو مزگەوتەكانەوە فەرموودەیەكی زۆر لاوازەو (زەعیفە) كە ئەمە دەقەكەیەتی: ((جنبوا صبيانكم مساجدكم ومجانينكم))[٢]

واتە: منداڵانو شێتەكانتان لە مزگەوتەكانتان بەدوور بگرن.

پێنجەم:

بەڵام هەندێك لە زانایان بە مەكروهیان زانیوە منداڵی بچوكی بێ ئاوەزا بهێنرێتە مزگەوتەوە ئەمەش بەهۆی ئەو هاروهاجیو تەشویش بۆ نوێژگەرانو نیگەرانكردنی خەڵكیەوە دروستی دەكەن.

ئەمەش لەبەرئەوەیە كە زۆربەی منداڵان خراپ فێركراونو بەگوێی گەورەكان ناكەن:

* عمری كوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) كۆمەڵێك منداڵی بینی لەناو مزگەوتدا یاریو شەڕەشەقیان دەكرد چوو بۆ ناویانو بە دارەكەی دەستی لێی دان)[٣]

* (ابن قاسم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پرسیاركرا لە (ابن مالك) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) كە ئایا منداڵی بچوك بهێنرێت بۆ مزگەوت؟ فەرمووی: ئەگەر

---

١ رواه احمد (٣/٤٩٣-٤٩٤)، وابن ابي شيبه (١٢٢٣٩)، والنسائي (١١٤١) واسناده صحيح.

٢ رواه عبدالرزاق (المصنف) (١٧٢٦) (١٧٢٧) وابن ماجة (٧٥٠).

٣ انظر تفسير ابن كثير (٦/٦٤).

لەبەر منداڵیو بێ ئاوەزایی دەستکاری شتو مەکی مزگەوتی نەدەکرد قەیناکات، وانابینم هیچی تێدابێت ئەگەر بهێنرێن بۆ مزگەوت).[1]

* ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (دەبێت منداڵانی بچوك لە مزگەوتەکان بەدوور بخرێن)[2]

* ئیسحاقی کوڕی راهەویهی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر کوڕبێت، نەگەیشتبێتە حەوت ساڵان، نەهێڵرێت بێتە مزگەوت گوناه نیە، بەڵام ریزی یەکەمی نوێژ نابێت منداڵی تێدابێت، بەهیچ جۆرێك دروست نیە منداڵێك گەیشتبێتە حەوت ساڵی لە مزگەوت دەربکرێت، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوە نوێژ بکات.

سوننەت وایە لە غەیری کاتی نوێژەکاندا بە هێمنی بکرێنە دەرەوە لە مزگەوت ئیتر گەیشتبووە حەوت ساڵی یان کەمتریش بوون، ئەمەش لە ترسی ئەو گەمەو مەزاقەی لە حەرەمی مزگەوتدا بەرپای دەکەن، بەڵام ئەگەر لەکاتی نوێژەکاندا هاتن بۆ نوێژ نابێت دەربکرێنە دەرەوە).[3]

* (ابن تيميە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (دەبێت مزگەوت بپارێزرێت لە هەر شتێك ئازاری دەدات یان ئازاری موسڵمانان دەدات تەنانەت دەنگ بەرزکردنەوەی منداڵان، هەروەها پیسو پۆخڵکردنی فەرشەکانیو لەم شێوانە، بە تایبەت کاتەکانی نوێژ، چونکە ئەوە لە مونکەرو خراپە گەورەکانە)[4].

---

١ المدونة (١/١٠٦).

٢ فتح الباري (ابن رجب) (٣/٣٦).

٣ قيام الليل (مروزي) (٢٤٣).

٤ مجموع الفتاوى (٢٢/٢٠٤).

نووسەر لەسەر ئەم بابەتە دەڵێت: ئەمەی پێشوو ڕای زانایان بوو، لە مەسەلەی منداڵ بردن بۆ مزگەوت بەدرێژی دواون، باسی منداڵێکیان کردووە ئەگەر یاری نەکاتو تەشویش دروست نەکات بە جموجۆل بۆ نوێژگەرانو دەنگی بەرزنەکردەوە لە مزگەوتداو نەیدەقیڕاند، ئەوە لە مزگەوت ناکرێتە دەرەوە چونکە وێنەی ئەوانە وەك چۆن ڕێگا دەدات بە حەسەنو حسەین بێنە مزگەوت بە منداڵی، ڕێگەیش دەدرێت بەوان.

بەڵام ئەگەر بە عەجولو یاریو گەمەوگەپکەر ناسرابوو، زۆر هاوارو قیڕەقیڕەی دەکرد، شەرمی لە گەورەکان نەدەکردو ئەگەر پێت بگوتایە بێ دەنگ بە بێ دەنگ نەبووایە، وێنەی ئەم منداڵە لای زانایان دەبێت نەهێنرێت بۆ مزگەوت، چونکە ئازاری موسڵمانان دەداتو مزگەوتەکەش پیس دەکات.

بەڵگەیش بۆ ئەم وتانە: هەموو ئەو بەڵگانەیە کە داوا لە موسڵمان دەکەن مزگەوتەکان بپارێزن لە هەر شتێك دەبێتە هۆی ئازاردانی مزگەوتەکە یان نوێژخوێنان، وەك فەرماندانی پێغەمبەر (ﷺ) بەو کەسانەی پیازو سیر دەخۆن بە دوورکەوتنەوەیان لە مزگەوت، چونکە بە بۆنی ناخۆشی دەمی ئازاری موسڵمانان دەدات:

* عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر هەستی بە بۆنی دەمی موسڵمانێك بکردایە لەوانەی پیازو سیریان خواردووە، فەرمانی دەدا بیکەنە دەرەوەو بڕوات بۆ بەقیع، هەر کەسێك بیەوێت ئەو دووانە بخوات با بە لێنراوی بیخوات).[1]

زیانی بۆنی دەمی پیازو سیر خۆر تەنها بۆ دەورووبەری خۆیەتی بەڵام منداڵی بچوك زیانەکانی لە گریانو یاریو عەجولییەکەی دەگاتە هەموو نوێژگەران.

---

١ رواه مسلم (١١٩٥).

هەروەها بەڵگەکان بە گشتی ئەوە دەگەیەنن کە مزگەوتەکان بۆ زیکرو یادی خواو نوێژکردن دروستکراون نەك بۆ یاریو پێکەنینو هاروهاجی (والله أعلم).

شەشەم:

هەڵگرتنی ئومامە لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بەڵگەیە لەسەر سۆزو بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کچاندا.

حەوتەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە کچی بچکۆلە لەلایەن باوكو دایکیەوە بخرێتە سەر شان (قەڵادوشکان)و هەڵگرتنی لەناو خەڵکیدا.

* * *

# فەرموودەی دەیەم

## نوێژكردن لەسەر منداڵی مردوو

عن المغيرة بن شعبة (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((الطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

احمد ڕیوایەتی كردووە (٢٤٧/٤)و (ترمذی) (١٠٣١) لەباسی نوێژكردن لەسەر منداڵو دەڵێ: حديث حسن صحيح، (النسائی) (١٩٤٨) و (ابن ماجة) (١٥٠٧)، (الحاكم) (٣٥٥/١-٣٦٣)و (ابن ماجة) (٣٠٤٩).

هەروەك (عبدالرزاق) (٦٦٠٢) لە باسی نوێژ لەسەر منداڵو زۆڵ، (ابن أبی شيبه) (٣١٧/٣) لە بابی زۆڵو ئەوانەی دەڵێن نوێژی لەسەر دەكرێتو (احمد) (٢٤٩/٤)و أبو داود (٣١٨٠). والحاكم (٣٦٣/١).

ئەم فەرموودەیە إمام احمد بە (صحيح)ی داناوە لەگەڵ ترمذیو حاكمو (الذهبی)و (ابن قيم) لە زاد المعاد (٥١٣/١).

### ئەو فەرمانو وانانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم:

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە نوێژی مردوو لەسەر منداڵ بكرێت، هەموو زانایان لەسەر ئەوە كۆدەنگن:

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (زانایان هەموو لەسەر ئەوەن كە كۆپەڵە دەركەوێت زیندووە بەگریانو هاوار، نوێژی لەسەر دەكرێت)[1].

---

١ الاجماع لا٥١.

* (ابن عبدالبر) دەڵێ: هەموو زانایانو فیقهزانـان لەسـەر ئـەوەن کـە منـداڵ نوێـژی لەسەر دەکرێتو ژمارەیەکی زۆر کەمو نـامۆ پێـچەوانەی ئـەم وتەیـەنو دەڵـێن: منـداڵ نوێژی لەسەر ناکرێتو ئەم ڕایە بیدعەچیەکان دەستیان پێوە گرتووە..

دەڵێ: ئەهلی فەتوا چ لە حیجازو چ لە عیراق وازیان لێ هێنـاو فـەتوای نوێـژکردنیان داوە لەسەر منداڵان.[1]

دووەم:

لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە هەر کاتێك بانگ بکرایە بۆ لای تەرمی منداڵێك یان بیانهێنایـە بـۆ لای تـا نوێـژی لەسـەر بکـات، خێـرا دەچـوو بەدەمیانـەوەو نوێژی لەسەر دەکرد:

* عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفـەرموێت: (تـەرمی منـداڵێکی ئەنـصاریان هێنایـە خزمـەت سـەروەر (ﷺ)و ئـەویش نوێـژی لەسـەر کـرد)[2] لـەلای مـسلم (٦٨٦٢) بـەم شێوەیە هاتووە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگ کـرا بـۆ نوێـژکردن لەسـەر کۆرپەیـەکی ئەنصاری).

سێیەم:

هەر کەسێك منداڵێکی بمرێت دەتوانێت هەر لە ماڵەکەی خۆی نوێژی لەسـەر بکـاتو پێویست ناکات بیباتە دەرەوە بۆ مزگەوت:

* ئیـسحاقی کـوڕی عبـدالله کـوڕی (أبـو طلحـة) لـە باوکیـەوە دەگێڕێتـەوە کـە (أبوطلحة)کاتێك عومەیری کوڕی گیانی سپارد، پێغەمبەری خوای (ﷺ) بانگ کـرد بـۆ ماڵەکەی خۆی تا نوێژی لەسەر بکاتو ئەویش ڕۆیشت بۆ ماڵیانو نوێژی لەسەر خوێنـد

---

١ الاستذكار (٣/٣٨)

٢ رواه النسائي (١٩٤٧).

(لە ماڵەکەیاندا)و خۆی لە پێشەوەو (أبوطلحة) لە دواوەو (أم سليم)یش لەدوای ئەوەوە)[١]

* نافع دەڵێت: عبداللەی کوڕی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) نوێژی کرد لەسەر کۆرپەلەیەکی لەبارچوو کە ڕوون نەبوو ئایا نۆزەی هات یان نا؟ لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژی لەسەر کردو پاشان بردیانو لە گۆڕستان ناشتیان).[٢]

چوارەم:

لە زانایانی سەلەف دەربارەی ئەو منداڵەی لەباری دایکی دەچێت بە مردوویی یان بە ناتەواوی لەدایك بووبێت، ئایا نوێژی لەسەر دەکرێت؟

ئەوەی (صحيح)ەو جێگای بایەخە ئەوەیە کە: ئەو منداڵەی لەباری دایکی دەچێت لە سێ حاڵەت بەدەرنیە:

١- ئەو منداڵەی لەباری دایکی دەچێت پێش ئەوەی گیانی تێ بکەوێت واتە پێش چوار مانگی لەدایك ببێت، وەك لە فەرموودەی (ابن مسعود)دا هاتووە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە نوێژی لەسەر ناکرێت.

* محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر بە تەواوەتی ئەندامەکانی دروست نەبووبوون ئەوە دەنێژرێتو نوێژی لەسەر ناکرێت)[٣]

٢- ئەو منداڵەی لەدایك دەبێت لەپاش ئەوەی گیانی تێ بکەوێت ئەوە لە (صحيح)دا نوێژی لەسەر دەکرێت:

---

١ رواه (الطحاوی) شرح معاني الاثار (١/٥٠٨) والحاكم (١/٣٦٥)، وصححه ووافقه الذهبي، رواه احمد في مسنده (٣/٢١٧).

٢ رواه عبدالرزاق (٦٦٠٠).

٣ رواه عبدالرزاق (٦٦٠٣).

* موغیرەی کوڕی شوعبە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((والسقط يصلي عليه، ويدعى لوالديه بالمغفرة والرحمة))[١].

* سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو منداڵەی بە مردوویی لەباری دایکی دەچێت دەفەرموێت: (ئەگەر گیانی تێ کرابوو نوێژی لەسەر دەکرێتو ئەوەش پاش چوار مانگی دەبێت).[٢]

* (اسحاق)ی کوڕی (راهويه) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: سوننەت وابوو لە سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) کە ئەو منداڵەی بە مردوویی لەدایك دەبێت دوای تەواوکردنی هەموو ئەندامەکانی لەشیو گیانی پێ بەخشرا (کە ئەوەش بە چوار مانگو دە ڕۆژ دانراوە) نوێژی لەسەر دەکرێت، بەڵام میرات بردن دوای دەرکەوتنی نیشانەی ژیانە لەسەر کۆرپەکە، بەڵام بۆچی نوێژی لەسەر نەکرێت کە لە قیامەتدا بەجوانی زیندوو دەکرێتەوەو لەلای خوا (پاشەڕۆژی بەختەوەر یان نەگبەتی بۆ نووسراوە) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((صلوا على أطفالكم)) نوێژ بکەن لەسەر منداڵەکانتان، موغیرەی کوڕی شوعبە (خوا لێی ڕازی بێت) ڕیوایەتی کردووە.[٣]

**پێنجەم:**

ئەم دوعایانەی لە نوێژکردن بەسەر منداڵدا دەخوێنرێت:

* (ابو هريره) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر جەنازەیەك ئەم نزایەی خوێند: ((اللهم اغفر لحينا وميتنا وصغيرنا وكبيرنا وذكرنا

---

١ پێشتر دەرهێنراوە.

٢ رواه عبدالرزاق (٦٦٠١) ابن ابي شيبه (٣/٣١٨).

٣ (الاوسط) ابن منذر (٥/٤٠٥). و(الترمذي) (٣/٣٥٠-٣٥١).

وأُنثانا، وشاهدنا وغائبنا، اللهم من احييته منا فأحيه على الايمان ومن توفيته منا فتوفّه على الاسلام، اللهم لاتحرمنا أجره ولاتضلنا بَعدَه))[١].

واتە: ئەی پەروەردگارا لە زیندوان‌و مردوانمان، لە گەورەو بچوكمان، لە نێرو مێمان، لە ئامادەو نادیارمان خۆش ببە، خوایە هەر كەسێكمان دەژێنی لەسەر ئیمان بیژێنەو هەر كەسیشمان دەمرێنی بە ئیسلامەتیەوە بیمرێنە، خوایە بێ بەشمان نەكەیت لە پاداشتی ئەم مردووەو لەپاش ئەویش گومڕامان نەكەیت) امین.

* محمدی كوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە نوێژدا دووعای بۆ مردووی منداڵ‌و گەورە دەكردو داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەكرد، پێیان وت: قوربان خۆ ئەم منداڵە گوناهی نەكردووە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە لە هەموو گوناهەكانی پێشترو پاشتری خۆش بووە كەچی فەرمانم پێدراوە صەلاواتی لەسەر بدەم).[٢]

* سەعیدی كوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەبو هورەیرەم بینی (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژی دەكرد لەسەر تەرمی منداڵێك كە هەرگیز تاوانی نەكردووەو دەیفەرموو: (ئەی خوای پەروەردگارم لە سزاو عەزابی ناو گۆڕ بیپارێزە).[٣]

* لە ئەبوهورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كە نوێژی كردووە لەسەر موسڵمانێكی منداڵ كە هەرگیز گوناهی نەكردووەو دەیفەرموو: (اللهم اجعله لنا سلفاً وفرطاً وذخراً)[٤] واتە: پەروەردگارم ئەم منداڵە بكەیتە توێشوو و زەخیرەی ڕۆژی قیامەتمان.

---

١ رواه ابو داود (٣٢٠١)، والترمذي (١٠٢٤) وصححه، وابن ماجة (١٤٩٨) واسناده صحيح.

٢ رواه اسماعيل بن اسحاق القاضي في فضل النبي (صلى الله عليه وسلم) لا(٧٨).

٣ رواه عبدالرزاق (٦٦٠٠) وابن ابي شيبه (٣/٣١٧) ومالك في الموطأ (١/٢٢٨) واسناده صحيح.

٤ رواه البيهقي في السنن الكبرى (٤/٩–١٠).

شەشەم:

ئەگەر لە یەك كاتدا پیاوێكو منداڵێك مردبوون چۆن نوێژیان لەسەر دەكرێت؟:

پیاوەكە لەبەردەم ئیمامدا دادەنرێتو منداڵەكەش لەپێش ئەوەوە دادەنرێت:

* ئەبو ئیسحاق دەڵێ: پێشەوا (الشعبی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) نوێژی كرد لەسەر پیاوێكو منداڵێك بەجۆرێك پیاوەكەی لەبەردەمی خۆیدا داناو منداڵەكەشی خستە پێشی ئەوەوە.[1]

حەوتەم:

ئەگەر منداڵێكو ژنێك مردن، سوننەت وایە منداڵەكە لەلای ئیمامەوەبێتو ژنەكەش لەپێشی ئەوەوە واتە لەبەردەمی قیبلەدا:

* عەممار مەولای (حارث بن نوفل) دەڵێ من خۆم جەنازەی (ام كلثوم)ی كچی عەلی كوڕی ئەبوطالبو كوڕەكەیم بینی نوێژی لەسەر دەكرا، بەجۆرێك دانرابوون كە منداڵەكە لەبەردەم ئیمامەكەدا بووو دایكیشی لەوبەردەمی دا، واتە لە ڕووی قیبلەوە، منیش ئەوەم بەدڵ نەبوو، هاوارم كرد، بەڵام لەناو خەڵكەكەدا (ابن عباس)و (ابو سعید الخدری)و (أبو قتادە)و (أبو هریرە)یان لەناودابوو (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویان: تەواوە بەو جۆرە سوننەتە،[2] دەڵێن ئیمامەكە (ابن عمر) بوو (خوای لێ ڕازی بێت)

هەشتەم:

ئەگەر لە یەك كاتدا منداڵێكو ژنێكو پیاوێك مردن:

* شافعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر جەنازەی ژنێكو پیاوێكو نێرەموكێكو منداڵێك دانرابوو، ئەوە پیاوەكە لەبەردەم ئیمام دادەنرێتو لەدوای ئەو

---

١ رواه ابي ابن شيبه (٣/٣١٦).

٢ رواه أبو داود (٣١٩٣)، والنسائي في الكبرى (٢١٠٤). واسناده صحيح.

منداڵەکەو لەدوای ئەویشەوە نێرەموکەکەو لەدوای ئەویشەوە ژنەکە)[١].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش (رەحمەتی خوای لێ بێت) هەروا دەفەرموێت.[٢]

**تۆیەم:**

ئەگەر منداڵێکی کافر موسڵمان بوو پاشان مرد، ئایا نوێژی لەسەر دەکرێت؟ بەڵێ نوێژی لەسەر دەکرێتو لە گۆڕستانی موسڵمانان‌اندا دەنێژرێت.

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی منداڵێکی جولەکەی کرد کە خزمەتکاری بوو، پێی فەرموو: بڵێ: (لا إله إلّا الله) منداڵەکەش سەیری باوکی دەکردو ئەویش پێی وت: (أبوالقاسم) چیت پێ دەڵێ بیڵێ ئەویش وتی: (لا إله إلّا الله)و گیانی سپارد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((صلوا على أخيكم))[٣] واتە نوێژ بکەن لەسەر براکەتان.

*                    *                    *

---

١ الام (٤٦١/١).

٢ المغنى (٥١٠/٣).

٣ رواه أحمد (٢٦٠/٣) والحاكم (٣٦٣/١) واصله في الصحيحين وبوب له البخاري.

# فەرموودەی یازدەیەم

## منداڵان و ڕۆژووگرتن

عن الرُّبيع بنت معوِّذ (رضي الله عنهما) قالت: أرسل النبي (ﷺ) غداة عاشوراء الى قرى الانصار: ((مَنْ أصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ ، وَمَنْ أصْبَحَ صَائِمًا فَلْيَصُمْ)).

قالت فكنا نصومه بعد، ونصوِّم صبياننا، ونجعل لهم اللعبة من العهن، فاذا بكى أحدهم على الطعام اعطيناه ذاك حتى يكون عند الافطار)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

بخاری (١٩٦٠) لە باسی ڕۆژووی منداڵان و (مسلم) (٢٦٣٩) هێناویانە.

### ئەو فەرمان و وانانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

**یەكەم:**

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە ڕۆژوو بە منداڵان بگیرێت و زۆرێك لە زاناكان لە كتێبەكانیاندا كردوویانە بە سەرباس..

* عبداللەی كوڕی ئەبی هوزەیل دەڵێ: پیاوێكی بە تەمەنیان هێنا بۆ بەردەستی عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) ئارەقی خواردبوویەوە لە مانگی ڕەمەزاندا، عمر (خوای لێ ڕازی بێت) پێی فەرموو: وەك كەر پرمەت لێ دێت و ئارەقت خواردووە لە ڕەمەزاندا كە منداڵەكانیشمان بە ڕۆژوون؟! بۆیە هەشتا داری لێداو پاشان دووری خستەوە بۆ وڵاتی شام.[١]

**دووەم:**

لە چ تەمەنێكدا فەرمان بە منداڵ دەدرێت بۆ ڕۆژووگرتن؟

سەلەفی صالح (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لەو كاتەوە ڕۆژوویان پێ گرتوون كە توانیویانە بیگرن.

---

١ رواه البخاري (معلقاً) (٤/٢٢٠) وعبدالرزاق (١٣٥٥٧).

* هیشامی کوڕی عورووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (باوکم نوێژی بە منداڵان دەکرد کاتێك لێی تێ بگەیشتنایە، ڕۆژوویشی پێ دەگرتن کاتێك بیانتوانیایە)[١].

**سێیەم:**

فەرمان دان بە منداڵان بۆ ڕۆژووگرتن سوننەتە بۆ ڕاهێنانیانە لەسەر گوێڕایەڵیو بەندایەتی.

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (فەرمانی ڕۆژووگرتن بدرێت بەسەر منداڵاندا کاتێك بزانرێت دەتوانێت بیگرێت شتێکی باشو سوننەتە)[٢]

**چوارەم:**

ئایا منداڵێك کە بتوانێت بەڕۆژوو بێت بەڵام هەندێك ڕۆژووی فەوتاندبێت، ئایا قەزاکردنەوەی لەسەرە.

* (ابن قدامە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەو ڕۆژانەی فەوتاوە لەپێش باڵغبوونی، گێڕانەوەی لەسەر نیە ئیتر با ڕۆژووی گرتبێت یان هەر نەیگرتبێت، ئەمە ڕای زۆربەی زۆری زانایانە)[٣].

بەڵام پێشەوا ئەوزاعی دەڵێت: (دەبێت بیگێڕێتەوە ئەگەر شکاندبووی لەکاتێکدا دەشیتوانی ڕۆژوو بگرێت).

بەڵام ئەوە لای ئێمە بەو جۆرەیە ئەو سەردەمە سەردەمی منداڵیەو لەسەری نیە ڕۆژوە فەوتاوەکانی بگێڕێتەوەو، وەك ئەو کەسە وایە کە دوای تێپەڕبوونی مانگی ڕەمەزان بالق دەبێت.[٤]

**پێنجەم:**

١ المغنی (٤/٤١٣) مصنف عبدالرزاق (٤/١٥٣-١٥٤).

٢ الأقناع (١/١٩٤).

٣ المغنی (٤/٤١٤).

٤ المغنی (٤/٤١٤).

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە منداڵ ببرێتە ناو مزگەوتەوە پێشتر لەسەر ئەمە بەدرێژی دواین.

**شەشەم:**

فەرموودەكە ئەوەش دەگەیەنێت كە دروستە بوكو یاری منداڵان ببرێتە مزگەوتەوە بە مەرجێك شتی حەرام نەبێت، بۆ ئەوەی منداڵی پێوە خەریك بكرێت برسێتیو ماندوویی‌و تێنوێتی لەبیر ببرێتەوە پێی.

**حەوتەم:**

لە فەرموودەكەوە ڕۆڵی ئافرەتی صەحابیمان بۆ دەردەكەوێت (خوایان لێ ڕازی بێت) لە پەروەردەكردن‌و ڕاهێنانی منداڵەكانیان لەسەر خواناسی‌و گوێڕایەڵی.

بەردەوام ئافرەتانی سەلەفی صالح (خوایان لێ ڕازی بێت) لەسەر ئەم ڕێڕەوە بەرزە دەڕۆیشتن لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیانداو بەردەوام دایكان هانی منداڵەكانیان دەدا تا بچنە كۆڕی زانایان‌و هەوڵی كۆكردنەوەی فەرموودەو زانستی شەرع بدەن تا ئەوەبوو لە بەرهەمی ئەو هەوڵە پیرۆزەیان كەسانی وەك سوفیانی سەوری‌و مالیك‌و شافیعی‌و احمدو كەسانی تریش هەڵكەوتن (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

بەڵام دایكانی ئەمڕۆ مەگەر كەمێكیان خوا ڕەحمی پێ كردوون –ئەگەرنا هەموویان لە بەرپرسیارێتی پەروەردەكردنی منداڵەكانیان دووركەوتوونەتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

((والمرأة راعية في بيت بعلها وولده وهي مسؤلة عنهم)) واتە: ئافرەت بەرپرسیارە لە ماڵی مێردەكەی‌و منداڵەكانی‌و لەسەر ئەوان لە قیامەتدا پرسیاری لێ دەكرێت..

بەڵام زۆرێك لە ئافرەتان لەپێناوی بەرژەوەندی‌و ڕابواردن‌و خۆڕازاندنەوەیان نایان پڕژێتە سەر كۆرپەكانیان‌و ناچار دەیاندەنە دەستی دایەن‌و خزمەتكاری كرێ گرتە!

وازدەهێنن لەو فەرمانەی خوای عزوجل کە لەسەریان فەرزی کردووە سەپەرشتیو پەروەردەی منداڵەکانیان بکەن، دەی خوا ڕەحم بکات!.

*　　　*　　　*

# فەرموودەی دوازدەیەم

## سەرفیترە لەسەر منداڵان

عن عبدالله بن عمر (رضی الله عنهما) قال: فرض رسول الله (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ والْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَبِهَا أن تُؤدِيَ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ))

واتە: عبدالله كوڕی عومەر (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت) دەفەرموێ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەكاتی سەرفیترەی مەزەندەكرد بە ساعێك لە خورما یان ساعێك لە جۆ – كە نزیكەی دوو كیلۆ دەكات– و فەرزی كرد لە سەر بەندەو ئازادو نێرو مێو گەورەو بچووكی موسڵمانانو فەرمانی دەركرد كە پێش ئەوەی نوێژی جەژن بكرێت، بدرێت)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

أحمد ڕیوایەتی كردووە (٢/٥٥) و بوخاری (١٥٠٣)و (١٥١٢) لە باسی (سەرفیترە لەسەر گەورەو بچوكە)و موسلیم (٢٢٤٠)و أبو داود (١٦١٣)و تورمذی (٦٧٥)و ابن خزیمە (٢٤٠٣).

### ئەو فەرمانو ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم:

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە زەكاتی سەرفیترە واجبە لەسەر گەورەو بچوك.

* ابن خزیمە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) (ئەم باسە باسی ئەوە دەگەیەنێت كە زەكاتی سەرفیترە واجبە لەسەر گەورەو بچوكە، بە پێچەوانەی ئەوانەی كە دەڵێن: فەرز نیە لەسەر كەسێك هێشتا فەرزەكانی لەسەر فەرز نەكراوە).[1]

---

١ صحیح ابن خزیمة (٤/٨٤).

دووەم:

ئایا زەکاتی سەرفیترە لە پارەی تایبەتی منداڵەکە دەدرێت یان لە پارەی وەلیو سەرپەرشتیاری؟

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زانایان بەکۆی دەنگ لەسەر ئەوەن کە هەموو کەسێکی موسڵمان زەکاتی سەرفیترەی لەسەرە، ئەگەر بووی هی خۆیو خێزانیو منداڵەکانی دەدات ئەوانەی خۆیان پارەیان نیە، بەڵام ئەگەر منداڵەکان پارەیان هەبوو لەو پارەیە دەری دەکات)[١]

سێیەم:

هەندێك لە زانایانی سەلەفی صالح بە سوننەتی دەزانن زەکاتی سەرفیترەی منداڵێك بدرێت کە هێشتا لە سکی دایکی دایە.

* حەمید لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە دەگێڕێتەوە کە زەکاتی سەرفیترەی لەباتی منداڵی ناو سکی داوە.[٢]

* (ئەبو قولابە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زۆر حەزیان لەوەبوو زەکاتی سەرفیترەکانیان دەربکەن تەنانەت لەباتی کۆرپەلەی ناو سکی دایك.[٣]

چوارەم:

ئەو ئەندازەیەی کە دەبێت لەباتی هەر کەسێك بدرێت چ گەورە یان بچوك: ساعێکە بە ساعەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

* * *

---

١ (الاقناع) ابن منذر (١٨١/١).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٢١٩/٣).

٣ رواه عبدالرزاق (٥٧٨٨). لە باسی ئایا زەکاتی کۆرپەلە دەردەکرێت؟ وابن ابي شيبه (٢١٩/٣).

# فەرموودەی سیازدەیەم

## منداڵان و حەجکردن

عن عبدالله بن عباس (رضى الله عنهما) قال: رفعت إمراة صبيًا لها، فقالت يارسول الله الهذا حج؟ قال: ((نَعم وَلَكِ أجرٌ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە (١/٢٤٤)و مسلم (٣٢٣٢)و تورمذی (٩٢٤)و ابن ماجە (٢٩١٠) لە باسی حەجی منداڵاندا.

### ئەو فەرمان و ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم:

فەرموودەکە مانای ئەوە دەبەخشێت کە دروستە منداڵ حەج بکات و ئەمانەش پاڵپشتی ئەو مانایەن:

* (سائب)ی کوڕی (یەزید) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: (باوکم لە (حەجەتول وەداعدا) حەجی پێ کردم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کە لەو کاتەدا تەمەنم حەوت ساڵان بوو).[١]

*(ابن عبدالبر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە تێگەیشتنی ئەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە حەجکردن دروستە بە منداڵان، کۆمەڵێ لە زانایان ڕێگەیان پێداوە لە حجاز و شام و عیراق و میصر، بەڵام هەندێك لە بیدعەچیان بە بێ بەڵگە ڕێگە نادەن حەج بە منداڵان بکرێت، بەڵام ئەم ڕایەی دووەم بێ بەهایە و وازی لێ هێنراوە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەجی کرد بە کۆمەڵێ منداڵی (بنی عبدالمطلب).

دەربارەی منداڵان فەرموویەتی: ((لە حج وللذي يحجه أجر)) واتە: حەجی بۆ دەنوسرێت و بۆ ئەو کەسەشی حەجی پێ دەکات پاداشتی هەیە.

---

١ رواه البخاري (١٨٥٨) والترمذي (٩٢٥).

هەروەها ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) حەجی کردووە بە عبداللەی کوڕی زوبیر (خوا لێیان ڕازی بێت) لەناو پارچە قوماشێکدا.

**دووەم:**

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵ هەر کارێکی چاکە ئەنجام دەدات لە نامەی چاکەکانیدا بۆی دەنووسرێت:

* عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (تکتب للصبي حسناته، ولاتکتب علیه السیئات)[1] واتە: منداڵ چاکەکانی بۆ دەنوسرێت بەڵام گوناهی لەسەر نانووسرێت.

**سێیەم:**

مەرج نیە حەجی منداڵێك قبول ببێت کە فامی کردبێتەوەو تەمیزی هەبێت چونکە ئەو منداڵەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: حەجی بۆ هەیە ((ان له حجاً)) بەیهەقی دەڵێت: ئەو منداڵە شیرەخۆرە بووە.[2]

ئەم ڕیوایەتە وەڵامێکە بۆ ئیمام مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: حەجی منداڵی شیرەخۆر دروست نیە.[3]

**چوارەم:**

حەج و عەمرەکردنی منداڵ جیهادکردنیانە:

* (ابو هریرە) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:((جهاد الکبیر والصغیر والضعیف والمرأة الحج والعمرة))[4] واتە: حەجی گەورەو بچوكو لاوازو ژنانی موسڵمان–حەج و عەمرەکردنە.

---

١ الاستذکار (٣٩٨/٤).

٢ البیهقي (١٥٥/٥).

٣ المنتقی (الباحي) (٧٨/٣).

٤ رواه عبدالرزاق (٩٧٠٩) وأحمد (٤٢١/٢) والنسائي (٢٦٢٦) واسناده حسن.

**پێنجەم:**

سەلەفی صالح (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر گرنگیان داوە بەوەی حەج بە منداڵەکانیان بکەن چونکە پیشانی پەروەردگاری دەدەن تا ڕەحمو بەزەیی خوا لەو مەوسیمە پیرۆزەدا ئەوانیش بگرێتەوە:

* سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: بە محەمدی کوڕی مونکەدیریان وت: تۆ منداڵ دەبەیت لەگەڵ خۆت بۆ حەج؟ فەرمووی: (بەڵێ، پیشانی پەروەردگاریان دەدەم).[١]

* (ابن عبدالبر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (لە کۆنو ئێستاشدا سەلەف حەجیان کردووە بە منداڵەکانیانو پیشانی ڕەحمەتی خوایان داون).[٢]

**شەشەم:**

هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە منداڵ تا بالق نەبێت حەجی لەسەر فەرز نیە:

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) کۆدەنگی هەموو زانایان دەهێنێت لەسەر ئەوەی منداڵ حەجی لەسەر نیە تا بالق نەبێت.[٣]

**حەوتەم:**

لە ڕەحمو سۆزی پەروەردگارە بە منداڵان ئەوەیە: کە هەر یەکێکیان بە منداڵی حەج بکاتو پێش باڵغبوون کۆچی دوایی بکات، ئەوە حەجە مەزنەکەی ئیسلامی بۆ دەنووسرێت.

* (ابن عباس) (خوا لێیان ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا حج الصبي فهي له حجة حتى يعقل، وإذا عقل فعليه حجة أُخرى))[٤] واتە: ئەگەر منداڵ حەج بکات ئەوە تا بالغ دەبێت بۆی دەنووسرێت، هەرکاتێ باڵغ بوو حەجەکەی تری لەسەر فەرزە.

---

١ رواه ابن الجعد في (المسند) (١٧٥١). وابن أبي الدنيا في (العيال) (٦٤٧).

٢ الاستذكار (٤/٣٩٨).

٣ الاجماع لا٧٧

٤ رواه إبن خزيمة (٣٠٥٠) والحاكم (١/٤٨١) والصحيح حديث مرفوع.

**هەشتەم:**

ئەگەر منداڵ بە بچوکی حەجی کردبێت ئایا کاتێك گەورەبوو حەجی تری لەسەرە یان نە؟

* (تورمذی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەگەر منداڵ پێش گەورەبوون حەجی کردبوو، ئەوە کاتێك گەورەبوو دەبێت حەج بکاتەوە، چونکە ئەو حەجەی منداڵی جێی حەجی گەورەیی بۆ ناگرێتەوە، ئەمەش وتەی سوفیانی سەوریو شافعیو أحمدو ئیسحاقە (رەحمەتی خوایان لێ بێت).[١]

**نۆیەم:**

ئەو کەسەی حەج بە منداڵەکەی دەکات دەبێت لە مەسەلەی (ئیحرام)دا گەورە چی دەکات ئەو منداڵەشی ئەوە بکاتو بەرگی ئیحرامی لەبەر بکات:

* عبداللەی کوڕی عمرو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێت) (منداڵانیان لەکاتی ئیحرامدا لە جلو بەرگ دادەماڵی، لەنێوان سەفاو مەروەدا تەوافیان پێ دەکردن)[٢]

**دەیەم:**

ئەگەر منداڵەکە فامو تەمیزی پەیداکردبوو، دەبێت فێری ئیحرام پۆشینو (لبیك اللهم لبیك) بکرێتو ئەگەر زۆر منداڵ بوو دەبێت کەسەکەی لەباتی ئەو ئەو کارانەی بۆ بکات:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەجمان کردوو ژنو منداڵمان لەگەڵدابوو، لەباتی منداڵەکان (لبیك اللهم لبیك)مان کردو ڕەجمی شەیتانمان کرد.[٣]

---

١ السنن (٣/٢٦٥).

٢ رواه إبن أبي شيبه (٢٧٥٧).

٣ رواه ابن أبي شيبه (٢٧٥٩) ابن ماجة (٣٠٣٨).

* عبدالملك لـە عـەتاوە دەگێڕێتـەوە کـە پرسـیاری لێکـرا دەربـارەی ئـەو منداڵـەی حـەجی پـێ دەکرێـتو خـۆی نازانێـت تەلبیـە بکـات؟ عـەطـا فـەرمووی: بـاوك یـان سەرپەرشتیارەکەی بۆی دەکات.[1]

* عـەتا (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: هـەر کاتێـك منـداڵ فـامی پەیداکردبوو، لەسەر باوكو کەسی واجبە فەرمانی تەلبیەی پێ بدەن.[2]

* بەغەوی (رەحمەتی خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: ئەگـەر هـاتوو منـداڵ عـەقلو فـامی تەمەنی خۆی هەبوو دەبێت بەخۆی ئیحرام بپۆشێت، بـەڵام ئەگـەر ژێـری هاوتەمـەنانی خۆی نەبوو ئەوە کەسەکانی ئیحرامی پێ دەپۆشنو لە جلەکانی دادەماڵرێتو لە بـۆنی خۆش دوور دەخرێتەوەو لە هەر شتێکیش گەورەی لێ دووربخرێتەوە.[3]

یازەهەم:

تەوافکردنی منداڵ

* (ابن منـذر) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: زاناکـان بـەکۆی دەنـگ دەڵێن: تەواف بە منداڵ دەکرێت.[4]

* (ابن قدامە) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: (تـەوافکردن بـە منـداڵ: ئەگـەر خۆی توانی با بە ڕۆیشتن بێتو ئەگەر نەیتوانی با بە باوەش یان بە سـواری وڵاخ (یـان لە هەر شتێکی تردا وەك عەرەبانەی ئەمڕۆ) تەوافی پێ دەکرێت چونکە (ابوبکر) (خـوا

---

١ رواه ابن ابي شيبه (١٧١٢) (٢٥٨٥) ابن ابي الدنيا في (العيال) (٦٥٤).

٢ إبن أبي الدنيا في (العيال) (٦٥٣).

٣ الشرح السنة (٢٣/٧).

٤ الاجماع لا ٧٠.

لێی ڕازی بێت) لە ناو پارچە پەڕۆیەکدا تەوافی بە (ابن الزبیر) کردووە (خوا لێی ڕازی بێت) چونکە تەوافکردن بە گەورەیش دروستە ئەگەر نەتوانێت بڕوات بەڕێوە، دەی منداڵ لە پێشترە، دەڵێ: جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی کە هەڵگرەکەی حەڵاڵی بێت یان بێگانە، ئیتر ئەگەر تەوافی فەرزی خۆی بکات یان نە، چونکە ئەم تەوافە بۆ هەڵگیراوە نەك هەڵگر، بۆیە دروستە بەسەر وڵاخێکەوە تەوافی پێ بکرێت، بە پێی نیەتی هەڵگرەکە بۆی دەنووسرێتو ئەگەر نیەتی تەواف پێکردنی نەبێت تەوافی بۆ نانووسرێت، چونکە نیەتی منداڵ دانامەزرێتو دەبێت گەورە نیەتی بۆ بهێنێ وەك ئیحرام پۆشین)[1]

**دوانزەهەم:**

زۆربەی زاناکان لەسەر ئەوەن کە چی لەسەر حاجی گەورە قەدەغەبێت حاجی منداڵیش لێی قەدەغەدەبێت:

* (عەتا) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: منداڵ دووردەخرێتەوە لە هەر شتێك گەورەی لێ دووردەخرێتەوە وەك بۆنی عەترو خۆجوانکردن.[2]

**سیازدەیەم:**

ئەگەر منداڵەکە کارێکی قەدەغەکراوی لەکاتی حەجدا ئەنجامدا لەباتیدا فیدیە دەدات:

* مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەوەی لە گەورە قەدەغە دەکرێت لە منداڵیش قەدەغەدەکرێتو بەڵام ئەگەر پێویست بوو هەندێك بۆنی خۆشی یان جوانکاری بەکاربهێنێ ئەوە لە بەرامبەردا (فدیە)ی بۆ دەدرێت.[3]

---

١ المغني (٥/٥٢-٥٣).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٢٧٥٨) وأبوداود (٧٧٦).

٣ المدونة (١/٤٢٤).

* بەغەوی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر منداڵەکە یەکێك لە قەدەغەکراوەکانی حەجی ئەنجامدا ئەوە ئەگەر خۆی ئیحرامی پۆشیبوو ئەوە لەپارەی تایبەتی خۆی فیدیەی دەدرێت، بەڵام ئەگەر حەجی پێ کرابوو ئەوە دوو ڕا هەیە کە ئایا لە پارەی خۆی یان لە پارەی سەرپەرشتیاری پارەی فیدیەکە دەدرێت.[١]

**چواردەیەم:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوخسەتی داوە بە منداڵان کە لە نیوەی شەودا دەتوانن لە موزدەلیفەوە بێنە خوارەوە:

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: من یەکێك بووم لەو منداڵانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی پێدام لەگەڵ ناتواناکاندا لە موزدەلیفەوە بێنە خوارەوە.[٢]

* (ابن قدامە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: نابینم کەس پێچەوانەی ئەم ڕایە بێتو هەروەها بەزەیی هاتنەوەی پێیانDای تێدایەو دورخستنەوەیانە لە قەرەباڵغیو جەنجاڵی، هەروەها شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).[٣]

**پانزەیەم:**

ئەگەر زۆر منداڵ بوو نەیدەتوانی شەیتان بەردباران بکات، لەباتی ئەودا سەرپەرشتیاری ئەو کارەی بۆ دەکات، بەڵام ئەگەر بتوانێت دەبێت خۆی ئەو کارە بکات:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەجمان ئەنجامداو ئافرەتو منداڵمان لەگەڵدا بوو، ئێمەیش لەباتی منداڵەکانیش تەلبیەو شەیتان بەردبارانمان کرد.[٤]

---

١ شرح السنة (٧/٢٣-٢٤).

٢ رواه البخاري (١٦٧٨).

٣ المغني (٥/٢٨٦).

٤ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە.

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە هەموو ئەو زانایانەی من گوێم لێیان بووە بیستوومە کە ئەو منداڵەی توانای ڕەجمی شەیتانی نیە، ڕەجمی بۆ دەکرێتو ابن عمریش (خوا لێی ڕازی بێت) وای کردووەو عەتاو زوهەریو مالیكو شافیعیو ئیسحاقیش ئەم بۆچوونەیان هەیە.

لە (ابن عمر)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: حەجی بە منداڵەکانی دەکرد، هەر منداڵێك خۆی بیتوانیایە ڕەجمی شەیتان بکات خۆی دەیکرد، هەر منداڵێکیش نەیتوانیایە ئەوە بە خۆی لەباتی ئەو ڕەجمەکەی شەیتانی دەکرد.[1]

* (أيوب السختياني) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: کوڕێکی عبدالرحمنی کوڕی قاسمم بینی لە کاتی حەجدا وتم: ئەمە چۆن حەجی پێ دەکەن؟ وتیان: بەردەکان دەخەینە دەستی، ئەگەر نەیتوانی بیوەشێنێ بۆی دەوەشێنین.[2]

شانزەیەم:

ئەگەر منداڵەکە نەیدەتوانی ڕەجمی شەیتان بکات ئەوە سەرپەرشتیارەکەی بۆی دەکات، بەڵام بە ئامادەبوونی منداڵەکە نەك لە حەوانگە بەجێ بهێڵرێت:

* عەتا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەگەر منداڵەکە زۆر منداڵ بوو فێریش بکرێت هەر نەیزانی ڕەجم بکات، دەبێت ببرێت بۆ شوێنی ڕەجمکردنەکەو لەوێ بێت وەك چۆن دەبرێت بۆ عەرەفەو ئەمیش وەك ئەو وایە مەگەر نەخۆش بێت.[3]

---

١ المغني (٥/٥٢).

٢ رواه ابن ابي شيبه (١٧١٠).

٣ رواه ابو داود في (المسائل) (٧٧٤).

**حەڤدەیەم:**

ئەگەر حەجی تەمەتوع یان حەجی قیرانی پێ دەكرا، ئەوە حەیوانەكەی بۆ سەر دەبڕدرێت:

* زوهەری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو منداڵەی كە حەجی پێ دەكرێت پرسیاری لێ كرا؟ فەرمووی: بەڵێ حەجی پێ دەكرێتو هەر شتێك لە حاجی قەدەغەبێت لەویش قەدەغە دەكرێت لە جلو بەرگو بۆنی خۆشو سەری داناپۆشرێت، خزمەكانی ڕەجمی شەیتانی بۆ دەكەنو حەیوانی بۆ سەردەبڕن.[١]

**هەژدەیەم:**

ئەگەر منداڵەكە هەر ئەركێكی حەجی پەڕاندو بەجێی نەهێنا دەبێت قەزای بۆ بكرێتەوە.

* عەتا (رەحمەتی خوای لێ بێت): هەموو شتێكی حەج بۆ منداڵ قەزا دەكرێتەوە جگە لە نوێژكردن نەبێت.[٢]

**نۆزدەیەم:**

تەوافی ماڵئاوایی كردن بە منداڵان:

* عەتا (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: منداڵی بچوك ئەگەر كەسو كارەكەی حەجیان لەسەر دانا، دەبێت چی لەسەر حاجیەكی گەورەیە لەسەر ئەویش بێت، لە بۆنی خۆش بێ بەش دەكرێت، نابێت ببرێتەوە تا دوا مەنزڵی تەواف پێكردنی نەبێت بەدەوری كەعبەی پیرۆزدا، ئەگەر خزمەكانی ویستیان عەمرەشی پێ بكەن لەدوای حەجەكە بۆی هەیە.[٣]

* * *

---

١ رواه ابن ابي الدنيا في (العيال) (٦٥١).

٢ رواه أبوداود في (المسائل) (٧٨٠).

٣ رواه أبوداود في (المسائل) (٧٧٦).

# فەرموودەی چواردەیەم

## کوشتنی منداڵی کافران لە جەنگدا

عن عبدالله بن عمر (رضی الله عنهما) قال: ان إمراة وُجدت في بعض مغازي النبي (ﷺ) مقتولة، فانكر، فنهى رسول الله (ﷺ) عن قتل النساء والصبيان)).

واتە: عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازیبێت) دەفەرموێ:ئافرەتێکیان بەرچاو کەوت لە غەزایەکدا کوژرابوو،پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕازی نەبوو، فەرمانی دەرکرد بە قەدەغەکردنی کوشتنی ژنانو منداڵان)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

بوخاری (٣٠١٤) لە باسی کوشتنی منداڵ لە جەنگدا هێناویەتی، موسلیم (٤٥٦٨) أبو داود (٢٦٦٨) لە باسی کوشتنی ژناندا، تورمذی (١٥٦٩)و ابن ماجە (٢٨٤١) ڕیوایەتیان کردووە.

### ئەو فەرمانو وانانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە بەرگریو قەدەغەدەکات لە کوشتنی منداڵ لەناو غەزاکاندا:

* (ابن عبدالبر)دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە (ﷺ) کە قەدەغەی کردووە ژنان ومنداڵان لە جەنگدا بکوژرێن وەك (ابن عباس)و (عائشە)و (ابوسعیدالخدری)و (أنس)و (أسودی کوڕی سەریح) وکەسانی تریش (خوایان لێ ڕازی بێت)٠

زاناكان هەموو لەسەر ئەوە كۆكن‌و تەنانەت پێشیان وایە ئەگەر ژن‌و منداڵ شەڕیش بكەن هەر ناكوژرێن چونكە بە عادەت ئەو دوو دەستەیە شەڕناكەن، خوای (عزوجل)یش دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ﴾.[1]

دووەم:

لە گرنگی دانی پێغەمبەر (ﷺ) بە كاری نەكوشتنی ژنان‌و منداڵان ئەوەبوو ئامۆژگاری ئەمیرو سەركردەكانی سوپای دەكرد بۆ ئەو مەبەستە:

* سلیمانی كوڕی بەریرە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هەركاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمیرو سەركردەی سریەیەكی دەخستەڕێ، ئامۆژگاری دەكرد بەوەی لە خوابترسێت‌و چاكبێت لەگەڵ سەربازانی ئیسلامداو پاشان پێی دەفەرموو: ((اُغزوا باسم الله وفی سبیل الله، قاتلوا من كفر بالله، اُغزوا ولا تغلوا ولا تغدروا ولاتمثلوا ولا تقتلوا ولیدا...)).[2]

واتە: بەناوی خواوەو لەپێناوی خوادا بجەنگن، شەڕبكەن لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان بە خوا نیە، غەزا بكەن بەلأم دزی لەدەستكەوت مەكەن‌و ناپاكی مەكەن‌و جەستە مەشێوێنن، منداڵ مەكوژن...))

سێیەم:

ئەو هۆیانەی كە بوونەتە هۆی قەدەغەكردنی كوشتنی منداڵ لە جەنگدا ئەمانەن:

١-لەڕاستیدا لەسەر فیترەی پاك لەدایك بوون كە موسڵمانەتیە وەك پێشترباسمان كردووە.

٢-زۆرجار منداڵ لەبەر ناتوانایی‌و لاوازیەكەی شەڕكەرنین‌و حیسابی شەڕكەریان بۆ ناكرێت.

---

١ سورەتی البقرە(١٩٠).

٢ رواة مسلم (٤٥٤٢) وابن ابی شیبة(١٤٠٦٤)

چوارەم:

بەلأم ئەگەر مندالأن لەگەڵ هۆزەکەیاندا جەنگیان دەکرد یان هاوکاریان دەکردن لەجەنگ دژی موسلمانان دەبێت بکوژرێن:-

* حەسەنی بەسری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هاوەلأنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنانو منداڵی بێ باوەڕانیان دەکوشت ئەگەر هاوکاری جەنگی سوپاکەی خۆیانیان کردبێت).[١]

* (ابوداود) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم لێبوو لە احمدی کوڕی حەنبەلیان پرسی دەربارەی منداڵێك شەڕ بکات لەدژی موسڵمانان: ئایا دەکوژرێت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی ئەگەر لە قەلأکەوە بەردی دەگرتە سوپای موسڵمانەکان؟ فەرمووی: هەر دەکوژرێت).[٢]

*(إبن عبدالبر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زاناکان جیاوازیان هەیە لە کوشتنی ئەو ژنو مندالأنەی کە شەڕدەکەن :

جمهوری زانایان وەك سەوری و ئەوزاعیو لەیسو شافیعیو أبوحنیفەو أحمدو ئیسحاقو أبوثورو کەسانی زۆری تریش پێیان وایە کە ئەگەر ژنو منداڵ شەڕ نەکەن بەهیچ جۆرێك دروست نیە بکوژرێن بەپێی فەرموودەکە (واللهاعلم).[٣]

پێنجەم:

ئایا ئەگەر گومان هەبوو لە منداڵیو باڵقبوونی ئەو منداڵە بێ باوەڕەدا چی دەکرێت؟

* ڕیشی دەرکردبوو ئەوە گەورەیە، عطيةالقرضي دەڵێ: من یەکێك بووم لە دیلەکانی بەنی قورەیزە، موسڵمانەکان دەیانڕوانی هەر منداڵێك ڕیشی کردبێت بە

---

١ رواة إبن أبى شيبة(١٤٠٨٥).

٢ رواة أبو داود في المسائل (٥١٩).

٣ التمهد(١٣٨/١٦)، (شرح السنة) بغوى(٤٧/١١).

گەورە لەقەڵەمیان دەداو دەكوژرا، من خۆم یەكێك بووم لەوانەی مووم لێ نەهاتبوو نەیان كوشتم.

لە ڕیوایەتێكی تردا دەڵێ: سەیری بەریان كردم دەبینن موی لێ نەهاتووە بەڕەڵایان كردم).[1]

شەشەم:

زاناكان جیاوازیان هەیە دەربارەی كوشتنی ژن‌و منداڵ بەهۆی دان بەسەری سوپای كافراندا لەشەودا:

ڕاستترینیان ئەوەیە كە دروستە لەو كاتەدا ژن‌و منداڵیش بكوژرێن چونكە دەستپارێزی زۆر ناڕەحەتە لەوجەنگەدا:

* (صعب)ی كوڕی(جثامە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە ناوچەی ئەبواء یان بوددان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لام‌و لەوێ پرسیاری لێ كرا دەربارەی هێرشی شەوانی كتوپڕی‌و كوشتنی ژن‌و منداڵەكانیان؟ لە وەڵامدا فەرمووی:((هم منهم)) واتە ئەوانیش لەوانن، گوێم لێ بوو فەرمووی: ((لاحمی الا لله تعالی ولرسوله (ﷺ)).[2] واتە: پاراستن نیە مەگەر بۆ خواو پێغەمبەرەكەی نەبێت.

* أحمدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (دروستە بدرێت بەسەر كافراندا لە شەودا، بۆ ڕۆم لە ڕێگەی ئەو كارەوە تێك شكان، دەڵێ: پێ نازانم كەسێك كاری دان بەسەری دوژمنان لە شەودای پێ ناخۆش بێت)[3]

حەوتەم:

چۆن ئەم دوو بۆچوونە دەخەینەیەك: نابێت منداڵ بكوژرێت! و بەڵام شەو بدرێت بەسەر بێ باوەڕاندا ئەوانیش دەكوژرێن!

---

١ رواه أبوداود (٤٤٠٤) و(٤٤٠٥) والترمذي (١٥٨٤) وقال: حديث حسن صحيح.

رواه البخاری (٣٠١٢) ومسلم (٤٥٧٢) بلفظ (لوان خيلاً اغارت من الليل، فأصابت من أبناء ٢المشركين؟ قال: هم من اباهم).

٣ المغني (١٣/١٤٠).

بۆ وەڵامدانەوەی ئەمە زانایان دەڵێن ئەگەر بە ئەنقەست (عمد) بیکوژێت تاوانبارەو دروست نیە بەڵام لەگەڵ هۆزەکەیدا دروستە چونکە بۆ ئەو ناچن بەڵام ئەویش پێوەدەبێت:

* أحمد (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر بە ئارەزوو بیکوژێت دروست نیە واتە بە ئەنقەست)[1] بەڵام لە حاڵەتەکانی تردا کوشتنیان دروستە.[2]

هەشتەم:

دروستە تۆپبارانی سوپای بێ باوەڕان بکرێت (مەنجەنیق) ئیتر با منداڵو ژنیش تێدا بچن، ئەگەر ئەو بۆردوومانە پێویست بێت، ئەمە ئەگەر بێ باوەڕان لەنێوان ژنو منداڵدا خۆیان حەشاردابوو دروستە بۆردومان بکرێت چونکە ئەگەر بەبۆنەی ئەوانەوە هیچ هەنگاوێك نەنرێت ئەوە کاری جیهاد پەکی دەکەوێت:

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەنجەنیقی تاودا بۆ شاری تائیف، عەمری کوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێت) مەنجەنیقی تاودا بۆ خەڵکی ئەسکەندەریەی میسر...

* سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هیچی تێدانیەو دروستە قەڵای سوپای بێ باوەڕان تۆپ باران بکرێت ئیتر با منداڵیشی تێدابێت.

* مالیكو شافیعیو أحمدو کەسانی تریش ئەم بۆچوونەیان هەیە.[3]

نۆیەم:

دیلکردنی منداڵانی بێ باوەڕان دروستە لەلایەن سوپای ئیسلامەوە:

---

١المغني (١٣/١٤٠).

٢ سنن أبي داود (٣/١٢٤) و سنن الترمذي (١٧٥٠).

٣ المغني (ابن قدامة) (١٤٠).

* ئەبی سەعیدی الخدری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: خەڵکی قورەیزە بە حوکمی سەعدی کوڕی موعاز (خوا لێی ڕازی بێت) ڕازی بوون و پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کردو پێی فەرموو: ((هؤلاء نزلوا على حكمك)) ئەوانە بە حوکمی تۆ ڕازین، سەعیدیش فەرمووی: جەنگاوەرەکانیان ڕەمی بکەن و منداڵەکانیشیان بکەن بە دیل و ژێردەستە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((قضيت بحكم الله)) واتە: بە حوکمی خوا حوکمت کرد، یان فەرمووی ((بحكم الملك)) بە حوکمی پادشای جیهان حوکمت کرد.[١]

* * *

١ رواه بخاری (٣٠٤٣) ومسلم (٤٦١٨).

## فەرموودەی پازدەیەم

## هاوسەرگیری منداڵان

عن عائشة (رضي الله عنها) ((ان النبی (ﷺ) تزوجها وهي بنت ست سنين، وأُدخلت عليه وهي بنت تسع سنين، ومكث عنده تسعاً)).

واتە: عائیشە دایکی باوەڕداران (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە تەمەنی شەش ساڵیدا مارەی کردو لە تەمەنی نۆ ساڵیدا گواستیەوە، نۆ ساڵیش لەگەڵیدا ژیاوە).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

بوخاری (٥١١٣٣) لە باسی بەشودانی منداڵان لەلایەن باوکیانەوە ڕیوایەتی کردووە، مسلم (٣٤٦٤) و (أبو داواد) (٢١٢١)و ابن ماجه (١٨٧٦).

### ئەو فەرمان و ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم:

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە پیاوی بەتەمەن کچی گەنج مارە بکات، چونکە کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) عائیشەی مارەکرد تەمەنی لە (٤٥) ساڵیدا بوو، کەچی عائیشە (٦) ساڵان بوو لە نۆ ساڵیدا گواستیەوە.

دووەم:

ئەم حوکمەش تایبەتە نیە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بەڵکو هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) لەدوای خۆی کاریان پێ کردوەو نەوەکانی دواتریش‌و کۆدەنگی زانایان لەسەر دروستی پرۆسەکەیە.

* عەکریمە دەڵێ: عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) (ام کلثوم)ی کچی (عەلی کوڕی ئەبوطالب) (خوا لێی ڕازی بێت) مارەکرد کە لەو کاتەدا کچێکی بچکۆلەبوو لە کۆڵان لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد.

هاوڕێکانی هاتن بۆلای‌و پیرۆزباییان لێ کرد ئەویش فەرمووی: من لەبەر حەزی ژن هێنان ئەم کارەم نەکردووە بەڵکو خۆم لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ان كل سبب ونسب منقطع يوم القيامة الا سببي ونسبي))

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هۆکاری پەیوەندیو خزمایەتی نامێنێ جگە لە هۆکاری پەیوەندیو خزمایەتی من نەبێت، بۆیە منیش حەزم کرد لەنێوان منو پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پەیوەندی خزمایەتی هەبێت.[1]

* عوروەی کوڕی زوبێر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: زوبێری کوڕی عەوام (خوا لێی ڕازی بێت) چوو بۆ سەردانی قودامەی کوڕی مەضعون کە نەخۆش بوو لەجێگەدا کەوتبوو، لەوکاتەدا مژدەیان هێنا بۆ زوبێرو وتیان کیژێکت بووە، هەر لەوێدا قودامە وتی: مارەی بکە لە من!

زوبێر فەرمووی: دەی کچێکی بچوکت بۆ چیە؟ ئەویش وتی: ئەگەر مام ئەوە بەختەوەرم بە کچی زوبێرو ئەگەر مردیشم ئەوە کچی زوبێر خۆشەویستترین کەسمە میراتیەکەم دەبات، زوبێریش لێی مارەکرد.[2]

* ابن منذر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کۆدەنگی زانایان نقل دەکات لەسەر ئەوەی بۆ باوك دروستە کچی بچوکی خۆی بدات بە شوو ئەگەر بە کەسی شیاوو شایستەی بدات.[3]

سێیەم:

ئەگەر کچێکی بچوك درا بە پیاوێکی گەورە، هیچ مەسرفێکی ناکەوێتە سەر ئەو پیاوە هەتا وای لێ نەیەت بۆ گوێزانەوە بشێت، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفەقەی عائیشەی نەکێشا تا لە ماڵی باوکیدا بوو واتە تا دوو ساڵ دوای مارەبڕین:

* عەتاو شەعبیو حەسەنو کەسانی تریش پێیان وایە کە پیاو نەفەقەی ناکەوێتە سەر هەتا نەیگوێزێتەوە.[4]

* أحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەگەر پیاو ژنی هێناو ژنەکە نەیدەهێشت بیگوێزێتەوە ئەوە نەفەقەی لەسەر نیەو ئەگەر هۆی نەگوێزانەوە پیاوەکە بوو ئەوە نەفەقەی لەسە واجبە. ئەگەر کچەکە منداڵ بوو تا

١ رواه عبدالرزاق (١٠٣٥٤) والحاكم (٦٤/٧) إسناده صحيح.

٢ رواه سعيد بن منصور في سننه (٦٣٩).

٣ الاجماع لا (١٠٣) الأشرف (٣٧/٤).

٤ رواه عنهم ابن ابي شيبه (٢١٥/٥-٢١٦).

تەمەنی نۆ ساڵی نەفەقەی لەسەر پیاوەكە نیە، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) عائیشەی لە تەمەنی ٩ ساڵیدا گواستەوە.[١]

* (ابن هانيء) دەڵێ: لە احمدی كوڕی حەنبەلم پرسی: ئەگەر ئافرەتە گەورەبوو بەڵام كوڕەكە منداڵ بوو نەفەقە لەسەر كێیە؟

لە وەڵامدا وتی: ئەگەر نەگوێزانەوەكە خەتای كوڕەكە بوو، ئەوە نەفەقەی لەسەر واجبە، ئەگەر كوڕەكە تێگەیشتوویبوو بەڵام كچەكە منداڵو بێ ئاوەزابوو، ئەوە نەفەقەی لەسەر كوڕەكە نیە تا گەورە دەبێت.[٢]

چوارەم:

ئەگەر پیاوێك كچێكی بچوكی خواستو پەلەی گوێزانەوەی دەكرد، بە دزی كەسو كارەكەیەوە چووە لایو زیرەی پێ كردو مرد، دەڵێ: دەبێت خوێنەكەی بە تەواوی بدات چونكە پێش ئەوەی ئەو كچە بگاتە تەمەنی خۆگری ئەو كارەی پێ كردووە.[٣]

پێنجەم:

ئەگەر بووكو زاوا هەردووكیان منداڵ بوون:

* سولەیمانی كوڕی یەسار دەڵێ: (ابن عمر) (خوایان لێ ڕازی بێت) كچی عبیداللەی برای كە منداڵ بوو هێنا بۆ كوڕەكەی خۆی ئەویش منداڵ بوو، لەو كاتەدا مارەیی بۆ دیاری نەكرد.[٤]

* هیشامی كوڕی عورِوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: باوكم ژنی بۆ كوڕێكی هێنا كە تەمەنی (٦) ساڵان بوو، كچەكەش (٥) ساڵان بوو، پاشان كوڕەكە مرد، نزیكەی (٤) هەزار دینار لە میراتی كوڕەكەی دا بە كچەكە.[٥]

---

١ احكام النساء (١٥٤).

٢ رواه ابن هانيء في مسائله (١٠٤٦).

٣ رواه عبدالرزاق (١٨١٠٣)

٤ رواه سعيد بن منصور في سنن (٩٤٥).

٥ رواه عبدالرزاق (١٠٣٥٩) وسعيد بن منصور في سننه (٧٧٥).

شەشەم:

ئایا باوك دەتوانێت ژن بهێنێت بۆ کوڕی بچکۆلەی؟ بەڵێ:

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: هەموو زانایانی سەلەف لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دروستە ژن بهێنێ بۆ کوڕی منداڵی.[١]

* دیسان دەڵێ: أحمد (رەحمەتی خوای لێ بێت) بەڵگەی دروستی ئەو کارە بە فەرموودەکەی (ابن عمر) دەهێنێتەوە کە ژنی بۆ کوڕەکەی هێناو کوڕەکەشی منداڵ بوو، مەسەلەکەیان بردە بەردەستی زەید (خوا لێی ڕازی بێت)و ئەویش فەرمووی دروستە.[٢]

حەوتەم:

سەلەفی صالح وایان پێ خۆش بووە کە ئەگەر (وەلی) کوڕو کچی منداڵیان دا بە یەکتری مەسەلەکە بە نهێنی بهێڵنەوەو ئەو دووانە خۆیان نەزانن بە مەسەلەکە تا مەسەلەکە بە سوك سەیر نەکاتو تەڵاق نەیەت بە دەمیدا.

* ئیبراهیمی نەخەعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: منداڵەکانیان دەدا بە شوو یان ژنیان بۆ دەهێنان بەڵام لە خۆیانیان دەشاردەوە نەوەك وشەی تەڵاق بەکاربهێنن.[٣]

* هەروەها لە عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوا لێی ڕازی بێت)و زەحاکی کوڕی موزاحیمەوە گێڕاویانەتەوە.[٤]

هەشتەم:

کچی هەتیو بەزۆر نادرێت بەشوو بەڵکو پرسی پێ دەکرێت:

* (ابو موسى) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((تستأمر اليتيمة في نفسها، فإن سكتت، فقد أذنت، وان أبيت لم تكره))

---

١ الاجماع لا (١٠٣).

٢ الاشراف (٣٨/٤).

٣ رواه ابن ابي شيبه (٣٥/٥) وسعيد بن منصور (١٧١١).

٤ ابن ابي شيبه في (مصنف) (٣٥/٥).

واتە: كچی هەتیو (بێ باوك) بۆ شووكردن پرسی پێ دەكرێت، ئەگەر بێ دەنگ بوو ئەوە ڕازیەو ئەگەر نەیكرد زۆری لێ ناكرێت.

* تورمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: زانایان جیاوازیان هەیە لە مەسەلەی بەشوودانی كچی بێ باوكدا: هەندێكیان دەڵێن دەدرێت بەشوو بەڵام نیكاحەكە دانامەزرێت تا گەورە دەبێت پرسی پێ دەكرێت، ئەو كاتە ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە باشە، ئەگەر پێی خۆش نەبوو دەتوانێت هەڵیوشێنێتەوە، ئەمە ڕای تابیعینەكانە.

هەندێكی تریش دەفەرموون: دروست نیە بدرێت بەشوو هەتا گەورە دەبێت، چونكە پەشیمان بوونەوە لە نیكاح نیە، ئەمەش وتەی: سوفیانی سەوریو شافیعیو كۆمەڵێ زانای تریشە.

ئەحمدو ئیسحاق دەڵێن: ئەگەر (بێ باوك) تەمەنی گەیشتە (٩) ساڵیو درا بە شوو، ڕازیش بوو بەشوو، نیكاحەكە دەمەزراوە، دوایی بۆی نیە پاشگەزبێتەوە لێی، بەڵگەشیان فەرموودەكەی عائیشەیە (خوا لێی ڕازی بێت) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە تەمەنی (٩) ساڵیدا گواستیەوەو دەڵێت: هەر كاتێك كچ گەیشتە نۆ ساڵان ئەوە ژنە.[1]

نۆیەم:

قەڵەوكردنی كچی بچوك بە مەبەستی بەشوودانی:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (دایكم ویستی قەڵەوم بكات بۆ كاتی گوێزانەوەم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام ئەو شتانەی ئەو داوای لێ دەكردم بۆم نەكرد، بەڵام چێشتی شلەی كولەكەی چەوری پێدامو زۆر جوانو قەڵەو بووم)[2]

دەیەم:

جوانكردنو ڕازاندنەوەی كچان بۆ ئەوەی داوا بكرێن:

لە ڕێنموونیەكانی سەلەفی صالحە ڕازاندنەوەو جوانكردنی كچانو بردنیان بۆ ماڵی خزمەكانیان تا دڵیان بچێتە سەریانو بیانخوازن،بەلام ئەگەر نزیكی بالق بوونو پێگەیشتن بوونەوە نابێ جوان بكرێن بۆ خەڵك مەگەر لەبەردەمی ئافرەتاندا ئەمەش بۆ ئەوەیە كە خۆیشیو گەنجەكانیش سەرگەردان نەكات:

---

١ رواه الترمذي في السنن (٣/٤١٧).

٢ رواه أبو داود (٣٩٠٣) وابن ماجة (٣٣٢٤) اسناده صحيح.

* عائیشه (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێت) کەوتو سەری دای بە کەناری دەرگاکەداو سەری شکا، پێغەمبەر (ﷺ) بە عائیشەی فەرموو: ((أمیطی عنه الاذی)) واتە: خوێنو پیسیەکەی پاك بکەرەوەو بیسڕەوە، منیش قێزم لێ کردو نەچووم، پێغەمبەری خوا (ﷺ)خۆی چوو خوێنەکەی دەمو چاوی بە زمانی مژیو دەیفەرموو: ((لو کان أسامة جاریة لکسوته وحلیته حتی أنفقه))[1] واتە: ئەگەر ئوسامە کچ دەبوو سەرتاپا جلی جوانو خشلو زێڕم پێدا دەکرد.

* (بەهی) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئوسامەی کوڕی زەیدی فەرموو: ((قد أحسن الله بنا اذ لم یکن اسامة جاریة، ولو کانت جاریة لحلیناك، حتی یرغب فیك))[2]

واتە: خوا چاکەی لەگەڵ کردووین کە ئوسامە کچ نەبوو، ئەگەرنا ئەوەندە خشڵو زێڕم پێدادەکردی کە خەڵکی بیانخواستیتایە.

* (أبو حازم) لە سەهلی کوڕی سەعد (ساعدیەوە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: کچێکی بچوکی بینی زۆر جوان ڕازاندبوویانەوەو جوانیان کردبوو ئەویش بانگی کردو سەیرێکی کردو کردی بە باوەشەوەو دەستی هێنا بە سەریداو دووعای بەرەکەتی بۆ کرد.[3]

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) کچێکی ڕازاندەوەو جوانی کردو بردی بۆ حەجو تەوافی کەعبەی پێ کردو دەیووت: (لعلنا نصطاد بە شباب قریش)[4] واتە: بەڵکو لاوێکی حاجێلی قورەیشی پێ ڕاو بکەم.

* (إبن جریج) دەڵێ: بۆیان باس کردووم کە عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) دەیفەرموو: ئەو کچەی کە باڵغ نەبووە پیشانی خەڵکی بدەن تا لە پاشەڕۆژدا ئامۆزاکانی داوای بکەنو بیخوازن.[5]

* * *

---

١ رواه أحمد في (السنن) إبن ماجة (١٩٧٦) واسناده حسن.

٢ رواه إبن أبي الدنيا في (العيال) (٢٣٠) و له شاهد مرسل قويّ في الطبقات (٦٢/٤).

٣ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە.

٤ رواه إبن أبي شيبه (٤١٠/٤).

٥ رواه عبدالرزاق (١٠٣٣٤).

## فەرموودەی شازدەیەم

## منداڵ داری حەدی لێ نادرێت

عن علي بن طالب (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قـال: (( رُفِـعَ الْقَلَـمُ عَـنْ ثَلَاثَـةٍ: عَـنِ النَّـائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبَرَ وَعَنِ المَجْنُوْنِ حَتَّى يعقل))

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

(أبـو داود) (٤٣٩٨) (٤٣٩٩) ڕیوایـەتی کـردووەو (النـسائی) (٣٤٣٢)و (الترمـذی) (١٤٢٣) دەڵێ: فەرموودەیەکی حەسنی غەریبە، (الـدارمی) (٢٣٤٢) و (ابـن خزیمـە) لـە (صـحیح)ەکەیـدا (١٠٠٣)و (ابـن حبـان) (١٤٢-١٤٣) و الحـاکم (٢٥٨/١) (٥٩/٢) بـە (صـحیح)ی لەقەڵـەم داوەو (البیهقـی) لـە (الـسنن الکـبری) (٨٣/٣) فەرموودەیـەکی صحیحە.

ابن تیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە (مجموع الفتاوی) (١٩١/١١) دەڵێـت: هـەموو ئەهلی زانستو زانیاری لەسەر ئەوەن کە ئەم فەرمودەیە قبوڵکراوە.

### ئەو فەرمانو ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم:

ئەم فەرموودەیە بنەمایەکە لەو بنەما سەرەکیانەی زۆربەی ئەحکامو ئادابی منـداڵی لەخۆگرتووە.

دووەم:

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت: کە منداڵ تا باڵق نەبێت گوناهی بۆ نانوسرێت.

سێیەم:

چەندان دەقی قورئانو فەرموودە لەسەر ئەوەن کە منداڵ هەر کردەوەیەکی چاکەو خواناسی دەکات بۆی دەنووسرێت:

* (ابن خزیمە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: حەجکردنی منداڵان لـەپێش بـاڵق بوونـەوە واجـب نیـە، بـە بەڵگـەی وتـەی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) ((رفـع القلـم عـن ثـلاث))

مەبەستی لە قەڵەمی گوانە نووسینە کە لەسەر کەسێکی باڵق دەنووسرێت، ئەوە ناگەیەنێت کە قەڵەمی چاکەی لەسەر لادەبرێتو بۆی نانووسرێت.[١]

* (ابن عبدالبر) دەڵێت: عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (تكتب للصبيّ حسناته، ولاتكتب عليه السيئات) واتە: مندالٚ کردەوەی چاکی بۆ دەنووسرێتو لە کردەوەی خراپ گوزەشت دەکرێت.

سەلەف لە کۆنو ئێستادا حەجیان بە منداڵەکانیان کردووەو پیشانی ڕەحمەتی خوایان داون.[٢]

* (أبوداود) بە سەنەدی خۆی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مروا الصبي بالصلاة اذا بلغ سبع سنين واذا بلغ عشر فاضربوه عليها)) واتە: فەرمانی نوێژکردن بەسەر منداڵەکانتاندا بدەن لە تەمەنی حەوتساڵیداو لە تەمەنی دە ساڵیدا لێیان بدەن لەسەر نەکردنی.

هەروەك نوێژکردنی بۆ دەنووسرێت، نوێژنەکردنی لەسەر نانووسرێتو حەجکردنی بۆ دەنووسرێت بەڵام لەسەری فەرز نەکراوەو حەجی فەرزی لەسەر دەمێنێت.

زۆرێك لە زاناکان پێیان وایە ماڵی هەتیو زەکاتی دەکەوێتو مەحاڵە پاداشتی چاکەی لەسەر وەرنەگرنەوە، بەڵکو قەڵەمیان لەسەر هەڵگیراوە لە کردنی گوناهو سەرپێچیەك کە خۆیان پێی هەڵسابن، ئەی نابینن هەر سامانێك لەناوبەرن پێیان دەبژێردرێتو هەروەها لە مەسەلەی کوشتنو خوێندا، بە عەمدیش کەسێك بکوژن بە هەڵە (خطأ) بۆیان دەنوسرێتو خوێنەکەی لەسەر ئەوانەیە کە خوێنی گەورەکان دەبژێرن.

چوارەم:

زانایان ئەم فەرموودەیە دەهێننەوە لەسەر بەڵگەی ئەوەی کە منداڵ هەستێت بە هەر کارێك لەو کارانەی داری حەدیان لەسەرە، حەدی لێ نادرێت وەك زیناو دزیو هتد.

---

١ صحيح ابن خزيمة (٣٤٩/٤).

٢ الاستذكار (٣٩٨/٤).

* (إبن جريج) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: عبدالعزيزی کوڕی عمر ئاگاداری کردم کە لە نامەیەکی عمری کوڕی عبدالعزيزدا کە لە عمری کوڕی خطابەوە دەستی کەوتبوو تیایدا نووسیبوی: (نە تۆڵەسەندنەوەو نە کوشتن‌و نە لێدانی داری حەد هەیە لە برینداركردندا، تۆڵەسەندنەوەو لێدانی منداڵ نیە ئەوانەی کە نەگەیشتوونەتە حەدی بالقبوون تا وایان لێ دێت بزانن ئیسلام چی بۆ داناون‌و چیشی لەسەر داناون).[١]

* سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت): (تۆڵە ناکرێتەوە مەگەر لە کەسێك بالّق بووبێت، فەرموودە هاتووە لەسەر ئەمە)[٢]

زیاتر لە یەك کەس کۆدەنگی زانایانی لەم بارەیەوە بۆمان گواستۆتەوە.[٣]

پێنجەم:

تەمێکردنی منداڵ:

هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە منداڵ ئەگەر یەکێك لەو کارانەی ئەنجام دا کە داری حەدی لەسەرە، ئەوە سزایەی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە وازی لێ دەهێنرێت‌و سزا نادرێت لەسەر کارە چەپەڵ‌و هەڵەشەکانی، بەڵکو لە ئیسلامدا سزای –تەعزیر–ی هەیە کە منداڵەکەی پێ تەمێ دەکرێت– لەسەر ڕای هەموو زانایان.[٤]

شەشەم:

ئەگەر منداڵ تاوانێکی کرد کە شایستەی داری حەدبوو، بەڵام گومان هەبوو لە باڵقبوونیدا چی لێ دەکرێت؟

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) منداڵێکیان هێنایە بەردەستی کە دزی کردبوو، بەڵام باڵقبوونی ڕوون نەبوو، بۆیە بە بست پێوای‌و ئەوەندەی پەنجەیەکی کەمتر بوو، دەستی نەبڕی‌و بەرەڵای کرد).[٥]

---

١ رواه عبدالرزاق (١٨٠٦٤).

٢ رواه عبدالرزاق (١٨٠٦٧).

٣ الاستذكار (٨/٥٦–٥٧). المغني (١١/٤٨١) .

٤ سەيری (منهاج السنة) بكە (٦/٤٩) ابن تيمية.

٥ رواه ابن أبي شيبه (٨٢٠٤).

* عبداللەی كوڕی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر منداڵ كارێكی وای كرد شایانی داری حەد بێتو گومان هەبوو لە گەورەبوونیدا، سەیری بەری بكەن بزانن مووی كردووە یان نا)[١] واتە ئەگەر وابوو ئەوە گەورەیەو منداڵ نیەو حەدی خوای لێ دەدرێت.

* محمدی كوڕی یەحیای كوڕی حەبان دەڵێ:كوڕێكی لاساریان هێنایە خزمەت عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) كە بە شیعرەوە قسەیەكی زۆر ناشیرینی بە ژنێك وتبوو بە جۆرێك كە دەیووت وام لەگەڵیدا كردووە! عمر فەرمووی: شەرواڵەكەی لابەنو سەیری عەورەتی بكەن، ئەوانیش سەیریان كرد دەبینن مووی لێ نەهاتووە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر مووی لێ بهاتایە داری حەدم لێ دەدا،[٢] واتە حەدی (قذف).

حەوتەم:

منداڵ بە ئەنقەستو بەویستی خۆی تاوانێكی كرد، لەبەر منداڵیەكەی حوكمی (خطأ)و هەڵەی دەدرێت بەسەرداو تۆڵەی لێ ناكرێتەوە.

* پێشەوا (الزهری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (سوننەت هەر وابووە كاری (عمد)و بە ئەنقەستی منداڵ بەهەڵە بۆی دادەنرێت)[٣]

* پێشەوا (مالیك) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەوەی كە هەموومان لەسەری كۆكین ئەوەیە كە منداڵان لەنێوان خۆیاندا تۆڵەیان لێ ناكرێتەوە، كارە ئەنقەستەكانیان بە هەڵە ژمار دەكرێت لەسەریان، مادام باڵق نەبوونو داری حەدیان لەسەر واجب نەبوبێت، منداڵ هەر كەسێك بكوژێت بە كوشتنی هەڵە بۆی هەژمار دەكرێت.[٤]

* (ابن عبدالبر) دەڵێت: (تۆڵەكردنەوە نیە لەنێوان منداڵاندا، ئەمەش جێگای جیاوازیو ناكۆكی نیە لەنێوان زانایاندا).

واتە: كاری بە ئەنقەستی منداڵ بە هەڵە دادەنرێتو خزمو هۆز خوێنەكەی بۆ دەدەن، ئەو منداڵەی كە هەڵەی لەسەر تۆمار دەكرێت منداڵێكە تەمیزی پەیداكردبێتو

---

١ السنن الكبرى (بيهقي) (٦/٥٨).
٢ رواه ابن ابي شيبه (٨٢٠٣)، والبيهقي في (الكبرى) (٦/٥٨).
٣ رواه عبدالرزاق (١٨٠٦٨).
٤ الموطأ (٢/٨٥٢).

بە ئەنقەستیش كردبێتی‌و ئەگەر وانەبێت منداڵی شیرەخۆرە یان تازە پێگرتووە هەرچییەك بكات لێی ناگیرێت‌و وەك گیانلەبەرێك (پشیلە)یەك وایە زیانێكی دابێت هەروا دەڕوات).[١]

منیش دەڵێم: ئەگەر منداڵێك دای لە كەسێك‌و ئەندامێكی لەشی قرتاند، یان كەسێكی كوشت، ئیتر فامدار بێت یان نەفام تۆڵەی لێ ناكرێتەوە لە دروستترین وتەی زانایاندا، بەڵام خوێنەكەی واجبە‌و دەبێت لە پارەی خۆی خوێنەكەی بدرێت، بەڵام ئەگەر خوێنەكەی لە (٣/١)ی خوێن زیاتر بوو، دەبێت خزمەكانی بچنە ژێر ئەو پارەیە كە هەموو خزمەكانە لەلای باوكیەوە (عصبە)و هەروەك چۆن ئەگەر خوێنی تەواوبوو هەر ئەوان دەیدەن چونكە لە هەموو حاڵەتێكدا بە هەڵە بۆی دەنووسرێت).

هەشتەم:

منداڵ كاتێك زیانێكی ماڵی بە كەسێك دەگەیەنێت:

ئەگەر ئەو كارە منداڵەكە بە حەزی خۆی‌و بە ئەنقەست كردبێتی‌و كەمتەرخەمی خاوەن ماڵەكەی تێدا نەبوو، ئەوە دەبێت لە ماڵی منداڵەكە ببژێررێت، لەسەر ڕای هەموو زانایان.

* (ابن تیمیە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموێت: ((رفع القلم عن الصبي حتى يحتلم)) مەبەست لەوەی قەڵەمی تاوانی لەسەر هەڵدەگیرێت نەك قەڵەمی بژاردن ئەمەش بەكۆی دەنگی هەموو موسڵمانان، كە ئەگەر كەسێك بكوژن یان ماڵێك بەزایە بدەن دەبێت بیبژێرن، لەسەر ئەوەش كۆكن كە –شێت‌و منداڵ– لەپارەی خۆیان زیانیان دەبژێرن وەك مەسروفكردن وایە بەڵام لە زەكاتدا جیاوازیان هەیە).[٢]

* (ابن قیم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پەیوەستكردنی نێوان ماڵ بەزایەدان‌و بژاردن وەك پەیوەستكردنی حوكمەكانە بە هۆكارەكانەوە، ئەوەش

---

١ الاستذكار (ابن عبدالبر) (٨/٥٦–٥٧).

٢ منهاج السنة (٦/٤٩).

پێداویستیەکی دادپەروەریەو بەرژەوەندی بەوە نەبێت نایەتەدی، هەروەك چۆن پێویستی کردووە لەسەر کوشتنی هەڵە خوێنەکەی، بۆیە تەمەنو باڵغبوون دەوری نیە تیایداو شێتو منداڵو خەوتویش هەرچی بەزایە بدەن پێیان دەبژێرریێت، ئەمەش لەو یاسایانەیە کە بەبێ ئەو یاسایانە بەرژەوەندی خەڵکی تیادەچێتو ئەگەر پێیان نەبژێردرێت ئەوە خەڵکی هەندێکیان ماڵو سامانی ئەوانی تر لەناودەبەنو دەشڵێن: بە هەڵە کردمو مەبەستم نەبوو زیانی لێ بدەم).[١]

بەلام ئەگەر کەمتەرخەمیو دەستی خاوەن ماڵەکەی تێدابوو، وەك ئەوەی خۆی بە ئەمانەت لەلای دایناوو یان بە قەرز پێی دابوو یان پێی فرۆشتبوو، لە وتەی دروستی زانایان منداڵەکە تاوانبار نیەو پێی نابژێردرێت، چونکە هەڵسوکەوتو مامەڵەی لەگەڵ منداڵدا کردووە بە هەموو ڕەزامەندیەکەوە والله أعلم.

* سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەگەر کاڵایەکت بە ئەمانەت لەلای منداڵێك داناو ئەویش سوتاندنی، ئەو منداڵە هیچی لەسەر نیە، بەڵکو تۆ خۆت فەوتاندووتە کە داوتە دەستی منداڵان)[٢]

نۆیەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە (لەشکران بوون) نیشانەی باڵقبوونو گەورەبوونە.

* * *

---

١ اعلام الموقعين (٢/١٥٧–١٥٨).

٢ رواه ابن المقرى لە (معجم)دا لا(٣٥١).

## فەرموودەی حەڤدەیەم

## منداڵ کەی میراتی دەکەوێت

عن جابر بن عبدالله والمسور بن مخرمة (رضي الله عنهم) قالا: قال رسول الله ((لاَ يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخًا))، قال: وَاسْتِهْلاَلُهُ: أَنْ يَبْكِيَ أَو يَصِيحَ أَوْ يَعْطِسَ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

إبن ماجه (٢٧٥١) و (ابن ابی الدنيا) لە (العيال) (٤١٣)داو (الطبرانی) (٢٠/٢٠-٢١)(٢٣) ڕیوایەتیان کردووەو فەرموودەیەکی صەحیحە.

### ئەو فەرمان و ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە کۆرپە ئەگەر بە زیندوویی لەدایك بوو بەشە میراتی دەکەوێت، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەش کە دەفەرموێت:

* (أبو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((إذا استهل المولود وُرِّثَ))[1] واتە: هەر کاتێك منداڵ نیشانەی زیندوویی پێوە دیار بوو لەکاتی لەدایکبووندا ئەوە بەشە میراتی دەکەوێت.

* (أبو عبيد) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: استهلال واتە: دەرکەوتنی ژیان مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە نیشانەیەکی وای لێ دەربکەوێت لەکاتی لەدایکبووندا کە بەڵگەی ژیانی بێت.

دووەم:

(بە هاواری دەنگی منداڵ دەڵێن (استهلال) لەڕاستیدا خەڵکی کە مانگ دەبینن هاوار دەکەن، هەر بەو شێوەیەش خەڵکی گوێیان لە دەنگی منداڵەکە دەبێت بۆ یەکەم جار هەموو لە خۆشیاندا هاوار دەکەن).[2]

---

١ رواه أبوداود (٢٩٢٠) و(ابن ماجة) (٢٧٥٠) واسناده صحيح.

٢ المغني (١٨١/٩).

سێیەم:

زانایان لەسەر ئەوە یەكن: كە منداڵ ئەگەر بە گریان یان هاوار یان پـژمین نیـشانەی ژیانی لێ دەركەوت میراتی دەبات‌و میراتیشی لێ دەبرێت چونكە ئەم نیشانانە تـەنها لـە زیندووەو دەردەچێت.

چوارەم:

زانایـان لـە مەسـەلەی جوڵـەی منداڵـدا جیاوازیـان هەیـە كـە ئایـا بەڵگـەی ژیـانی كۆرپەلەیە كە میراتی بكەوێت‌و لێی ببرێت بەو هۆیەوە؟

ئەوەی دروسـتە (صـحیح) لـەلای زۆربـەی زاناكـان ئەوەیـە كـە جگـە لـە (اسـتهلال) جووله و هیچ شتێكی تر دەوری نیەو كاری پێ ناكرێت وەك چۆن فەرموودەكـەی جـابر (خـوای لێ ڕازی بێـت) ئـەوەی دەگەیانـدو ئـەوەش دەقێكـەو نـاكۆكی نـاهێڵێ، مانـای فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ((إذا اسـتهلَّ المولـود وُرِّثَ)) واتـە ئەگـەر ئیـستهلالی كـرد میرات دەبات مانای وایە ئەگەر ئیستهلال نەكات میرات نابات..

ئەمە ڕای (إبن عباس)و حسن كوڕی عەلی‌و أبوهریرەو جابر (خوایان لێ ڕازی بێـت)و هەروەها لە تابعین: سەعیدی كوڕی موسـەیب‌و عـەتاو شـوڕەیح‌و حـسن‌و ابـن سـیرین‌و نەخەعی‌و شەعەبی‌و ڕەبیعە یەحیای كوڕی سەعیدو (أبو سـلمە)ی كـوڕی عبـدالرحمن‌و مالـك‌و أبوعبیـدو ئیـسحاق‌و أحمـدیش لـە ڕای مەشـهوریدا (ڕەحمـەتی خـوا لـە هـەر هەموویان بێت).[1]

لە بەرامبەردا ئەم ڕایەی جمهوری زانایاندا ڕایەكیش هەیە كە دەڵـێ جوڵـە جێگـەی ئیـستهلال دەگرێتـەوە، ئەمـەش بۆچـوونێكی لاوازە چـونكە جووڵـە جـاری وا هەیـە مردویش دەیكات‌و گۆشت دەخزێت بە تایبەت لـە جێیـەكی تەسـكەوە بـچێتە جێیـەكی فراوان دەجووڵێ‌و مەرجیش نیە زیندو بێت نازانێت ئایا ئـەم جوڵەیـە هـی زیندوویەتیـە یان وەك چۆن هەندێك گۆشت لەپاش سەربڕینی حەیوانەكەش پل دەدات‌و دەجوڵێ.[2]

١ سەیری (مصنف)، ابن أبي شیبه بكە (١١/٣٨٢-٣٨٥). المغني (٩/١٨٠-١٨١).

٢ مصنف عبدالرزاق (٣/٥٢٩-٥٣٣).

پێنجەم:

وەك پێشتر باسی حوکمی نوێژی لەبارچوومان کردو (صحیح) وایە ئەگەر گیانی تێ کەوتبوو کە دوای چوار مانگو دە ڕۆژ لە سکی دایکیدا بێت نوێژی لەسەر دەکرێت.

*　　*　　*

## فەرموودەی هەژدەیەم

## خەرجی منداڵان

عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: دخلت هند بنت عُتبة (إمراة أبي سفيان) (رضى الله عنهما) على رسول الله (ﷺ) فقالت: يارسول الله ، ان أبا سفيان رجل شحيح، لايعطيني من النفقة مايكفيني ويكفي بنيَّ، الا ماأخذت من ماله بغير علمه، فهل عليّ في ذلك من جناح؟ فقال رسول الله (ﷺ): ((خُذِى مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِى بَنِيكِ))

واتە: عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سفیان (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و عەرزی کرد کە ئەبوسفیان پیاوێکی ڕەزیلە (بخیل)و ئەوەندەم پێ نادات بەشی خۆمو منداڵەکانم بکات مەگەر بە دزی خۆیەوە لێ ببەم، ئایا گوناهبار دەبم؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە شێوەیەکی جوان پارەی لێ ببە ئەوەندەی بەشی خۆتو منداڵەکانت بکات).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە (٦/٣٩،٥٠،٢٠٦)و بوخاری (٥٣٦٤)و (٥٣٧٠)و موسلیم (٤٤٩٧) دەقەکەش هی ئەوە، و أبوداود (٣٥٣٢)و ابن ماجه (٢٢٩٣)و الدارميّ (٢٣٠٥).

### ئەو فەرمانو ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە لەسەر پیاو واجبە خەرجو مەسروفی منداڵەکانی بکێشێت، (الدرامي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسێکی ناوناوە (باسی خەرجی پیاو بۆماڵو منداڵەکانی) و هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن.

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە ژیاندنی منداڵی بچوك لەسەر باوکەکە پێویستە ئەوانەیان خۆیان پارەیان نیە.[١]

دووەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە پیاو ئەگەر کەمتەرخەمی‌و چرووکی کرد لە مەسروف‌و خەرجی منداڵەکانی ئەوە بۆ خێزانەکەی هەیە بەبێ پرسی خۆی لە پارەکانی ببات‌و بەپێی پێویست خەرجی بکات بۆ خۆی‌و منداڵەکانی.

سێیەم:

مەسروف‌و خەرجی ماڵ‌و منداڵ گەورەترین خێرە‌و بەرزترین بەندایەتیە کە مرۆڤ لە قیامەتداو لەلای پەروەردگاری پاداشتی چاکەی دەدرێتەوە لەسەری:

* (مقدام)ی کوڕی (معَدي) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما أطعمت نفسك فهو لك صدقة، وما أطعمت ولدك فهو لك صدقة، وما أطعمت زوجتك فهو لك صدقة، وما أطعمت خادمك فهو لك صدقة))[٢]

واتە: ئەو خواردنەی بەخۆتی دەدیت خێرت بۆ دەنووسرێت لەسەری، ئەو خواردنەی بە منداڵەکەتی دەدیت خێرت دەگات لەسەری، ئەو خواردنەی بە خێزانتی دەدیت بۆ تۆ دەبێتە خێرو چاکە، ئەو خواردنەشی دەدیت بە خزمەتکارەکەت بۆ تۆ دەبێتە خێرو چاکە.

* (ثوبان) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((أفضل دينار ينفقه الرجل، دينار ينفقه على عياله..))[٣].

---

١ الاجماع لا(١١٠).

٢ رواه أحمد (٤/١٣١) والبخاري في (الادب المفرد) (٨٢،١٩٥) اسناده صحيح.

٣ رواه مسلم (٢٢٧٣).

واتە: باشترینو گەورەترین پارەیەك كە پیاو خەرجی بكات، ئەو دینارەیە كە بۆ ماڵو منداڵەكەی خەرج دەكات.

* (أبو قلابە)یش لەسەر ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت: لە ماڵو منداڵەوە دەست پێ دەكات، دەی چ پیاوێك لەوە بەڕێزترو گەورەترە كە سامانی خەرج دەكات بۆ بەخێوكردنی منداڵە بچوكەكانیو لە دەست پانكردنەوە دەیانپارێزێتو بە خاوێنی دەیان هێڵێتەوە.

* (أبو هريرە) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((دينار أنفقته في سبيل الله، ودينار أنفقته في رقبة، ودينار تصدقت به على مسكين، ودينار أنفقته على أهلك، أعظمها أجراً الذي أنفقته على أهلك))[1]

واتە: دینارێك لە پێناوی خوادا خەرجی بكەیتو دینارێك بەندەیەكی پێ ئازاد بكەیت، دینارێك بدەیت بە هەژارێك، دینارێك بۆ ماڵو منداڵەكەتی خەرج بكەیت، گەورەترین پاداشت لەلای خوا بۆ ئەوەیە كە لە پێناوی منداڵەكانتدا خەرجی دەكەیت.

* دایكی باوەڕداران (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ژنێكی هەژار كە دوو منداڵی پێبوو هات بۆ لامو منیش (٣) دەنكە خورمام پێدان، ئەویش یەكی دانەیەكی پێدانو ئەوان ئەوەی خۆیان خوارد، ئەویش ویستی ئەوەی خۆی ببات بۆ دەمیو بیخوات، كەچی گەڕاندیەوەو كردی بە دوو لەتەوەو یەكی لەتێكی دا پێیان، من زۆر سەرسام بووم بەو كارەی، پاشان بۆ پێغەمبەری خوام گێڕایەوە (ﷺ) ئەویش فەرمووی: ((ان الله قد أوجب لها بها الجنة أو اعتقها بها من النار))[2]

واتە: خوای عزوجل بەهۆی ئەم كارەیەوە بەهەشتی پێ دەبەخشێت یان لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێت.

---

١ رواه مسلم (٢٢٧٤).

٢ رواه مسلم (٦٧٨٧).

* مسلم دەڵێ: من لە بازار گەڕامەوە (معاویە)ی کوڕی (قرة)م پێ گەیشت لێی پرسیم: چیت دەکرد لەوێ؟ وتم: شتو مەکم بۆ ماڵو منداڵەکەم کڕی، فەرمووی: بە حەلاڵ دەستت کەوتووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (لأن اغدو فيما غدوت به كل يوم، أحبُّ اليَّ من أن أقوم الليل وأصوم النهار)[1]

واتە: ئەوەی تۆ بۆی ڕۆیشتوویت من هەموو ڕۆژێك بۆی بڕۆم پێم خۆشترە لەوەی بە شەو شەونوێژ بکەمو بە ڕۆژیش بەڕۆژووبم.

* (عبدالقوی) دەڵێ: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم نامەی نووسی بۆ (عبّاد)ی کوڕی (کثیر) لە مەککەو پێی وت: تەوافو حەجو سەفاو مەروەت وابزانە سەرخەو شکاندنێکی موجاهیدێکە لەپێناوی خوادا، ئەویش لە وەڵامدا بۆی نووسی: ئێشکگریو غەزاو جیهادەکەت وابزانە سەرخەو شکاندنێکی کاسبی کارێکە بۆ بەخێوکردنی ماڵو منداڵەکەی.[2]

* (سوفیانی سەوری)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (عليك بعمل الابطال، الكسب من الحلال والانفاق على العيال)[3] واتە: کردەوەی پاڵەوانەکان ئەنجام بدە: کردنی کاسبی حەلاڵو خەرجکردنی لەپێناوی ماڵ منداڵ.

* ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: گریانی منداڵ لەبەر دەستی باوکیدا بۆ پارەو خواردن خۆشترە لەلای خوا لە هەر شتێکی تر ببیێت لەبەر دەستیدا.[4]

---

١ رواه أبو نعيم في (الحلية)دا (٢/٣٠٠٠٠).

٢ رواه أبو نعيم في (الحلية)دا (٨/١٩).

٣ رواه الخطيب (الجامع الراوي واداب السامع) (٤٨).

كتاب الورع (٤٢٩). (الاء الصبي بين يدي أبيه متسخطاً يطلب منه خبزاً، أفضل من كذا زكذا

٤يراه الله بين يديه).

چوارەم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە گوناهباری داناوە ئەو كەسانەی پارەو خواردن لە ماڵو منداڵیان دەگرنەوە:

* عبداللەی كوڕی عەمر (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((كفى بالمرء اثماً أن يحبس عمَّن يملك قوته))[١] واتە: بەسە مرۆڤ ئەوەندە گوناهی هەبێت كە پارە بگرێتەوە لە ماڵو منداڵەكەیو مەسروفیان نەكات.

پێنجەم:

لە ڕەوشتی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام ئەوەبوو منداڵەكانیان لەناوبردووەو دەیانكوشتن لەبەر ئەوەی خەرجیان نەكێشن.

* خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾[٢] واتە: منداڵەكانتان مەكوژن لە ترسی هەژاری، ئێمە ڕۆزی ئەوانیشو ئێوەش دەدەین، كوشتنی ئەو منداڵانە تاوانێكی زۆر گەورەیە.

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (املاق) واتە هەژاری، لەترسی فەقیریو نەبوونی منداڵەكانیان لەناودەبرد.[٣]

* عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ تاوانێك گەورەترین گوناهە؟ فەرمووی: ((أن تجعل لله نداً وهو خلقك)) واتە: هاوبەش پەیدابكەیت بۆ خوا كە دروستی كردوویت، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((ان تقتل ولدك خشية أن يأكل معك)) واتە: منداڵەكەت بكوژیت لە ترسی ئەوەی لەگەڵت نان

---

١ رواه مسلم (٢٢٧٥).

٢ الاسراء (٣١).

٣ (طبري) لە تەفسیرەكەیدا ڕیوایەتی كردووە (٨/٨٢).

بخوات، وتم: ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((أن تزني حليلة جارك)) واتە: زیناکردن لەگەڵ کچی دراوسێکەت.[١]

* عەلی کوڕی بەکار دەڵێ: پیاوێك سکاڵای خۆی هێنا بۆ لای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رەحمەتی خوای لێ بێت) وتی: چیم لێ دەکەی منداڵم زۆرەو فریایان ناکەوم؟ ئیبراهیم فەرمووی: ئەی برای خۆم، کام لەو منداڵانەی لە ماڵەکەی تۆدان و ڕزقیان لەسەر خوا نیە بینێرە بۆ ماڵەکەی من.[٢]

*   *   *

---

١ رواه البخاري (٦٠٠١) ومسلم (١٧١).

٢ رواه البيهقي له (شعب الايمان)دا (١٣٣٣)ء (ابن عساكر في تأريخه) (٦/٣٤٥).

## فەرموودەی نۆزدەهەم

## شیرپێدانی منداڵان:

عن أبي امامة الباهلي (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((بَيْنَا أنَـا نَـائِمٌ إِذْ أتَانِي رَجُلَانِ فَأَخَذَا بِضَبْعَيَّ فَأتَيَا بِي جَبَلاً وَعْرًا فَقَالاَ لِيَ : اصْعَدْ حَتى إذَا كُنتُ في سَواء الجَبَل، فَإِذَا أنَا بِصَوت شَدِيد، فَقُلْتُ: مَا هَذه الأصْوَاتُ قَالُوا : هَذَا عُوَاءُ أهْـلِ النَّـارِ ، ثُـمَّ انْطُلِقَ بِي فَإِذَا أنَا بِقَوْمٍ مُعَلَّقِينَ بِعَرَاقِيبِهِمْ، مُشَقَّقَةٌ أشْدَاقُهُمْ، تَسِيلُ أشْدَاقُهُمْ دمًا، فقُلْـتُ : مَنْ هَؤُلَاءِ فقيل: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يُفْطِرُونَ قَبْلَ تَحِلَّة صَوْمِهِمْ، ثُـمَّ انْطُلِـقَ بِـي فَـإذَا بِقَـومٍ اشدّ شَيىءٍ إنتِفَاخاً، وانتنهُ رِيحاً، وَاسوئه منظراً، فَقُلتُ مَنْ هَؤُلَاءِ ؟قيلَ: الزانون وَالزَوانـي، ثُـمَّ انْطُلِقَ بِي فَإِذَا بِنسَاءٍ تنهش ثَديهنَّ الحيّات، فَقُلتُ مَا بَال هؤلاء؟ قيلَ هَؤُلاء اللاتي يَمنعنَ أولادهُنّ البَانهنّ، ثُمَّ انطُلِقَ بِي فإذَا أنا بِغلمَان يَلعَبُون بَينَ نَهرَين، فَقُلتُ مَن هَؤُلاء؟ فقيل هؤلاء ذَراري المُؤمنِين، ثُم شرف بي شرفاً، فإذَا أنَا بِثَلاثَة يَشربُونَ مِن خَمر لَهُـم، فَقُلـتُ: مَن هؤلاء؟ قَالُوا: هذَا ابرَاهِيم وَمُوسَى وَعِيسَى وَهُم يَنتَظِرُونك)).

واتە: (أبو امامە الباهلی) (خوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: گـوێم لـە پێغەمبـەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: لە خەودابووم‌و دوو کەس هاتن‌و قۆڵیان گرتم‌و بردمیان، تا گەیاندمیانە لای کێوێکی زۆر سەخت‌و لێژ، پێیـان وتم: ئـادەی سـەرکەوە بەسـەر ئـەو کێوەداو تا سەرەوە نەوەستی، منیش گوێم لە هاوارو ناڵەیەکی زۆربوو، پرسـیم: ئەمـە هاواری کێیە؟ وتیان: ئەمە هاوارو ڕۆڕۆی جەهەننەمیەکانە! پاشان بردمیـان‌و گەیـشتم بە کەسانێك بە پاژنەی پێ هەڵواسرابوون‌و کاکیلەیان دوو کەرت کرابـوون‌و خوێنیـان لێ دەچۆڕا، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەمانە ئەو کەسانەن کـە پـێش وادەی خـۆی ڕۆژوو دەشکێن.

پاشـان بردمیـان‌و کەسـانێکی تـرم بینـی زۆر ئاوسـابوون‌و بۆنیـان نـاخۆش بـووو چـێرەیان زۆر تـاڵ بـوو، وتم: ئەمانـە کـێن؟ وتیـان: ژنـان‌و پیـاوانی شـەرواڵ پـیس‌و

زیناکەرانن. پاشان بردمیان تا گەیشمە کۆمەڵێك ئافرەت کە مار پەلاماری مەمکەی دەدان‌و بۆی دەڕنین! وتم: ئەی ئەمانە چیان کردووە؟ وتیان: ئەمانە ئەو ئافرەتانەن کە نەیان هێشتووە کۆرپەکانیان مەمکیان بمژن‌و شیر بخۆن.

پاشان بردمیان تا کۆمەڵێك منداڵم بینی لەنێوان دوو ڕووباردا یاریان دەکرد وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەمانە منداڵانی موسڵمانانن (بە منداڵی مردوون) هەر کتوپڕ سێ کەسم کەوتە بەرچاو عەرەقیان دەخواردەوە (عەرەقی پاك) وتم: ئەی ئەمانە کێن؟ وتیان: پێغەمبەر ابراهیم‌و موساو عیسان‌و چاوەڕوانی هاتنی تۆ دەکەن (سەلامی خوایان لەسەر بێت).

## دەرهێنانی فەرموودەکە:

ابن خُزیمه (١٩٨٦) و ابن حبان (٧٤٩٤)و الطبرانی لە (المعجم الكبير)دا (٨/١٥٥-١٥٧) و الحاكم (١/٤٣) بەکورتی ئەمانە ڕیوایەتیان کردووە حاکمیش دەڵێ: لەسەر مەرجی مسلم صحیحەو فەرموودەکەش ئیسنادەکەی صحیحە.

## ئەو فەرمان‌و ئادابانەی فەرموودەکە دەیبەخشێت:

یەکەم:

لە فەرمودەکەدا هەڕەشەیەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە ناهێڵن کۆرپەکانیان شیریان بخۆن.

**مەسەلەیەك:** شیرپێدانی منداڵ لەسەر کێ واجبە؟ زاناکان لەمەدا جیاوازیان هەیە، ئەوانەی دەڵێن واجبە لەسەر دایك شیر بدات بە منداڵەکەی ئەم فەرمودەیە بە بەڵگە دەهێننەوە، هەروەك ئەم ئایەتەش دەهێننەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾[1].

---

[1] البقرة (٢٣٣).

بەڵام جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە فەرز نیە لەسەر دایك شیربدات بە کۆرپەکەی مەگەر لە سێ حاڵەتدا نەبێت:

١- کەسی تر نەبێت شیری پێ بدات، هیچ هۆکارێکی بەدەستەوە نەبێت بۆ شیر پێ نەدانەکە.

٢-کەسی تر هەبێت بەڵام منداڵەکە شیری کەسی تر نەخوات.

٣- نە کۆرپەکەو نە سەرپەرشتیارەکەشی توانای مادی شیرپێدانیان نەبێت لەلایەن دایەنەوە.

بە ئایەتێکی قورئانیش بەڵگە لەسەر قسەکەی خۆیان دەهێننەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾[١] ئەوەتا خوای گەورە زۆری لێ نەکردووە کە هەر دەبێت شیر بدات بە منداڵەکەی.

* (ابن قدامه) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (شیرپێدانی منداڵ لەسەر باوکە، بۆی نیە زۆر لە دایکەکە بکات کە شیر بە منداڵەکەی بدات ئیتر با کەنیزەك بێت یان ئافرەتی سەربەست، ژنی خۆی بێت یان تەلاقدراو، ئەگەر تەلاق دراو بێت ئەوە لەسەر ڕای هەموو زانایان لەسەری نیە شیری پێ بدات، لەلای ئێمەش ئەو ژنەشی لەلای پیاوەکەیە هەر زۆری لێ ناکرێتو (الثوری)و (الشافعی)و (أصحاب الرأی) لەسەر ئەم ڕایەن.

بەڵام لەلای (إبن أبی لیلی)و (حسن بن صالح) پێیان وایە دەتوانێت زۆر لە ژنەکەی بکات بۆ شیرپێدانی، (الثوری) لە وتەیەکیداو (مالك)یش لە ڕیوایەتێکیدا هەروا دەڵێن. چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾.

پێشەوا (مالك) (رەحمەتی خوای لێ بێت) ڕایەکی نێوانی هەیە کە دەڵێت: ئەگەر ئافرەتەکە لە ئاست بەرزو شەریفەکان بوو، وێنەی ئەو شیری بە منداڵ نەدەدا ئەوە

---

[١] الطلاق (٦).

نابێت زۆری لێ بکرێت بەڵام ئەگەر ئافرەتێکی ئاسایی بوو هاووێنەکانی شیریان دەدا بە کۆرپەکانیان ئەوە بۆ مێردەکەی هەیە زۆری لێ بکات.

بەلام لای ئێمە ئەو ئایەتە وەڵامی ئەمانە دەداتەوە کە لەسەری فەرز نیە ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾ واتە ئەگەر نەتوانرا با کەسێکی تر شیری پێ بدات). نەتوانین واتە ناکۆکی نێوانیان...)[1]

دووەم:

ئەو حوکمانەی لەکاتی شیرپێداندا ئافرەتەکە دەگرێتەوە:

١- ڕۆژووی لەسەر لادەچێت لەو ڕۆژانەدا کە شیر دەدات بە کۆرپەلەکەی:

* ئەنەسی کوڕی مالك لە پیاوێك لە وەچەکانی عبداللەی کوڕی کەعبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ سوارەکانیدا دایان بەسەر ناوچەکەماندا و من ڕۆیشتم بۆلای و دەبینم نان دەخوات، پێی فەرمووم: (إدن فكل) وەرە لێم نزیك ببەوە نانم لەگەڵدا بخۆ منیش وتم: بەڕۆژووم، فەرمووی پێم: (أدن احدثك عن الصوم، ان الله تعالى وضع عن المسافر الصوم وشطر الصلاة، وعن الحامل والمرضع الصوم) واتە: وەرە نزیك بەرەوە با دەربارەی ڕۆژ بۆت باس بکەم، خوای تەعالی ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردووە لەگەڵ نیوەیەکی نوێژەکانو هەروەها لەسەر ئافرەتی سکپڕو شیردەر ڕۆژووی هەڵگرتووە.

دەڵێ: سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردووکیانی فەرموو، ئای داخەکەم بۆ چی لە خواردنی بەردەستی پێغەمبەرم نەخوارد!.[2]

* (ترمذي) دەڵێ: زانایان بەم فەرموودەیە کاریان کردووە.[3]

---

١ المغني (١١/٤٣٠)، (إبن أبي شيبه) و (الاشراف على مذاهب العلماء) إبن منذر (٤/١٥٠-١٥١).

٢ رواه احمد (٤/٣٤٧) والترمذي (٣١٥)و دەقەکەی هی ئەوەو دەڵێ فەرموودەیەکی (حسن)ە

٣ السنن، ترمذي (٣/٩٥).

٢-جێ بەجێ نەکردنی حوکمی زینا لەسەر ئەو ئافرەتەی کە کۆرپەی شیرەخۆرەی هەیە، تا لە شیر دەبڕێتەوە:

وەك لە فەرموودەکەی (أبو بردە)دا (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە لەسەر ئەو ئافرەتەی کە دانی بەوەدا نا کە زینای کردووەو داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە ڕەجمی بکاتو خاوێنی بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((فاذهبي حتى تلدي)) واتە: بڕۆرەوە بۆ ماڵ تا سکەکەت دەبێت، دوای ئەوەی منداڵەکەی بوو، پێچای بە پەڕۆیەکەوەو هێنایەوە خزمەت سەروەر (ﷺ) وتی: ئەوەتا منداڵەکەم بوو!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((اذهبي فارضعيه حتى تفطميه))[1] واتە: بڕۆرەوە شیری پێ بدە تا لە شیر دەبڕێتەوە) ژنەکە پاش ماوەیەك هاتەوەو پارچە نانێکی دابوو بە دەستی کۆرپەکەیەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەتا لە شیرم براندۆتەوەو نان دەخوات، پێغەمبەریش (ﷺ) منداڵەکەی دایە دەستی پیاوێك، بۆ ژنەکەش فەرمانی دا چاڵێکیان هەڵکەند بۆی تا سنگی دەهات، فەرمانی دا بە خەڵکەکە تا ڕەجمی بکەنو ئەوانیش ڕەجمیان کرد...

٣-دروستە لە ماوەی شیرداندا پیاو بچێتە لای خێزانی (الغيلة):

* (جذامة)ی کچی (وهب الاسديه) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوای بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لقد هممت ان انهى عن الغيلة حتى ذكرت ان الروم وفارس يصنعون ذلك فلا يضر أولادهم))[2].

واتە: هات بەبیرمدا کە (غیلة) قەدەغە بکەم بەڵام بیرم کردەوە کە ڕۆمو فارسەکان ئەو کارە لەگەڵ خێزانەکانیان دەکەنو زیانیشی نیە بۆ منداڵەکانیان، وازم لەو بیرە هێنا.

---

١ رواه أحمد (٥/٣٤٨) ومسلم (٤٤٥١).

٢ رواه مسلم ٣٤٥٤.

* سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێی وت: من ناچمە لای خێزانم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((لم تفعل ذلك؟)) واتە: بۆچی وا دەکەیت، پیاوەکەش وتی: بەزەییم بە کۆرپەکەیدا دێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لو كان ذلك ضارًا، ضرَّ فارس والروم...))[1] واتە: ئەگەر ئەوە زیانی هەبوایە (بۆ منداڵ) ئەوە زیانی لە فارسو ڕۆمەکان دەدا، چونکە ئەوان وایان دەکرد.

٤- دایك دەتوانێت لەکاتی نوێژدا شیر بدات بە منداڵەکەی بە مەرجێك مەمکی دەرنەکەوێت:

* حەسەنو ئیبراهیم نەخەعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێن: ژن دەتوانێت شیر بە کۆرپەکەی بدات لەکاتی نوێژدا.[2]

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: زاناکان جیاوازیان هەیە لەو مەسەلەیەدا (واتە شیرپێدانی منداڵ لە نوێژدا):

١- (اوزاعی) جارێك دەڵێ نوێژەکەی ببڕێتو جارێك دەڵێت ئەگەر پێویست بوو قەیناکات دروستە.

٢-(أبو ثور) دەڵێ: ئەگەر مەمکەکانی دەرنەکەوێت نوێژەکەی دروستە.[3]

سێیەم:

ماوەی تەواوی شیرپێدانو حوکمی لەشیر بڕانەوەی منداڵ پێش ئەو وادەیە:

ماوەی شیرپێدانی تەواو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾[4] واتە: دایکان بۆ ماوەی دو ساڵی تەواو شیر دەدەن بە منداڵەکانیان.

---

١ رواه مسلم (٣٤٥٤).
٢ ابن رجب لە (فتح الفارس)دا (٤/١٤٤)دا دەڵێ اسنادەکەی صحیحە.
٣ الاوسط (٣/٢٧٨).
٤ البقرة (٢٣٣).

بەڵام لە شیر بڕانەوەی منداڵ پێش ئەو ماوەیە، ئەگەر بە ڕەزامەندی دایكو باوكەكە بوو ئەوە دروستەو گوناهی نیە وەك خوای (عزوجل) دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾[1].

* سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بە مشاوەرەو ڕەزامەندی هەردوولا بوو پێش دوو ساڵەکە ئەوە دروستە وەك خوا دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ﴾و بەڵام ئەگەر ژنەکە وتی: لە شیری دەبڕێنمەوەو پیاوەکەش وتی: نەخێر، ئەوە بۆ ژنەکە نیە لە شیری ببڕێنێتەوە.[2]

**مەسەلەیکی بەسوود:**

هەندێك لە سەلەفی صالح نەیانهێشتووە لەپاش دوو ساڵ شیر بدرێت بە منداڵ:

* (علقمە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) جارێکیان ئافرەتێکی بینی لەدوای دوو ساڵەکە هەر بەردەوام شیر بە منداڵەکەی دەدات پێی وت: بەسە شیری پێ مەدە ئیتر)[3].

* (ابن كثير)یش دەڵێت: باس کراوە کە شیردان بە منداڵ لەدوای دوو ساڵ زیانبەخشە بۆی چ لە ڕووی بەدەنیەوە یان لە ڕووی عەقڵیەوە.[4]

**سوودێکی دیکە**

* (ابن قيم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (پێویستە تا کاتی ددان دەرهاتن تەنها شیری پێ بدات چونکە لەو کاتەدا گەدەیان لاوازەو توانای هەرسکردنی خواردنی

---

١ البقرة (٢٣٣).

٢ (ابن جرير) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی (٢/٥٠٧).

٣ (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی (٢/٤٩٢).

٤ (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی (١/٦٣٥).

نیە، هەركە ددانی دەرهاتو گەدەی بەهێزبوو خواردنی پێ بدات چونكە حیكمەتی خوایی لەوەدایە كە ددان دەركردنی دوادەخات تا كاتی پێویستی بە خواردنەو بەزەییشە بە دایكەكەدا كە ددانی نیە گازبگرێت لەسەر گۆی مەمكەكانی دایكی)[١].

چوارەم:

منداڵ دانەدەست شیرپێدەری تر جگە لە دایكی خۆی:

عادەتی عەرەب وابووە لە سەردەمی نەفامیو ئیسلامیشدا كە منداڵەكانیان بنێرن بۆ لادێو بیدەنە دەستی دایان ئەمەش لەبەرئەوەی منداڵەكە ڕەسەن دەربچێتو مێشكی خاوێنو دوور لە تەمەڵی بێتو بەهۆی ژیانیان لەو لادێیانەدا زمانیان بە عەرەبی پاراو ڕادەهاتو دوور دەبوون لە (لحن) واتە: نەزانینی دەربڕینی وشەكان.

* ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ولد لي الليلة غلام فسميته باسم أبي ابراهيم)) واتە: ئەم شەو كوڕێكم بوو ناوم لێنا ابراهیم بە ناوی باوكم ئیبراهیم پێغەمبەرەوەو پاشان دایە دەستی (ام سيف) كە هاوسەرەكەی ناوی قەین بوو، ئەبو سوفیان پێی دەگوت: (قەین أبو سيف) بوو.[٢]

دیسان ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (كەسم نەبینیوە بەسۆزو میهرەبان بێت لەگەڵ ماڵو منداڵیدا بە وێنەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئیبراهیمی كوڕی لە دێیەكی سەروی مەدینە دابوویە دەستی دایەنێك، دەكەوتە ڕێ بۆ ئەویو ئێمەیش لەگەڵیدا دەچووین، كاتێك دەچوو ژوورەوە دەبینی پیاوەكە خەریكی ئاگر كردنەوەیە، منداڵەكەی هەڵدەگرت بە باوەشەوەو تێروپڕ ماچی دەكردو پاشان دەگەڕایەوە).[٣]

١ (تحفة المودود) لا(٣٨٨).

٢ مسلم گێڕاویەتیەوە (٦٠٤٥).

٣ مسلم ڕیوایەتی كردووە (٦٠٩٥).

* (ابن قیم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: پێویستە دایك لەدوای ڕۆژی دووەم یان سێیەم شیر بدات بە منداڵەكەی چونكە پێش ئەم كاتانە شیرەكەی خەستو خڵتەدارە، وەك شیری ئەو ژنە نیە كە دەگیرێت بۆی تا شیری پێ بدات وەك چۆن عەرەب منداڵەكانیان دەدایە دەستی دایەنەكانی بیابانئشینو پێغەمبەریش (ﷺ) درایە دەستی (حلیمە السعدیە) (خوا لێی ڕازی بێت).[١]

پێنجەم:

ئەو حوكمانەی تایبەتن بە شیرپێدانەوە جگە لە دایكی خۆی:

* (ابن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی كچەكەی حەمزەی مامی فەرموویەتی: ((لاتحل لي، یحرم من الرضاعة ما یحرم من النسب، هي بنت امي من الرضاعة))[٢]

* بزانە كە ئوممەت هەموو لەسەر ئەوەن حوكمی شیر خواردن پڕاوپڕ وەك حوكمی دایكایەتی نیە: بۆ نمونە میرات لە یەكتر نابەن، خەرجیان لەسەر یەكتر نیە، یاسای ئازادكردنی بەندە نایانگرێتەوە، خوێن بژاردنیان لەسەر نیە، شایەتیان بۆ یەك دروستە، بە كوشتنی یەكتری تۆڵەیان لێ دەكرێتەوە، بەڵكو دەستنوێژ نەشكاندنو سەیركردنو تێكەڵی یەكتر حەڵاڵ دەكات.[٣]

شەشەم:

١–دەبێت ئەو شیرپێدانە (٥) جاری جیاجیا بێتو تێری خواردبێت:

* (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: كە قورئان هاتە خوارەوە كاتی خۆی بە (١٠) دە جار شیرپێدانی تەواو حەرامی دەكرد، پاشان ئەو حوكمە سڕایەوەو

---

١ تحفة المودود لا(٣٨٨).

٢ بوخاری ڕیوایەتی كردووە (٢٦٤٥).

٣ الاعلام بفوائد عمدة الاحكام (١٣/٩).

بوو بە (پێنج) جاری تەواو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دنیا دەرچوو لە قورئاندا ئەم پێنج جارە کاری پێ کراوەو خوێندراوەتەوە.[١]

یەك جار یان دوو جار شیرپێدان حەرامی ناکات:

* (أُم الفضل) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پیاوێکی نەوەی عامیری کوڕی سەعسەعە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا بە یەك جار شیر خواردن حەرام دەبێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لا) واتە: نەخێر).[٢]

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: ((لاتحرِّم الرضعة أو الرضعتان، أو المصة أو المصتان))[٣] واتە: یەك جار شیر خورادنو دوو جار شیرخواردن حەرامی ناکاتو یەك مژین یان دوو مژینیش حەرامی ناکات.

ئەم مەسەلە جێگەی مشتومڕو جیاوازیە لەنێوان زاناکاندا بەڵام ئەوەی کە زیاتر بەڵگەکان پشتگیری دەکات پێنج جار شیر خواردنی جیاجیایە وەك بەڵگەی فەرموودەکەی (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت)و ئەمەش ڕای (ابن مسعود)و (ابن زبیر)و (عائیشە)یە (خوایان لێ ڕازی بێت)و هەروەها ڕای عطاو شافیعیو أحمدە لە یەکێك لە بۆچوونەکانیداو ڕای ئیسحاقە (والله أعلم).

٢- شیرپێدان لە دوای دوو ساڵیەوە کەس حەرام ناکات:

* (أُم سلمە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاتحرم من الرضاعة الا ما فتق الامعاء في الثدی، وکان قبل الفطام)).[٤]

---

١ مسلم ڕیوایەتی کردووە (٢٦٤٥).

٢ مسلم ڕیوایەتی کردووە (٣٥٨٢).

٣ مسلم (٣٥٨٣).

٤ ابن ماجە لە (١٩٤٦)دا ڕیوایەتی کردووەو (ترمذي) لە (١١٥٢)دا دەڵێ: فەرموودەیەکی (حسن صحيح)ە.

واتە: ئەو شیرەی کە حەرام دەکات دەبێت ڕیخۆڵەکان بکاتەوەو پێش لەشیر بڕانەوە بێت.

* (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لا رضاع الا ماكان في حولين))[1] واتە: شیرخواردن تەنها لە دوو ساڵی یەکەمدا دەبێتو بەس.

دیسان لەم مەسەلەیەشدا جیاوازی هەیە لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەرو دوای ئەوانیشدا، بەڵام ڕاوبچوونی ڕاستو دروست ئەوەیە کە لە دوای دو ساڵان کەس بە شیر خواردن حەرام نابێت ئەمەش ڕای: عمرو ابن مسعودو أبوهريرەو إبن عباسو ابن عمرە (خوا لێیان ڕازی بێت) هەروەها ڕای (ابن مسيب)و (الشعبی)و (سفيان)و (الشافعی)و (أحمد)و (اسحاق)و (ابی عبيد)و (ابن منذر).

حەوتەم:

زانایان پێیان خۆش بووە کە ئەو کەسەی دیاری دەکرێت بۆ شیرپێدانی منداڵ خاوەنی ڕەوشتی بەرزبێت، چونکە شیر خواردن کاریگەری هەیە لەسەر گۆڕینی خووی مرۆڤ (طبع).

* عمری کوڕی حبیب لە پیاوێکی کەنانەییەوە کە وابزانم (عەتواری) بوو دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەلای (ابن عمر) دانیشتم (خوا لێی ڕازی بێت)و پێی وتم: تۆ لە نەوەی فلان کەسی؟ وتم: نا، بەڵام شیریان پێ داوم، ئەویش فەرمووی: لە عمری کوڕی خطابم بیستووە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی: (ان اللبن يشتبه عليه) واتە: شیر کاریگەری هەیە لەسەر لەیەکچوون.[2]

---

١ الدار قطني (١٧٤/٤).

٢ عبدالرزاق (١٣٩٥٣) و البيهقي لە (الكبرى) (٤٦٤/٧) وسعيد بن منصور (٩٩٧). السنن.

* (ابن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) لە وتەیەکیدا دەفەرموێت:(ایاکم ورضاع السوء، فانه لابد ان یتندم یوماً ما)[١] واتە: دەخیلتان بم شیردەری خراپ شیر بە کۆرپەکانتان نەدات چونکە ڕۆژێك هەردێت شوێنەوارەکەی بە منداڵەکەتانەوە دەردەکەوێت.

* قەتادە دەڵێ: دایکی حەسەنی بەسری کەنیزەکی ئازادکراوی (أُم سلمه) بوو (خوا لێی ڕازی بێت)و ناوی (خەیره)بوو جارێك خێرە حەسەن بەجێ دەهێڵێتو بۆ کارێك دەڕواتو حەسەن دەست دەکات بە گریان (أُم سلمه)یش دەیگرێت بە باوەشەوەو شیری خۆی پێ دەدات تا دایکی دەهاتەوەو ئەویش تێری شیری (أُم سلمه)ی دەخوارد، زانایان ئەو ژیریەی حەسەنی بەصریو ڕەوانبێژیەکەی بۆ ئەو شیرە دەگێڕنەوە.[٢]

* هەندێك دەڵێن: عورفو عادەت وابووە کە ڕەوشتو هەڵسو کەوتی ئافرەتی شیردەر لە کۆرپەدا ڕەنگی داوەتەوە کاتێك گەورەبووە، هەر لەبەرئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((تخيّروا لنطفكُم)) واە: بزانن کێ هەڵدەبژێرن بۆ هاوسەری.[٣]

* (ابن قدامه) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: أحمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە مەکروهی زانیوە شیری ئافرەتە بەدەڕەوشتو باوەڕ کزەکان بخرێتە دەمی منداڵەوە، عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت)و عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویانە: (اللّبنُ يشتبه) واتە شیرپێدان لەیەك چوون دروست دەکات.

---

١ غريب الحديث (الخطابي) (٢/١٢٠-١٢١).

٢ أبونعيم في (الحلية)دا (٢/١٤٧) والدينوری في (المجالسة)دا (٢٤٣٥).

٣ (كشف الخفاء) (١/٤٣١).

چونکە لەوانەیە شیری بەدڕەوشتان وا لە منداڵەکە بکات بچێتە سەر ڕەوشتی شیرپێدەرەکەی‌و بە دایکی خۆی بزانێت‌و بەهۆیەوە عەیبدار دەبێت‌و زیانی لێ دەکات، مەکروهە شیری ئافرەتە گێل‌و گەمژەکان بدرێت بە منداڵ، بۆ ئەوەی منداڵەکەش گێل نەبێت، چونکە وەك دەڵێن (شیرپێدان خوو دەگۆڕێت) (والله أعلم).[1]

هەشتەم:

ئەو کۆرپەیەی لە جەنگدا لەگەڵ سوپای کافراندا دەکەوێتە چنگی موسڵمانان‌و کەسیشی نیە شیری پێ بدات، حوکمەکەی چیە؟

* (أبوبکر المروزي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیاریان کرد لە أحمدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی منداڵی کۆرپە کە دیل دەکرێت‌و کەسی نیە شیری بداتێ؟ فەرمووی: خۆ وازی لێ ناهێنرێت بەڵکو هەڵدەگیرێت‌و خواردن‌و خواردنەوەی پێ دەدرێت، ئەگەر مردیش با بمرێت دوای ئەوە.[2]

* إسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: پرسیارم لە (أبو عبدالله) أحمدی کوڕی حەنبەل کرد (رەحمەتی خوای لێ بێت) کە لە وڵاتی ڕۆم‌و لەناو ئەسیرەکاندا منداڵی ساوا هەیە‌و کەس نیە لە ڕێگا شیری پێ بدات ئایا لەگەڵ خۆمان بیانهێنین؟ (أبو عبدالله) فەرمووی: دەبێت بهێنرێت ئیتر با لە ڕێگەیش گیان لەدەست بدات لەگەڵ موسڵماناندا، ئەگەر ژیایش ئەوە خوا ڕۆزی دەدات لەگەڵ سوپای موسڵماناندا.[3]

نۆیەم:

فەرموودەکە ئەوەمان پێ دەبەخشێت کە منداڵی موسڵمانان لە بەهەشتن‌و لەوێ گەمەو یاری دەکەن تا ڕۆژی قیامەت.[4]

---

١ المغني (١١/٣٤٦).

٢ خەلال لە (الجامع لاحکام أهل الملك)دا هێناویەتی لا(٣٨).

٣ هەمان سەرچاوەی پێشو(٤٠)

٤ لە فەرموودەی (٢٩)دا هاتووە.

دەیەم:

ئەو منداڵەی پێش شیرخواردنی تەواو کۆچی دوایی بکات؟

لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) بە منداڵی کۆچی وایی کرد پێش ئەوەی شیرخواردنی تەواو بکات، ئەوە لە بەهەشتدا شیری تەواوی پێ دەدرێت:

* بەراء (خوا لێی ڕازی بێت) کاتێك ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ان له مرضعاً في الجنة)) واتە: دایەنی بۆ دەگیرێ لە بەهەشتدا.[1]

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ان ابراهيم ابني، وانه في الثدي، وان له ظئرين يكملان رضاعه في الجنة))[2]

واتە: ئیبراهیمی کوڕی من، لەکاتی شیرخواردندا مردووە، ئێستا لە بەهەشتدا دوو هاوڕێی هەیەو شیری پێ دەدەن.

* خالیدی کوڕی مەعدان (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە بەهەشتدا درەختێك هەیە پێی دەڵێن (توبا)و هەموو لق و چڵەکانی مەمکەو ئەو منداڵانە دەیمژن کە پێش تەواوکردنی ماوەی شیرخواردنی دەمرن.[3]

* * *

١ بخاری گێڕاویەتیەوە (١٣٨٢) و مسلم (٦٠٩٥).

٢ أحمد ڕیوایەتی کردووە (١١٢/٣).

٣ ابن ابی حاتم وەك لە (الدر المنثور)دا (٦٥٠/٤) هاتووە گێڕاویەتیەوە.

## فەرموودەی بیستەم

## كێ شایەنە منداڵ لەلای ئەو گۆش بكرێت؟

عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنهما) ان امراة قالت: يا رسول الله (ﷺ) ان ابني هذا كان بطني له وعاء، وثدي له سقاء، وحجري له حواء، وان أباه طلقني، وأراد ان ينتزعه مني، فَقال لها رسول الله (ﷺ) ((أنتِ أحَقُ بِه مَالَم تنكحي)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

(عبدالرزاق) لە باسی دایكو باوك شایانە بە كۆرپەدا (١٥٣/٧)و (احمد) (١٨٣/٢)داو أبوداود (٢٧٦) لە باسی كێ شایانە بە منداڵ؟داو الدار قطني (٣٠٤/٣-٣٠٥)و البيهقي (٥٠٤/٨)و الحاكم لە (٢٠٧/٢) دا گێڕاویانەتەوەو حاكمیش بە (صحیح) داناوەو (الذهبي)یش دانی پێداناوە، فەرموودەیەكی (صحیح)ە.

### ئەو فەرمانو ئادابانەی فەرموودەكە دەیبەخشێت:

یەكەم:

(ابن قدامە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (گرتنە ئەستۆو خزمەتكردنی كۆرپە واجبە، چونكە بەبێ ئەوە لەناودەچێتو پێویستە لە لەناوچوون بپارێزرێت، هەروەك چۆن مەسروفكردنی واجبەو پاراستنی لە لەناوچوونی تێدایە، مافی خزمایەتی بوونی پێوە بەندە، چونكە ئەو سەرپەرشتیاری كۆرپەكەیەو لەگەڵ ئەودا دەبێتو مافی هەیە لەسەری وەك بەخێوكەری منداڵی دۆزراوە)[١]

دووەم:

فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دایك شایانی ئەوەیە كۆرپەی لەلابێتو مادەم منداڵن تا تەمیز پەیدادەكەن ئەو بەخێویان دەكات.

---

١ المغنى (ابن قدامة) (٤١٢/١١).

(ابوبكر الصديق) (خوا لێی ڕازی بێت)و هەموو هاوەڵانیش لەسەر ئەوەن كە منداڵان لەلای دایكی دەبێت:

* قاسمی كوڕی محمد (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) خێزانێكی ئەنساریی هەبوو (عاصم)ی لێ بوو پاشان لەیەك جیابوونەوە، عمر هات دەبینی عاصم لەلای حەوشەی مزگەوتدا یاری دەكات، باڵی گرتو خستیە پێشی خۆی لەسەر وڵاخەكەیدا، لە ڕێگا دایكی منداڵەكەی لێ تاین بوو، داوای كوڕەكەی لێ كردو ئەویش پێی نەدەدا تا چوونە خزمەت (ابوبكر الصديق) (خوا لێی ڕازی بێت)و ئافرەتەكە وتی: كوڕی منەو عمریش فەرمووی: كوڕی منە، ئەبوبەكریش بە عمری فەرمو: وازبێنە با بچێتەوە باوەشی دایكی، دەڵێ: عمر هیچ قسەی لە قسەیدا نەكرد.[١]

* هەر ئەم فەرموودەیە بەڵام بەم زیادەیەوە (عبدالرزاق) دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (وقضى لها به) واتە حوكمی دەركرد كە بدرێت بە دایكەكەیو فەرموویشی پێی: بۆنی باوەشی ئەو زۆر لە تۆ باشترە تا گەورە دەبێتو خۆی لایەك هەڵدەبژێرێت.

* (ابن منذر) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئیجماعو كۆدەنگی لەسەرەو هەموو زانایان لەسەر ئەوەن كە ئەگەر ژنو پیاو منداڵیان بوو پاشان لەیەك جیابوونەوە، ئەوە منداڵەكە بەری دایكەكە دەكەوێت مادەم شوو نەكاتەوە.[٢]

واتە هەموویان لەسەر ئەوەن كە ژن شووی كردەوە مافی نامێنێت بەسەر منداڵەكانیەوەو لێی دەسەنرێتەوە بۆ باوكەكە.

---

١ رواه مالك في الموطأ (٢/٧٦٧) و (ابن عبدالبر)یش دەڵێ: ئەم فەرمودەیە جێگای قەبوولی زانایانەو كاریان لەسەر كردووە.

٢ الاجماع لا (١١١-١١٢).

سێیەم:

(ابن قیم) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لەئەستۆگرتنی منداڵ دوو جۆرە:

یەکەم: لە دوو لایەنەوە مافی پیاوەکەیە وەك مەسروفو خەرجیو هاوسەرگیری پێکردنی منداڵەکە.

دووەم: لە دوو لایەنیشەوە دایکەکەی لەپێشە وەك بەخێوکردنو شیرپێدانی، دایكو باوکیش هەر شتێك لە بەرژەوەندی منداڵەکە بێت پێشکەشی دەکەن کە بەهۆیەوە منداڵەکە پێویستی نەمێنێت.

بەلام لەبەرئەوەی ئافرەتان ئاشناترن بە پەروەردەکردنو گۆشکردنی منداڵو بەئارامترو خۆگرترنو زیاتر دەیانپەرژێتە سەریو بە بەزەیتریشن بۆیە ئافرەت پێش باوك خراوە لەبەخێوکردنیدا.

لە پێشخستنی دایك لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیدا لە جوانییەکانی شەریعەتەو بۆ منداڵەکەش وا باشترە، بەلام لە پێشخستنی باوکدا لە مەسەلەی خزمەتکردنو مەسروفکردنو هاوسەرگیری کردنیدا هەر لە جوانیو تەواوی شەریعەتە.

چوارەم:

ئەگەر منداڵ گەیشتە تەمەنی تەمیز پەیداکردن کە زۆرجار لەدوای (٧) ساڵیەوەیە، خۆی سەرپشك دەکرێت لای دایکی یان لای باوکی دەمێنێتەوە.

* (ابو هریرە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وت: دایكو باوکم بەساقەت بێت، مێردەکەم دەیەوێت ئەم منداڵەم لێ بسەنێت کە من زۆر سوودی لێ وەردەگرمو ئاوم لە بیری عینە بۆ دەهێنێت، مێردەکەشی هاتو وتی: کێ دەیەوێت ئەم کوڕەم لێ زەوت بکات؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (یا غلام هذا ابوك وهذه أمك، فخذ بید أیهما شئت)). واتە: کوڕەکە،

ئەمە باوكتەو ئەمەش دایكتە بە ئارەزووی خۆت دەستی یەكێكیان بگرەو هەڵبـژێرە؟ منداڵەكەش دەستی دایكی گرتو پێكەوە ڕۆیشتن.[1]

* (الترمذی) (ڕەحمەتی خـوای لێ بێـت) لـە باسـی سەرپـشككردنی منـداڵ لـەنێوان دایـكو باوكیـدا دەڵـێ: هەنـدێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) كاریـان لەسـەر ئەمـە كردووە، بەڵام هاوەڵانی جگە لەوان دەڵێن: كاتێك منداڵ سەرپشك دەكرێت كە ناكۆكی بكەوێتە نێوان دایكو باوكی كە ئەمەش بۆچوونی احمدو ئیسحاقو هەردووكیان دەڵـێن: ئەگەر منداڵەكە زۆر بـچوك بـوو ئـەوە دەبێـت بـدرێت بـە دایكـیو هـەر كاتێـك تەمـەنی گەیشتە حەوت ساڵان سەرپشك دەكرێت لەنێوان دایكو باوكیدا.[2]

پێنجەم:

زاناكان بۆ سەرپشككردن دوو مەرجیان داناوە:

* (ابن قدامە) (ڕەحمەتی خـوای لێ بێـت) دەڵـێ: منـداڵ بـە دوو مـەرج سـەر پـشك دەكرێت:

یەكـەم: دەبێـت هـەردووكیان شایـستەی منـداڵ بـەخێوكردن بـن، ئەگـەر لایـەكیان وانەبوو ئەوە مانای وایە ئەو كەسە هەر نیەو منداڵەكە دەدرێت بە كەسی دووەم.

دووەم: نابێت منداڵەكە ناتەواو بێت (معتوه) چونكە ئەگەر ناتەواو بێت لەلای دایكی دەمێنێتەوە، چونكە ئەوە وەك منداڵی كۆرپە وایە با بە تەمەنیش گـەورەبێت، چـونكە دایك شایستەترە بە بەخێوكردنی كۆرپەكەی ئەگەر ناتەواو و مەنغۆل بوو با پاش بـاڵق بوونیشی.[3]

---

١ رواه أبوداود (٢٢٧٧) والنسائی (٣٤٩٦)و وشەكان هی ئەوەو (الترمذی)یش لە (١٣٥٧)دا دەڵێت: فەرموودەیەكی (حسن صحیح)ە و(حاكم) (٩٧/٤) بە صحیحی داناوەو (الذهبی)یش پێی ڕازیە.

٢ سنن الترمذي (٦٣٨/٣).

٣ المغني (٤١٧/١١).

شەشەم:

فەرموودەکە مانای ئەوە دەبەخشێت کە دایك بەشوکردن مافی بەخێوکردنی منداڵەکەی نامێنێت:

زانایان لەم مەسەلەیەدا جیاوازیان هەیە: ڕاستترینیان کە زۆربەی زانایانی لەسەرە ئەوەیە کە: دایك بە شووکردنی مافی بەخێوکردنی منداڵەکەی نامێنێت، ئیتر جیاوازی نیە منداڵەکە کوڕبێت یان کچ، (ابن منذر)یش کۆدەنگی زانایانی لەو بارەیەوە نقلّ کردووە، دەڵێ: هەموو ئەم زانایانەی من پێیان گەیشتووم ئەم ڕایەیان بووەو شورەیحیش حوکمی بەمە کردووە.[١]

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیەو دەبێت ئاگامان لێی بێت کە ئەگەر دادگای شەرعی مافی بەخێوکردنی لە دایك سەندەوە بەهۆی شوکردنەوەیەوەو درا بە کەسێکی تر، بەڵام دەرکەوت جگە لە دایکی کەسی نیە ئەوە دەدرێتەوە بە دایکی، چونکە ئەو شایستەترە بە کۆرپەکەی لە کەسێکی بێگانە کە دادگا بیداتێ، پەروەردەکردنی منداڵ لە باوەشی دایکیداو لەژێر چاودێری ئەودا چاکترو گونجاترە لە باوەش‌و چاودێری کەسێکی بێگانەو لەماڵێکی بێگانەدا کە هیچ خزمایەتیەکیان لەگەڵدا نیە کە بێتە هۆی سۆزو میهرەبانی، کەواتە زۆر مەحاڵە شەریعەتی خوا خراپەیەك لابدات بە جێگیرکردنی خراپەیەکی گەورەتر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) یاسایەکی گشتی لەم بارەیەوە دانەناوە کە لە هەموو حاڵەتێکدا ئافرەتەکە شوو بکات یەکسەر مافی بەخێوکردنی منداڵەکەی نەمێنێت‌و ئەم حاڵەتەی سەرەوە کە باسمان کرد پێچەوانەی ئەو خاڵە نیە.[٢]

---

١ زاد المعاد (٥/٤٥٤)و تیایدا ڕا جیاوازەکانیشی هێناوە.

٢ زاد المعاد (٥/٤٦٢-٤٦٣).

حەوتەم:

كاتێك منداڵەكە كەسێكیان هەڵدەبژێرێت كە ببێتە هۆی تێكدانی پەروەردەكردنی:

* (ابن قیم الجوزیة) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە مامۆستای گەورەمان بیستوومە (مەبەستی ابن تیمیەیە (رەحمەتی خوای لێ بێت)) كە فەرموویەتی: ئەگەر دایكو باوكێك لەسەر منداڵێكیان تێكگیران لەبەردەم حاكمداو ئەویش سەرپشكی كردو منداڵەكەش باوكی هەڵبژارد، بەڵام دایكی وتی: جەنابی حاكم لێی بپرسە بۆچی باوكی هەڵدەبژێرێت؟

حاكمیش لێی پرسیو لە وەڵامدا منداڵەكە وتی: چونكە دایكم دەمخاتە بەر خوێندنو مامۆستاكەش لە حوجرە لێم دەدات، بەڵام باوكم وازم لێ دێنێتو نامنێرێت بۆ خوێندن لەناو منداڵاندا بۆ خۆم یاری بكەم،حاكمیش حوكمی دەركرد كە بدرێت بە دایكیو وتیشی: تۆ شایانتریت پێی.

مامۆستامان دەفەرموێت: ئەگەر دایك یان باوك وازی لە پەروەردەكردنی منداڵ هێناو فەرمانی نەدەدا بەسەریدا بە خواناسیو گوێڕایەڵی پەروەردگار، ئەوە تاوانبارەو بۆ ویلایەتو سەرپەرشتیكردنی دەست نادات، بەڵكو هەر كەس بە كاری پێویستی سەر شانی خۆی هەڵنەستێت لەكاتی سەرپەرشتیكردندا ئەوە مافی سەرپەرشتی كردنی نامێنێت یان ئەوەیە خۆی لە سەرپەرشتی كردن دەست هەڵبگرێتو بدرێتە دەستی كەسێكی تر كە بەو كارە هەڵدستێت.

یاخود ئەوەیە كەسێكی دیكەش لەگەڵ خۆیدا دابێت كە ئەو بەو كارە هەڵبستێت، چونكە مەبەستەكە دێتەدی كە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەیەتی بەپێی توانا.

هەروەها مامۆستامان دەفەرموێت: خۆ ئەم مافە بەشێك نیە لە میراتی كە بەهۆی خزمایەتیەوە دەست بكەوێت یان ژنو ژنخوازیو سەرپەرشتی كاریەوە، ئیتر ئەو سەرپەرشتیارە پیاوچاك بێت یان گوناهبار، بەڵكو ئەم جۆرە سەرپەرشتی كردنە

پێویستی بەوە هەیە بتوانێت ئەم واجبە جێ بەجێ بکات‌و بیزانێت، بەپێی پێویست کاری پێ بکات.

وە دەفەرموێت: ئەگەر ڕوویدا باوکەکە ژنی هێنایەوە بەڵام ئەم ژنە ڕەچاوی بەرژەوەندی ئەم منداڵە ناکات‌و کاری لەسەر ناکات، دایکی زۆر لەو هەویەیە باشترە بۆ منداڵەکەو ئا لەم حاڵەتەدا بێگومان منداڵەکە دەبێت بدرێتە دەستی دایکی خۆی.

دەڵێت: ئەوەی پێوسیتە بزانرێت ئەویە کە خواو پێغەمبەر (ﷺ) دەقێکی گشتیان نەفەرمووە کە باوك یان دایك لەپێشتر بگرێت لە سەرپەرشتی کردنی منداڵەکەدا، هەروەها منداڵەکەشی بە تەواوی سەرپشك نەکردووە کە بە ئارەزووی خۆی کامیانی بوێت هەڵیبژێرێت).

زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە دانەنراوە کە یەکێکیان بە هەمیشەیی لەپێشتر بێت بەڵکو کەسی دوژمنکارو ڕۆچوو لە ئیهمالیدا ناخرێتە پێش مرۆڤی چاك‌و دادپەروەرو چاکەکار، (والله أعلم).

هەشتەم:

خوشکی دایك لە سەرپەرشتیکردنی منداڵدا لە ئاستی دایکدایە:

* بەراء (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (لە مانگی (ذی القعدة)دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مەبەستی عەمرە بەرەو شاری مەککە کەوتە ڕێ، بەڵام خەڵکی مەککە ڕێیان نەدا بچێتە ناو مەککەوە تا پرسیاری شەرعی لێ نەکەن،.. لە فەرموودەکەدا هاتووە کە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەڕۆیشت بە ڕێگادا کچەکەی حەمزە شوێنی کەوت‌و هاواری کرد: مامە گیان..

ئەوەبوو عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەستی گرت‌و بردی بۆلای خۆی، بە (فاطمـة)ی فەرموو: ئەوە ئامۆزاكەتە بیبە لای خۆت، ئەوەبوو عەلی‌و جعفرو زید هەریەكەیان داوای دەكرد بۆ ئەو بێت، عەلیش (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: شایانی منە چونكە كچە مامەمە، جەعفەریش فەرمووی: كچی مامی منیشەو خێزانیشم پووریەتی‌و زەیدیش فەرمووی برازای منە، پێغەمبەریش (ﷺ) دای بە لای جەعفەرەوەو فەرمووی: (الخالة بمنزلة الام)) واتە: خوشكی دایك لە حوكمی دایكدایە)[1].

نۆیەم:

زاناكان كۆمەڵێك مەرجیان داناوە بۆ ئەو كەسەی منداڵەكەی پێ دەدرێت كە دەقی فەرمودەو ئایەتی قورئان پاڵپشتیان دەكات:

١- دەبێت ئایینیان یەكێك بێت چونكە كافر نابێت منداڵی موسڵمان بەخێوبكات لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- بەخێوكەر هەوڵ دەدات منداڵەكە لەسەر ئاین‌و بیروباوەڕی خۆی گەورە بكات‌و ئیتر كاتێك گەورەبوو ئاستەمە بتوانێت واز لەو بیروباوەڕانە بهێنێت، هەوڵ دەدات لەو فیترەتە پاكەی پەروەردگار لای بدات‌و هەرگیز نەتوانێ بگەڕێتەوە سەری.

ب- خوای (عزوجل) بەرگری كردووە لەوەی پەیوەندی دۆستانە لەنێوان موسڵمان‌و كافردا دروست بێت، موسڵمانەكانی كردۆتە دۆست‌و خۆشەویستی یەكتری، كافرانیش هەروا لەناویەكدا، دەی بەخێوكردنی منداڵ بەهێزترین هۆكاری دۆستایەتی كردنە كە خوای گەورە ئەو پەیوەندیەی لەنێوان كافرو موسڵماندا پچڕاندوو.

---

١ رواه البخاري (٢٦٩٩).

٢–دەبێت ئەو ئافرەتە شووی نەکردبێتەوە وەك فەرموودەکەی پێشتر.

٣–ژیری، نابێت شێت یان کەم عەقڵ منداڵ بەخێوبکات، چونکە ئەوانە خۆیشیان پێویستیان بەوەیە خزمەت بکرێن ئیتر چۆن سەرپەرشتی بەخێوکردنی کەسی تر لە ئەستۆ بگرن؟!.[1]

* * *

١ زاد المعاد (٥/٤٥٨).

## فەرموودەی بیستو یەکەم

## داد پەروەری لەنێوان منداڵاندا:

عن نُعمان بن بشير (ﷺ) قال: قال رسـول الله (ﷺ): إِعـدِلُوا بَـينَ أبنَـائِكُم، إِعـدِلُوا بَينَ أبنَائِكُم)).

## دەرهێنانی فەرموودەکە:

أحمد ڕیوایەتی کروووە (٢٧٨،٢٧٥/٤) و أبـوداود (٣٥٤٤) لـە باسـی جیاکردنـەوەی باوك یەکێك لە منداڵەکانی لە بەخششدا، النسائی (٣٦٨٧) و (السنن الكبرى) (٦٥١٤).

لە ئەسڵدا فەرموودەکەی نعمانی کوڕی بەشـیر لـە (الـصحيحين)دا هـاتووە، بخـاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە (٣٦٥٠) و مـسلم (٤١٨٩) بـە چـەند ڕسـتـەیەکی جیـا، ترمـذی (١٣٦٧).

## ئەو و ئادابو فەرمانانەی فەرموودەکە دەیبەخشێت:

یەکەم: فەرموودەکە ئەوە دەبەخشێت کە دەبێتو فـەرمان کـراوە بـە دادپـەروەری لەنێوان منداڵاندا:

* (ابن قدامه) دەڵـێ: جیـاوازی نیـە لـەنێوان زانایانـدا لەسـەر باشـی دادپـەروەریو کەراهەتی جیاوازی کردنیان.[١]

ئەو زانایانەی کە دەڵێن دادپەروەری لەنێوان منداڵاندا واجبە: طـاوسو ابـن مبـاركو الثوریو أحمدو أسحاقو بوخاری (ڕەحمـەتی خوایـان لێ بێـت)و زانایـانی تـریش جگـە لەوان.

---

١ المغنی (٢٥٩/٨).

دووەم: فەرمودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دادپەروەری لەنێوان منداڵدا یەكێكە لە مافەكانیان بەسەر دایكو باوكانەوە.

وەك چۆن لە ڕیوایەتی أحمددا هاتووە دەفەرموێت: (ان لِبَنیكَ عَلَیكَ حق ان تعدل بینهم)[1] واتە: یەكێك لە مافەكانی منداڵەكەت بەسەرتەوە ئەوەیە كە دادپەروەربیت لەناویاندا.

سێیەم: هۆی ئەم فەرموودەیە:

* نوعمانی كوڕی بەشیر (خوا لەخۆیو باوكی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: عەمرەی كچی ڕەواحە داوای لە بەشیری كوڕی ابن سعد كرد كە لە سامانەكەی شتێكم بۆ جیابكاتەوە، بەڵام باوكم وتی شتی وا ناكەم، بەڵام پاش یەك دو ساڵ خۆیشی ڕای هاتە سەر ئەوەی كارێكی وام بۆ بكات، بۆیە بە دایكمی وت: ئەوەی كە تۆ ئەوسا داوات كرد لێم بۆ نوعمان ئێستا دەیكەم.

دایكیشم وتی: نەوەڵڵا شتی وا نەكەیت، تا دەستی نەگریتو نەیبەیتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ). تا ئەو پێی ڕازی نەبێتو شایەتی لەسەر نەدات.

دەڵێ: دەستی گرتمو بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((هل لك معه ولد غیره)) واتە: جگە لە ئەم منداڵی تریشت هەیە، وتی: بەڵێ.

فەرمووی: ((فهل اتیت كل واحد منهم مثل الذي اتیت هذا؟)) قال: لا، قال: ((فاني لا أشهد علی هذا، هذا جور، اشهد علی هذا غیري، اعدلوا بین أولادكم في النُّحْل~ كما تحبون ان یعدلوا بینكم في البرِّ واللطف))[2].

---

١ المسند (٤/٢٦٩).

٢ رواه البخاری (٢٦٥٠) ومسلم (٤١٨٩) و (ابن حبان) في صحیحه (٥١٠٤) وشەكان هی ئەوە.

واتە: ئایا بە هەموو منداڵەکانت بەخشیووە وەك بەم کوڕەت بەخشیووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: من شایەت نابم لەسەر ئەمە، ئەمە ستەمکردنە، با یەکێکی تر شایەت بێت لەسەری، دادپەروەربن لە بەخشینەکانتان بە منداڵەکانتان وەك چۆن ئێوە پێتان خۆشە لە چاکەو سۆزدا).

چوارەم:

نوعمانی کوڕی بەشیر لەو کاتەدا کە باوکی دیاریەکەی پێ بەخشی منداڵ بوو باڵق نەبووبوو. وەك لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە ((... فأخذ بيدي وانا غلام، فأتى بي النبی (ﷺ))).

وە لە لای (مسلم)یش دەفەرموێت: ((انطلق بي ابي يحملني الى رسول الله (ﷺ))).

پێنجەم:

چاکەو خێری ئەو باوکانەی دادپەروەرن لەنێوان منداڵەکانیاندا:

* عبداللەی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ان المقسطين عند الله على منابر من نور عن يمين الرحمن (عز وجل) وكلتا يديه يمين، الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وما ولّوا))[1].

واتە: دادپەروەران لەلای پەروەردگار لەسەر مینبەری نور دانیشتوون لەلای ڕاستی پەروەردگارەوە کە هەردوو دەستی ڕاستە، ئەوانەی لە حوکمڕانیداو لەگەڵ ژێردەستەکانیاندا دادپەروەرن.

شەشەم:

گەورەترین بەخشش کە باوکان ببیەخشن بە ڕۆڵەکانیان ئەدەبی جوانو پەروەردەکردنی دروستیانە:-

* ئەیوبی کوڕی موسای کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاس، لە باوکیەوەو ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ما نَحَلَ والد ولده أفضل من أدب حسن))[2].

---

١ رواه مسلم (٤٧٤٨).

٢ رواه أحمد (٢١٤/٣) الترمذي (١٩٥٢) والحاكم (٢٦٤/٤) و دەڵێ (صحيح الاسناد)ه.

واتە: هیچ باوكێك خەڵاتی منداڵی خۆی نەكردووە گەورەتر بێت لەوەی كە ڕەوشتی جوانیان فێربكات.

حەوتەم: فەرمان دراوە بە دادپەروەری لەنێوان منداڵەكاندا كە هەموو شتێك دەگرێتەوە لەوانە:

١- دادپەروەری لە ماچكردنیاندا.

٢- دادپەروەری لە فێركردنیاندا.

* (مجاهد) (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی قیامەتدا مامۆستای منداڵان دەهێنرێتو ئەگەر جیاوازی كردبوو لەنێوانیاندا ئەوە لە ڕیزی ستەمكاراندا دادەنرێت)[١]

* (حسن البصری) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو مامۆستایانەی كە لەباتی فێركردنی منداڵان مووچە وەربگرێتو كەچی دادپەروەر نەبێت لەناویاندا لە ڕیزی ستەمكارەكاندا دەنووسرێت.[٢]

٣- دادپەروەری لە لە خواردندا:

* (السری كوڕی یەحیا) دەڵێ: ئەوانەی كە متمانەم بە زانستیان هەیە بۆیان باس كردم كە عمری كوڕی عبدالعزیز (رەحمەتی خوای لێ بێت) كوڕێكی خۆی گوشارد بە خۆیەوەو زۆری خۆش دەویست، پێی وت: ئەی فلان كەس سوێند بەخوا خۆشم دەوێیت، بەڵام ناتوانم جیاوازی بكەم لەنێوان تۆو براكەتدا بە پاروویەكیش بێت.[٣]

---

١ (ابن قتیبة) لە (عیون الاخبار) (١/١٤٤).

٢ رواه ابن ابي الدنيا لە (العیال)دا (٣٥٥).

٣ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٤٠).

٤- دادپەروەری لە خەوتندا:

* عبدالعزیزی كوڕی عمری كوڕی عبدالعزیز دەڵێ: عمری كوڕی عبدالعزیز (رەحمەتی خوای لێ بێت) كوڕێكی هەبوو لە ژنێكی هۆزی كەعب، زۆری خۆشدەویستو لەگەڵیدا دەخەوت، دەڵێ: شەوێكیان چوومە ڕێگەی! وتی: عبدالعزیزی؟ وتم: بەڵێ، وتی: چیە خراپەیەك رووی نەداوە وا هاتووی وەرە ژوورەوە، منیش چوومە ژوورەوەو دانیشتم وتی: چیت دەوێت؟ وتم: تۆ بەجۆرێك لەگەڵ كوڕی ئەم حارسیەدا هەڵسوكەوت دەكەیت كە لەگەڵ ئێمەدا واناكەیت، وە من لەوە دڵنیا نیم كە بڵێن: دیارە شتێك لەودا هەیە كە لە كوڕەكانی تریدا نیە، فەرمووی: كەس ئەمەی پێ وتیت؟ وتم: نەء، فەرمووی: ئادەی بیلێرەوە، منیش وتمەوە، فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ ژوورەكەی خۆت، منیش گەڕامەوە.

منو ئیبراهیمو عاصمو عبدالله پێكەوە لە ژوورێكدا دەخەوتین، هەر ئەوەندەمان زانی جێگەكە ئەو كوڕەی هەڵگرتو هات بۆ ژوورەكەی ئێمەو كوڕەكەشی بەدواوە بوو وتمان: ئەوە چیە خێرە؟ وتی: خێری چی ئەوەی تۆ پێت كردم. نەعیمی كوڕی مەیسەرە دەڵێ: ئەمەی كرد لە ترسی ئەوەی نەوەك ستەمككردن بووبێت.[١]

مەسەلەیەكی تایبەت:

* (ابن قدامە) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر منداڵێك جیاكرایەوە لەبەر ڕەوشتێك كە پێویستە جیابكرێتەوە لەبەر نەخۆشیو كەم ئەندامی یان یان منداڵ زۆری یان خەریكبوون بە زانستەوە یان هەر شتێكی تر، یان ڕۆژانە گرتنەوە لە هەندێك منداڵی لەبەر سەرفكردنی لە حەرامدا یان لەبەر بیدعەچێتی یان لەوانەیە لە گوناهو سەرپێچی خوادا بەكاری بهێنێت، ئەوە لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەلەوە

---

١ رواه ابن المبارك في (البر والصلة) (١٥٩).

دەگێڕنەوە کە دروستە ئەو کارە، وەك دەڵێ: ئەگەر شتێکی لەسەر وەقف بکرێت لەبەر پێویستی بێت دروستە بەڵام ئەگەر لەبەر جیاوازی کردن بێت ئەوە کەراهیەتی هەیە.

منیش دەڵێم ئایەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[1] بەڵگەی ئەو وتەیەی سەرەوەیە.

هەروها ئەی چۆن ڕەوایە کە جیاوازی نەکات لەنێوان کوڕە شەلاتیو خراپەکارەکەی یان گەمژەیەك کە پارەی باوکی لە حەرامدا خەرج دەکات یان لە ئازاردانی خەڵکیداو نێوان کوڕە صالحو چاکەکەی کە هەموو پارەو پولی لە چاکسازیو خێرکردندا خەرج دەکات؟ والله أعلم.[2]

هەشتەم:

ئاگاداربە کە جیاوازی کردن لەنێوان منداڵەکاندا دەبێتە هۆی ڕقو کینەو دوژمنایەتی لەنێوانیاندا:

هەروەك چۆن خوای گەورە دەربارەی براکانی یوسف دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِن بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ﴾[3]

نۆیەم:

زاناکان لە دادپەروەری نواندن لەنێوان منداڵاندا جیاوازیان هەیە

---

١ المائدة (٢).

٢ المغني (٨/٢٥٨).

٣ يوسف (٨،٩).

* (ابـن قدامــە) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: (دادپـەروەری جـوان‌و سوننەت ئەوەیە کە دادپەروەربێت لە بەشکردنی میرات بـەو شـێوەیەی خـوا فـەرمانی پێـداوە کـە کـوڕ دوو ئەوەنـدەی کـچ دەبـات) ئەمـەش بۆچـوونی عـەطـاو شـورەیح‌و ئیسحاق‌و محمدی کوڕی حەسەن)[١]

شورەیح ڕۆژێکیان بینی پیاوێك سامانەکەی لەنێوان کوڕەکانیدا بەش کرد پێـی وت: بەو جۆرە بەشیان بدە کە خوای عز وجل بەشی دیاری کردوون لە قورئاندا.[٢]

بەڵام أبو حنیفەو مالك‌و شافیعی‌و ابن مبـارك دەڵـێن: کـوڕو کـچ دادپەروەرانـە وەك یەکیان پی‌دەدرێت لـە خـەڵاتکردن‌و بەخـشیندا، چـونکە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـە بەشیری کـوڕی سـەعدی فـەرموو: ((سـویّ بیـنهم)) واتـە: (یەکـسان بـە لەنێوانیانـدا)و پاشان فەرمووی: ((أیسرك أن یستووا في بـرّك؟)) واتـە: ئایـا خۆشـحاڵ نیـت کاتێـك لـە چاکەکردن لەگەڵتدا دادپەروەرانە بن؟.

* (ابـن عبـاس) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سوّوا بین أولادکم في العطیة، ولو کنـت مـؤثراً لاحـد لاثـرت النـساء علـی الرجال)).

واتە: لە خەڵاتکردندا دەبێـت یەکـسان بـن لـەنێوان منداڵەکانتانـداو ئەگـەر دروسـت بووایە کەسێکم فەرق بکردایە ئەوە ئافرەتم فەرق دەکردو لە پیاوان باشترم پێدەدان.

چونکە خەڵات‌و بەخشین بۆ ژیانی دنیایەو ژن‌و پیاو وەك یـەك پێویـستیان پێیـەتی وەك خواردن‌و جل‌وبەرگ.

* * *

---

١ المغني (٨/٢٦٠-٢٠٥).

٢

## فەرموودەی بیست و دووەم
## ناونانی منداڵان

عن عبدالله بن عمر (رضی الله عنهما) قال قال رسول الله (ﷺ) ((إِنَّ أَحـب أسمَـائِكُم إِلَى الله: عَبدالله وعَبدُالرَّحمن)).

واتە: عبداللەی کوڕی عمر (خوا لێیان ڕازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: خۆشەویستترین ناوتان لەلای خوا دوو ناوە: عبدالله و عبدالرحمن).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

(ابن ابی شـیبە) لـە باسـی –ئـەو ناوانـەی سـوننەتن– لا (٥٩٦٢) و أحمـد (٢٤/٢)و مسلم (٥٦٣٨) ووشەکان هی ئەون، أبو داود لـە باسـی گـۆڕینی ناوەکانـداو (الترمـذی) (٢٨٣٣–٢٨٣٤)و (إبن ماجە) (٣٧٢٨) لە باسی ئەو ناوانەی کە سونەتن.

### ئەو و ئاداب و فەرمانانەی فەرموودەکە دەیبەخشێت:

یەکەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە سوننەتە ناوی منداڵ بنرێت عبدالله و عبدالرحمن.

دووەم:

دەقە شەرعیەکان ئەوە دەگەیەنن کە کۆمەڵێك ناو هەن سوننەتن نـاوی منـداڵی پـێ بنرێت:

١– عبدالله و عبدالرحمن وەك فەرموودەکەی پێشوو.

٢– ئەو ناوانەی کە وشەی (عبد) بخرێتـە پـێش ناوەجوانـەکانی خـوای گـەورە وەك: عبدالعزیزو عبدالملكو عبدالرزاقو هتد...

٣–ناونان بەناوی پێغەمبەرەوە (ﷺ) واتە محمد:

* جـابر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویەتی: ((تَسَمَّوا بِاسْمِي ، وَلاَ تَكَنُوا بِكُنيَتِي، فاني أنا أبوالقَاسم، أقسم بَينكم)).[١]
واتە: ناوی منداڵتان بەناوی منەوە بنێن بەڵام بـە نازنـاوی منـەوە نـەخێر، چـونکە مـن (أبو القاسم)م و لەنێوانتاندا بەشکەرم.

٤- ناونان بەناوی پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لێ بێت:

* (أبی وهب الجشمی) (خوا لێی ڕازی بێت) کە هاوەڵی پێغەمبەری کردووە دەڵـێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((تسموا بأسماء الانبيـاء، واحـب الاسمـاء الى الله عبدالله وعبدالرحمن، وأصدقها حارث وهمّام وأقبحها حرب ومرّة))[٢]

واتە: ناوی منداڵتان بەناوی پێغەمبەرەکانەوە بنێن، خۆشەویستترین ناو لەلای خـوا (عبداللهو عبدالرحمن)ە، دروستترین نـاویش هـەمامو حـارثو ناشیرینتریـشیان حـەربو مورەیە.

* سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (خۆشەویسترین ناو لەلای خوای گەورە ناوی پێغەمبەرانە)[٣].

* (ابـن القـیم) (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: پێغەمبـەران لـە گـەورەو سەردارەکانی نەوەی ئادەمنو ڕەوشتیان بەرزترین ڕەوشتەو کردارەکانیان دروسـترین کردەوەیەو ناوەکانیشیان جـوانترینو بـەڕێزترین نـاوە، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هانی خەڵکی داوە کە ناوی منداڵەکانیان بەناوی ئەوانەوە ناو بنێن.

---

١ رواه البخاري (٣٥٣٨)، مسلم (٥٦٤٢).

٢ رواه احمد (٣٤٥/٤) وأبو داود (٤٩٥٠) واسناده حسن بشواهد.

٣ رواه ابن ابي شيبه (٥٩٦١).

هەروەك لە سونەنی (ابی داود)دا هاتووە ((تسمّوا باسماء الانبیاء))و ئەگەر هەر ئەو سوودەشی هەبێت كە مرۆڤ هەوڵ دەدات وەك ناوەكەی خۆی بێت بەسە كە ناو بنرێت بەناوی پێغەمبەرانەوە، ئیتر جگە لەوەی كە پاراستنو لەیادكردنەوەی ناوی بەرزیانی تێدایەو ژیانو بەسەرهاتو شێوازیان لەبیری خەڵكدا دەمێنن.[1]

ئاگاهیەك:

هەندێك لە زانانیان پێیان وایە باش نیەو كەراهەتی هەیە ناوی منداڵ بنێیت بەناوی پێغەمبەرانەوەو ئەمەش بۆ (ابن عمر) دەگێڕنەوە (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ هەندێك زانای تردا، ئەم بۆچوونەش لەبەرئەوەیە كە ناوی پیرۆزی پێغەمبەران لە بێ ڕێزی بپارێزرێتو لەكاتی توڕەبووندا بەخراپ ناو نەبرێن:

* ئەوەتا (أبو العالیە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (ئێوە لەمەش خراپتر دەكەن، منداڵەكانتان بەناوی پێغەمبەرانەوە ناودەنێنو كە لێیان توڕەش دەبن نەفرەتیان لێ دەكەن)[2]

نووسەری ئەم كتێبەش دەڵێت: شتێكی شاراوە نیە كە لە سوننەتدا چەسپاوە ناونان بەناوی پێغەمبەرانەوە شتێكی چاكو جوانە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كوڕەكەی خۆی ناوناوە ئیبراهیم بەناوی باپیری ئیبراهیم.

٥- ناونان بەناوی هەمامو حارث

* ئەمەش لە فەرموودەكەی (أبی وهب الجشمی) گێڕایەوە كە تیایدا هاتووە: ((واصدقها حارث وهمام)) واتە: ڕاستترینیان ناوی حارثو هەمامە.

---

١ زاد المعاد (٢/٣٤١-٣٤٢).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٥٩٥٩).

٦-ناونان بەناوی پیاوچاکانەوە:

* (مغیرە)ی کوڕی (شوعبە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: بە سەردان چووم بۆ نەجرانو لەوێ لێیان پرسیم کە ئێوە لە قورئاندا دەخوێنن ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ﴾و خۆ موسا زۆر لە پێش عیساوە هاتووە بە چەندان ساڵ؟ منیش هاتمەوە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەو پرسیارەم لێ کردو ئەویش فەرمووی: ((انهم كانوا يسمون بانبيائهم والصالحين قبلهم))[1] واتە ئەوان بەناوی پێغەمبەرەکانیانو پیاوچاکانەوە ناوی خەڵکیان ناوە.

سەرداری پیاوچاکانیش لە ئیسلامدا هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) کە هاوڕێو هاودەمی پێغەمبەرەکەمان بوون (خوا لێیان ڕازی بێت).

سێیەم:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە جوانکردنو خۆشکردنی ناوەکان، زۆر خۆشحاڵ بووە بەناوی خۆشو نگینی تێدا بینیوە:

* (ابی الدرداء) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((انما تُدعون يوم القيامة باسمائكم واسماء ابائكم، فاحسنوا أسمائكم))[2] واتە: ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتانو ناوی باوكو باپیرتانەوە بانگ دەکرێن، دەی کەواتە ناوی جوان هەڵبژێرن.

چوارەم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی ناشیرینو خراپی پێ ناخۆش بووە، بەڵکو هەوڵیشی داوە بیانگۆڕێت بەناوی خۆشو مانابەخش.[3]

---

١ رواه مسلم (٥٦٤٩).

٢ رواه أحمد (٥/١٩٤) وأبو داود (٤٩٤٨).

٣ رواه الترمذي (٢٨٣٩).

ئەو ناوانەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆڕیویەتی زۆربوون لەوانە:

* (ابن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی (عاصیە)ی گۆڕیوەو فەرموویەتی: ((أنتِ جمیلة)) واتە تۆ ناوت (جوان)ە.[١]

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: جویریە لە سەرەتاوە ناوی (بەڕە)بوو و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناوە جویریە، دواتریش پێی ناخۆش بووە بڵێن لە ماڵی بەڕە هاتە دەرەوە.[٢]

* (أبو داود) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی (عاص‌و عزیزو عتلە‌و شیطان‌و حَكَم‌و غُراب‌و حُباب‌و شهاب)ی گۆڕیوە بە (هشام)و (حەرب)ی كردووە بە (سِلم) واتە ئاشتی، (مصطجع)ی كردووە بە (منبعث)، (عِضرة)ی كردووە بە (خَضِر)، دۆڵی گومڕایی كردووە بە دۆڵی ڕێنمایی، بنوا الزنیەی كردووە بە بەنی الرِّشدة، وە بنی مغویەی كردووە بە بنی رِشدة.[٣]

پێنجەم:

زاناكان كۆمەڵێك ناویان دیاری كردووە كە دروست نیە ناوی منداڵی پێوە بنرێت:

١- وشەی (عبد) بدرێتە پاڵی جگە لە ناوی خوای گەورە وەك عبدالرسول، عبدالعزی، عبدالكعبە‌و هاوشێوەكانی ئەم ناوانە.

* (هانیء)ی كوڕی (یەزید) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: وەفدێك هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لێ بوو بە یەكێكیان دەووت (عبدالحجر) واتە: بەندەی بەرد!

---

١ رواه مسلم (٥٦٥٥).

٢ رواه مسلم (٥٦٥٧).

٣ رواه ابو داود في سننه (٥/٢٤١-٢٤٢). ابن ابي شيبه (٨/٦٦٢-٦٦٥).

پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((ما أسمك)) ناوت چیە؟ وتی: عبدالحجر! پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((انما انت عبدالله)) بەڵكو تۆ (عبدالله)یتو تۆ بەندەی خوایت.[١]

لەسەر ئەم شێوەیەش دروست نیە بڵێی بە یەكێك (غلام رسول)و (غلام محمد) كە مەبەست لێی عبدالرسول و عبدالمحمدە.

دەبێت بزانین كە ناوەكانی خوای (عز وجل) لەلایەن شەرعەوە دیاری كراون (توقیفیە)، كەواتە: مقصودو موجود لە ڕیزی ناوەكانی خوادا نینو دروست نیە كەسێك ناوبنرێت عبدالموجود یان عبدالمقصود.

٢- ناونان بەناوی ناوەكانی خوای تەعالاوە، وەك:

الاحد، الصمد، الخالق، الرزاق، ناوی رحمنو رحیم كە تایبەتن بە خوای گەورەوە، دروست نیە بە پاشاكان بگوترێت: قاهر، ظاهر، جبار، متكبر، الاول، الاخر، الباطن، علام الغیوب.

* یەزیدی كوڕی میقدام لە باوكیەوەو ئەویش لە باوانیەوە شورەیحو ئەویش لە (هانيء)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: كە كاتێك وەفدێك هات بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەری خواو بینی یەكێكیان ناوی (ابی الحاكم)بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی كردوو پێی فەرموو: ((ان الله هو الحكیم والیه الحكم))و پاشان نازناوەكەی گۆڕی بۆ گەورەترینی كوڕیو ناوی (ئەبو شورەیح).[٢]

ئەمە مەبەستی لەو ناوانەی كە تایبەتن بە خوا، بەڵام ئەو ناوانەی دروستن كە بەسەر جگە لە خوای گەورەیشدا دەبرێت وەك: سمیع، بصیر، رؤوف، رحیم بەڵام تەنها وەك ناون نەك پڕاوپڕ بە هەموو مانایەكیەوە ببڕێت بەسەر كەسێكدا.

---

١ رواه ابن أبي شيبه (٥٩٥٢). والبخاري في الادب المفرد (٨١١).

٢ رواه ابو داود (٤٩٥٥) اسناده صحيح.

دەڵێم: هەروەك دروست نیە نازناو بە ناوە تایبەتیەکانی خواوە وەك (أبـو الاعلـی و أبو الحکم).

٣- دروست نیە ناونان بەناوی شاو سوڵتانو شاهنشاوە:

* (ابو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ)دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویەتی: ((إنّ أقبح اسم عندالله رجل تُسمی ملك الاملاك))[1]

* لە ڕیوایەتی (مسلم)دا هاتووە: ((أغيظ رجل عندالله يـوم القيامـة واخبثـه وأغيظـه عليه، رجل كان يُسمی ملك الاملاك لا ملك إلا الله))[2]

واتـە: خـراپترینو ناحـەزترین کـەس لـەلای خـوا لـە ڕۆژی قیامەتـدا کەسێکە نـاوی شاهەنشاهە، و پادشا نیە جگە لە خوا.

هەروەها حەرامە ناو بنرێت (سەرداری هەمووان)و (سەرداری خەڵکی) یان سـەرداری نەوەکانی ئادەم کە ئەو نـاوە تایبەتـە بـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە پێـی دەڵـێن (سید ولد ادم).

٤- ناوی بێگانە کە کافران ناوی منداڵی خۆیانی پێ دەنێن:

کە ئەمڕۆ نەگبەتی موسڵمانان لەوەدایە کە ئەو ناوانە لـەناو موسـڵماناندا تەشـەنەی کردووەو زۆر جار گوێت لە بەچکە موسڵمانەو نـاوی جورجـە یـان دەیانـا، سـوزان یـان جەرجیسو چەندان ناوی تر کە لە وڵاتای بێ باوەڕەوە هێنراوەتەوە ناو موسڵمانان.

٥- باش وایە بۆ پاراسـتنی هەویـەی موسـڵمانەتی لـەو نـاوە فارسـیو تـورکیو بەربەرییەکان دوور بکەوینەوە وەك -شیریهانو جیهـان، اسـبهانو شـادی- کـە بـە مانای مەیمون دێت لەلایان.

---

١ رواه البخاري (٦٢٠٦) ومسلم (٥٦٦١).

٢ مسلم (٥٦٦٢).

٦- هەروەها دروست نیە ناونان بە ناوەکانی شەیتانەوە وەك ئیبلیس و خەنزەب و وەلهان و ئەعوەر و ئەجدەع:

* لە شەعبەبیەوە دەگێڕنەوە و ئەویش لە مەسروقەوە کە دەڵێ: گەیشتم بە عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) پێی وتم: تۆ کێی؟ وتم: مەسروقی کوڕی ئەجدەعم، ئەویش فەرمووی: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە کە فەرموویەتی: ((الاجدعُ شیطان))[1] واتە ئەجدەع ناوی شەیتانە.

شەشەم:

ئەو ناوانە زۆرن کە لەلای زانایانی ئیسلام مەکروهن و پێیان ناخۆشبووە لەوانە:

١- ناوێك مانای خۆ بەچاك زانینی تێدابێت (التزکیه):

* یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیب لە محمدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کچێکمان بوو ناوم لێنا (برّە) واتە چاکە، زەینەبی کچی ئەبوسەلەمە وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرگری کردووە لە ناونان بەناوی (بَرّة)وە، وە من ناوم (بەرە)بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لاتزکوا أنفسکم، والله اعلم بأهل البر منکم)) فقالوا: بم نسمیها؟ قال: ((سموها زینب))[2]

واتە: خۆتان بە چاك مەزانن، تەنها خوا خۆی دەزانێت کێ چاکە لەناوتاندا، وتیان: کەواتە ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ناوی بنێن زەینەب

٢- ئەو ناوانەی کە باش نیە ناوی منداڵی پێ بنرێت و پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری لێ کردوون لەوانە:

* عن سمره بن جندب (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((لاتسمّین غلامك یساراً ولا رباحاً ولا نجیحاً ولا أفلح، فانك تقول: اثم هو؟ فلا یکون فیقول لا))[3].

---

١ رواه أحمد (٣١/١). و أبوداود (٤٩٥٧).

٢ رواه مسلم (٥٦٦٠).

٣ رواه مسلم (٥٦٥٢).

واتە: (منداڵەکەت بەناوی یەسارو رباحو نەجیحو ئەفلەح مەنێ، چونکە تۆ دەڵێی: لەڕاستیدا وایە؟ چونکە وانیە دەڵێ: نەء).

لەسەر ئەو شێوازە ناوی (خەیرو سرورو نعیمەو مبارك)یش مەکروهن چونکە پرسیارکەر دەڵێ خێر یان سرور لێرەیە؟ دەڵێ: نەء دڵیش خەفەتبار دەبێتو دەروونەکان ناڕەحەت دەبن.

٣- هەروەها ناوی ستەمکارانو فیرعەونەکان دروست نیە وەك فیرعەونو قارونو هامان.

٤- هەروەها ناوی فریشتەکان وەك جبریلو میکائیلو اسرافیل، ناونانی ئادەمیەکان بەو ناوانە مەکروهن.

* ئەشهەب دەڵێ: پرسیار کرا لە ئیمام مالك دەربارەی ناونان بەناوی جبریل؟ بە مەکروهی زانیو پێی خۆش نەبوو، بەڵام هەندێك لە زانایان ڕێگەیان پێداوە.

٥- هەروەها هەموو ئەو ناوانەی کە دەروون پێی ناخۆشەو ناگونجێت لەگەڵ ناسکی ڕۆح وەك: جەنگ، تاڵ، شێواو، داماو، سەگ، توولە، مار و هاوشێوەکانیان.

* یەحیای کوڕی سەعید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی کەسێك حەیوانێکی بۆ بدۆشێت فەرمووی: کێ ئەمەمان بۆ دەدۆشێت؟ پیاوێك هەستایە سەر پێ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ((ما اسمك)) ناوت چیە؟ وتی: مورە! پێغەمبەر فەرمووی: ((اجلس)) واتە: دانیشە

پاشان فەرمووی: ((من يحلب هذه)) کێ ئەمەمان بۆ دەدۆشێت؟ پیاوێك هەستایە سەرپێو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: حرب فەرمووی: ((اجلس)) واتە: تۆیش دانیشەوە، پاشان فەرمووی: کێ ئەمەمان بۆ دەدرۆشێت؟ پیاوێك هەستایە سەرپێ، پێی فەرموو: ناوت چیە؟ وتی: ناوم یەعیش واتە ئەژی، فەرمووی: تۆ بۆمان بدۆشە)[1].

---

١ رواه مالك (الموطأ) (٩٧٣/٢).

٦- ناوەکانی قورئان مەکروهن ناونان پێیانەوە وەك: طە، یاسین، حم، پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ڕاشکاوانە کەراهیەتی ناونان بەناوی (یاسین)ی فەرمووە.[1]

## ئاگادارییەك:

ئەوەی کە خەڵکی باسی لێوەدەکەن کە یاسین‌و طە دوو ناوی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، ڕاست نیەو لە هیچ فەرموودەیەکی صحیح یان حسن یان مرسل یان وتەیەکی هاوەڵاندا نەهاتووە، بەڵکو پیتی جیا جیان وەك هەموو پیتەکانی تری سەرەتای قورئان وەك حم، الر، الم و هتد...

٧- ناونان بەناوی هونەرمەندە ڕەوشت نزمەکانەوە دروست نیەو مەکروهە، وە گورانیبێژو یاریزانەکانیشەوە.

٨- هەروەك ناونان بەناوی ئاژەڵە ناسراوەکان بە ڕەوشتی ناشیرین وەك: حمار، قردان، کلب، کلیب واتە سەگو کەرو مەیمون‌و چەقەڵو هتد...

٩- هەروەك مەکروهە دوو ناو تێکەڵکێش بکرێت بەتایبەت (حمە) یان (محمد) بخرێتە پێشیەوە بۆ پیرۆزی وەك حمەعلی‌و حمەصالح محمدقادرو محمدسعیدو هتد..

حەوتەم:

دەبێت باوکان‌و سەرپەرشتیاران ناوی جوان هەڵبژێرن بۆ ڕۆڵەکانیان، چونکە ناو کاریگەری لەسەر ناونراوەکە هەیە:

* (ابن المسیب) لە باوکیەو دەگێڕێتەوە کە بە منداڵی باوکی هاتبووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش لێی پرسیبوو: ((ما اسمك؟)) ناوت چیە، وتی: حزن، واتە: غەمبار، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((انت سهل)) واتە تۆ ناوت سانایە،

---

١ سوهەیلی هێناویەتی.

پیاوەكـەش وتـی: (لا أغـير إسمـاً سمانيـه أبـي) واتـە: ناوێـك نـاگۆڕم بـاوكم بـۆی هەڵبژاردووم!

(ابن المسيب) دەڵێ: تا مردن ئەو پیاوە لەناوماندا هەر غەمبارو دڵتەنگ بوو)[١]

* (ابن القيم) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت:

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گرنگی داوە بە ناونان، ئەگەر بە وردی سـەیری سـوننەتەكانی بكـەین بۆمـان دەردەكـەوێت كـە هـەموو ناوەكـانی كـە لـەو سـەردەمەدا بـووە مانـای ناوەڕۆكی كەسەكەی گەیاندووەو لەوەوە وەرگیراوە، لـەم فەرمودەیـە وردبـەرەوە كـە دەفەرموێت: ((أسلم سالمها الله، وغفار غفر الله لها، وعصية عصت الله))[٢] واتە: بێ وەی خوا بێ وەی بكات، لێبووردە خوا لێی ببورێتو سەركەش لە خوا یاخیە.

یان ئەو كاتەی صـولحی حودەیبیـە بـە سوهەیلی كـوڕی عـەمری فـەرموو: ((سَهُلَ امركم)) واتە ئەی ئاسان خوا كارت ئاسان بكات.

* یان جارێكیان بە بورەیدەی فەرموو: ناوت چیە؟ ئەویش فەرمووی: (بُريدة) واتە: فێنـك، پێغەمبـەر (ﷺ) بـە ئەبوبـەكری فـەرموو: ((يـا ابـابكر بـرد امرنـا)) واتـە ئـەی ئەبوبەكر فێنكی بۆ كارەكانمان دێت).

پاشان فەرمووی: (ممن أنـت؟) واتـە: لـە چ هـۆزێكی؟ وتـی: هـۆزی أسلم، ئـەویش فەرمووی: بێ وەی دەبـین، پاشـان پێـی فـەرموو: (ممـن): لـە چ تیرەیـەكی ئەسـلەم؟ ئەویش وتی: لە سەهم، واتە بەش، فەرمووی بەشت دیاری كرا ((خرج سهمك))[٣]

١ رواه البخاري (٦١٩٣).

٢ تحفة المودود لا(٢٠٣-٢٠٥).

٣ الاستذكار، أبوعمر.

هەشتەم:

کاتی ناونانی منداڵ:

لە سوننەتی صحیحدا هاتووە کە کۆرپە ناودەنرێت لە:

١- ڕۆژی لەدایکبوونی. وەك چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ) کە ئیبراهیمی کوڕی ناونا لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا.

٢- ناونانی منداڵ لە ڕۆژی سێیەمدا:

* خەلال (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە باسی ناونانی منداڵدا دەڵێ: عبدالملك ی کوڕی عبدالحمید دەڵێ: پێکەوە لێکۆڵینەوەمان دەربارەی کاتی ناونانی منداڵ دەکرد کە ئایا کەی دەنرێت؟

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەوەی کە سابتو جێگیرە لە سوننەتدا هاتووە کە ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) لە سێ ڕۆژەدا منداڵی ناوناوە بەڵام سەمرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە حەوتەم ڕۆژدا ناوی دەنا.[١]

٣- ڕۆژی حەوتەم: وەك لە فەرموودەی سەمرەدا باسی دەکەین انشاء الله.

منیش دەڵێم: هەر کەس ویستی با لە ڕۆژی لەدایکبووندا ناوی منداڵەکەی بنێت، بەڵام ئەگەر خۆی یەکلا نەکردبوویەوە با دوای بخات بۆ ڕۆژی سێیەم یان حەوتەم تا شێوە سوننەتیەکەی بپێکێت (والله أعلم).

نۆیەم:

لەو سوننەتانەی کە لەلای زۆر کەس وازی لێ هێنراوە دانانی نازناو بۆ منداڵ.

ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) برایەکی بچکۆڵەی ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەبینێت کە هێشتا شیرەخۆرەبوو پێی دەفەرموێت: ((یا أبا عمیر)) واتە ئەی باکی عومەیر، واتا نازناوی خۆی بۆ دانا.

هەروەها جاریکیان کچێکی بچوکی بانگ کرد بە ((أم خالد)) واتە دایکی خالد.

---

١ تحفة المودود لا ١٦٧ لە باسی کاتی ناونان‌دا.

* عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: (عجلوا بكنى أولادكم، لاتسرع اليهم القاب السوء) خێرا نازناو دابنێت بۆ منداڵەکانتان پێش ئەوەی ناتۆرەو نازناوی خراپ وەرگرن.

* زاناکان دەفەرموون: بۆیە منداڵەکانیان هەر لە منداڵیەوە بە نازناو بانگ کردووە وەك گەشبینیەك بەوەی کە گەورە دەبن‌و دەبن بە باوك یان دایك‌و هەروەها بۆ ئەوەی نەوەك لەقەبی ناشیرین بخرێتە دوایان.

هەروەها وا باوە کە ئەگەر یەکێك کەسێك بە گەورە سەیر بکات ڕووی نایەت بەناوی خۆیەوە بانگی بکات‌و ئەگەر نازناوی هەبوو بەوەوە بانگی دەکات.[1]

دەیەم:

ناونانی منداڵ مافی باوکە بە پلەی یەکەم:

ئەگەر هاتوو ناکۆکی کەوتە نێوان دایك‌و باوك لەسەر ناونانی منداڵەکانیان گومانی تێدانیە کە ئەو مافە دەدرێت بە باوك لەسەر ڕۆشنایی هەموو ئەو فەرموودانەی پێشوو، بەڵام ئەگەر بە لێکگەیشتن‌و پرس‌وڕا بێت لای خوا خۆشەویسترە.

یازدەیەم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوعبەت‌و شۆخی کردووە لەگەڵ منداڵاندا‌و بەناوی بچوککراوەوە بانگی کردوون.

* هەردەم بە ئەنەسی دەفەرموو: (يا أُنيس) واتە ئەی ئەنەسە خنجیلەکە.[2]

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوعبەتی دەکرد لەگەڵ زەینەبی کچی ئوم سەلەمەدا دەکردو ناوەکەی بچوك دەکردەوەو پێی دەفەرموو: ((يا زوينب!)) ئەی زەینەبە گچکەکە!) یان زەینەبۆلکە.[1]

---

١ عمدة القاري (١٨/٢٦٥).

٢ رواه مسلم (٦٠/٨١).

## فەرموودەی بیست و سێیەم
## تەحنیكی منداڵ بە دەمەجوی خورما

عن عائشة (رضي الله عنها): ان رسول الله (ﷺ) كَانَ يُوْتى بِالصبيَان، فَيبرك عَلَيهم وَيحنكهُم)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە (٦/٤٦-٢١٢) و مسلم (٥٦٧٠)و أبو داود لە (٥١٠٦) لە باسی بانگدان بەگوێی منداڵدا، ابن حبان لە صحیحەكەیدا (١٣٧٢).

### ئەو ئەحكام و ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم: تەحنیك مانای چیە؟

* ئەبو عوبەید (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێشەوا یەزیدی دەڵێ: تەحنیك واتە: خورمایەك بجوێنرێت پاشان بە پەنجە دەهێنرێت بە ئاسمانەی دەمی كۆرپەكەدا.

دووەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە تەحنیك سوننەتە:

* هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) منداڵە تازە لەدایكبووەكانیان دەهێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا دەمەجوی خورمایان بۆ بكات و دووعای فەڕو بەرەكەیان بۆ بكات.

* (أبو موسى) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: كوڕێكم بوو، هێنامە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ناوی لێنا ئیبراهیم و بە خورمایەكیش دەمەجوی بۆ كرد.[١]

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: یەكەم منداڵ لە ئیسلامدا لەدایك بوو، عبداللەی كوڕی زوبیر بوو هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێغەمبەریش

---

١ رواه البخاري (٥٤٦٧) و مسلم (٥٦٦٦).

(ﷺ) خورمایەكی هەڵگرت‌و خستیە دەمی‌و جووی‌و پاشان كردیە دەمی، بەو جۆرە یەكەمین دڵۆپێك چووە سكیەوە تفی پێغەمبەری خوابوو (ﷺ).[١]

منیش دەڵێم: بەڵگە زۆرە لەسەر ئەوەی كە تەحنیك لە ڕۆژی لەدایكبووندا سوننەتە‌و زاناكان لەسەر ئەوە سەرباسیان نووسیوە‌و بەشیان جیاكردۆتەوە:

* (ابن أبی شیبە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە باسی خورما كاتێك دەجوێنرێت‌و دەدرێت بە منداڵ.[٢]

* پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە (صحیح)ەكەیدا سەرباسێكی ناوناوە (باسی منداڵ لەو ڕۆژەدا كە لەدایك دەبێت‌و عەقیقە‌و تەحنیكی بۆ دەكرێت)[٣]

هەروەها بەردەوام زانایان كاریان لەسەر ئەمە كردووە لەگەڵ منداڵەكانیان:

* خەلال (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: محمدی كوڕی عەلی هەواڵی پێدام‌و وتی: لە خێزانی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلم بیست دەیووت: كاتێ ژان زۆری بۆ هێنام ئیمام خەوتبوو، پێم وت: ئەی سەردارم خەریكە دەمرم، ئەویش فەرمووی: خودا دەروو دەكاتەوە.. ئەو قسەكەی تەواو نەكرد من سەعیدم بوو.

كاتێك منداڵەكەم بوو فەرمووی: ئەو خورمایە بهێنن (كە لە مەككەوە بۆمان هاتبوو) منیش بە دایكی عەلیم وت: جوان بیجووە‌و پاشان دەمی منداڵەكەی پێ شیرین بكە‌و ئەویش وای كرد.[٤]

* (ابن منذر)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: تەحنیكی كۆرپە سوننەتە.[٥]

---

١ رواه البخاري (٣٩١٠) ومسلم (٥٦٦٨).

٢ المصنف (٨/١٩،٢٠).

٣ صحيح البخاري. وفي الادب المفرد لا (٣٦٦).

٤ تحفة المودود لا(٦٦).

٥ الاقناع لا (١/٣٧٩).

منیش دەڵێم: هەندێك پێیان وایە ئەم سوننەتە تایبەت بووە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەڵام ئەم قسەیە بەڵگەی دەوێت، خۆ ڕاستە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) منداڵەکانیان دەهێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا تەحنیکیان بۆ بکاتو بەرەکەتی لیکی پێغەمبەر (ﷺ) بچێتە ناو دەمی کۆرپەکانیانەوە ئەمەیان تایبەتە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ).

سێیەم: کێ هەستێت بە تەحنیك کردنەکە؟

هەر کەسێك لەو کاتەدا کە لەدایك دەبێت ئامادەبێت لە خزمەکانی وەك چۆن ئیمام أحمد بە دایکی منداڵەکەی وت کە تەحنیکەکەی بۆ بکات.

منیش دەڵێم: بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ زۆری لە نووسەرو زانایانی ئەم دواییانە کە خاوەنی (تربیة الاولاد في الاسلام) یەکێکیانە دەڵێن: سوننەت وایە ئەو کەسەی کە تەحنیکی ئەو منداڵە دەکات کەسێك بێت بە خواناسیو لەخواترس بناسرێت، ئەمەش لەبەر فەڕو بەرەکەتو بەهیوای ئەوەی لە پاشەڕۆژدا صالح دەربچێت.

ئەمەش ڕاست نیە بەڵکو بیدعەیەو لە ئیسلامدا داهێنراوەو شەرع شتی وای نەفەرمووە، سەلەفی ئەم ئوممەتەیش جگە لە پێغەمبەر (ﷺ) کەسی تر شتی وای نەکردووە، بۆیە زاناکان لەمە هۆشداریان داوە.

* سولەیمانی کوڕی عبداللەی کوڕی محمدی کوڕی عبدالوهاب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: هەندێك لە زانایانی ئەم دواییە (متأخرين) باسی ئەوەیان کردووە سوننەتە پاشماوەی دەمی پیاوچاکان بخورێتەوە بە مەبەستی فەڕو بەرەکەت یان دەست هێنان بە جلو بەرگیاندا یان ماچکردنی دەستو قاچیان، بردنی منداڵ بۆ لایان تا تەحنیکیان بکەن بۆیانو تا یەکەمین شت بڕواتە گەدەیانەوە لیکی پیاوچاکان بێت، یان بەرەکەت وەرگرتن لە عەرەقیان یان لەهەر شتێکی تر...

ئیمام نەوەوی لە شەرحی (صحیحی مسلم)دا هەموو ئەو فەرموودانەی هێناوە کە هاوەڵان بە مەبەستی فەڕو بەرەکەت منداڵی خۆیانیان بردۆتە خزمەت سەروەر (ﷺ)

وای گومان بردووە کە هەمان شێوەیش لەگەڵ پیاوچاکان‌و زانایاندا دەکرێت کە ئەمەش زۆر هەڵەیەکی ئاشکرایە لە چەند ڕوویەکەوە:

١-ئەگەر ئێمە گومانمان هەبێت لە چاکی‌و تەقوای کەسێك، بەلام دڵنیانین لەسەر ئەو چاکیە تەمەنی تەواو دەکات (سوء الخاتمة)ی بەسەردا نایەت‌و کردەوەی چاکیش بە خاتیمەکەیەوە بەندە، نابێت بە تەمای فەڕو بەرەکەت بیت لە شوێنەوارو پاش خوانەکانی.

٢- هەروەك هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) جگە لە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هیچ هاوەڵێکی دوای خۆیدا شتی وایان نەکردووە، خۆ ئەگەر شتێکی دروست‌و چاك بووایە لەپێش ئێمەوە ئەوان دەیانکرد، تەنانەت لەگەڵ ئەبوبەکرو عمرو عثمان‌و علی‌و ئەوانی تریشدا شتی وایان نەکردووە هەرچەندە ئەوانە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە.

هەروەها تابعین لەگەڵ سەعیدی کوڕی موسەیب‌و عەلی کوڕی حوسەین‌و ئووەیسی قەرەنی‌و حەسەنی بەصری‌و کەسانی تریشدا ئەم کارەیان نەکردووە، بە مەرجێك هەموو لا لەسەر تەقواو خواناسینیان یەکن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەرەکەت وەرگرتنە تایبەت بووە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ).

٣- هەرگیز هیچ کەس لە پێغەمبەرەوە نزیك نابێتەوە لە فەزڵ‌و بەرەکەتدا، چجای بچێتە ئاستی ئەو زاتەوە.

٤- کەس ناتوانێت صاڵحیەت‌و پیاوچاکی مرۆڤ بکێشێت، چونکە ئەوە کارێکە لەناو دڵدایەو دڵیش کەس پێی نازانێت مەگەر بە ئایەت ئاشکرای بکات وەك هاوەڵان کە قورئان وەسف‌و سەنای چاکیان دەکات یان پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها سەردەمی تابیعین بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((خير القرون قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم)). بەلام خەڵکانی تری بێجگە لەوان خەڵك گومانی پیاوچاکییان لێ دەکات‌و دڵنیانین لێیان‌و هیوادارین واش بن ان شاء الله.

٥- ئەم بە پیرۆزو گەورە ڕاگرتنەی جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ دەڵێت نابێتەهۆی فیتنەو فیزو بەگەورە سەیری خۆکردنو ڕووپامایی نواندن کە ئەوەش لەلایەن خەڵکیەوە وەك مەدحکردنو وەسفکردنیان وایە بە کردەوە کە زۆر لە دەربڕینی دەم گەورەترە.

کەواتە بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵگرتنی کۆرپەلەو بردنی بۆخزمەت پیاوچاکان بەهیوای تەحنیك کردنیانو بەرەکەتاوی کردنیان بیدعەیەو داهێنراوێکی ترسناکەو پێشینەی چاکی ئەم ئوممەتە نەیانکردووە لە دوای پێغەمبەر (ﷺ).[1]

چوارەم:

ئایا تەحنیك بەچی دەکرێت؟ لە سوننەتدا هاتووە بە خورما دەکرێت:

* عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: عبداللەی کوڕی زوبێرمان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی تەحنیکی بکات، زۆر گەڕاین بەدوای خورماداو زۆر بە نارەحەت دەستمان کەوت.[2]

لە ڕیوایەتێکی تری (مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی وەرگرتو خستیە باوەشیو داوای خورمایەکی کرد، عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بۆماوەی سەعاتێك وەستاین ئەوجا پەیداکراو پێغەمبەر (ﷺ) خستیە دەمیەوەو جوویو پاشان دەمەجووەکەی کردە دەمی عبداللەو بەو جۆرە یەکەمین قەترەیەك چووە ناو سکی عبداللەوە تفی پێغەمبەری خوابوو (ﷺ).[3]

---

١ تیسیر العزیز الحمید شرح کتاب التوحید (١٨٥-١٨٦).

٢ مسلم (٥٦٧١).

٣ مسلم (٥٦٦٧).

تەنانەت (ابن ابی شیبە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) یەك باسی جیای نووسیەوە بەناوی (خورما کاتێك تەحنیکی کۆرپەلەی پێ دەکرێت).[١]

منیش دەڵێم: ئەگەر خورما دەست نەکەوت، بە هەموو شتێکی شیرینی تر دەکرێتو ئەگەر هەنگوین بێت چاکترە:

* ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: لەکاتی لەدایکبوونیدا هەنگوین دەدرێت لە مەڵاشوی.[٢]

پێنجەم:

مەبەست لە وتەکەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) کە فەرموویەتی (فیبرك علیهم) واتە داوای بەرەکەتو پیرۆزبوونی بۆ دەکردن.

* وەك چۆن لە ڕیوایەتی (أبو داود)دا هاتووە دەفەرموێت: (یؤتی بالصبیان فیدعوا لهم بالبرکة) واتە منداڵانیان بۆ دەهێناو ئەویش دوعای بەرەکەتی بۆ دەکردن.

شەشەم:

چۆنیەتی دووعاکردن بە پیرۆزی ئەوەیە بڵێیت: (بارك الله فیك)

* وەك لە فەرموودەیەکی درێژی (ابن مسعود)دا هاتووە (خوا لێی ڕازی بێت) کە تیایدا هاتووە دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێرم بکە؟ ئەویش دەستی هێنا بە سەرمداو فەرمووی پێم: ((بارك الله فیك، فانك غلام مُعلَّم))[٣]

* سەلەمەی کوڕی وەردان دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی (خوا لێی ڕازی بێت) تەوقەی لەگەڵ خەڵکەکەدا دەکرد گەیشتە سەرەی من لێی پرسیم: تۆ کێی؟ وتم: من لە (بني لیث)م سێ جار دەستی هێنا بەسەرمداو فەرمووی: (بارك الله فیك).[٤]

---

١ مصنف ابن ابي شیبە (کتاب الطب) (١٩/٨).

٢ المغني (٤٩٧/٢).

٣ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە.

٤ رواه البخاري في الادب المفرد (٩٦٦).

حەوتەم:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە سوننەتە کۆرپە ببرێت بۆلای کەسانێك کە دووعای فەڕوبەرەکەتی بۆ بکەن.

ئەم کارە تایبەت نیە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)و بەس، بەڵکو پێشینەی چاك (رەحمەتی خوایان لێ بێت) منداڵەکانیان بردووە بۆ لای پیاوچاكو زاناو لەخواترسان بەهیوای ئەوەی دووعای خێریان بۆ بکەنو دووعای صاڵحیەت بۆ کۆرپەکانیان بکەن:

* عەلقەمە لە دایکیەوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: (کە خەڵکی منداڵیان دەبوو دەیانهێنا بۆ لای ئەو، ئەویش دووعای فەڕو بەرەکەتی بۆ دەکردن)[١]

* موعاویەی کوڕی قوڕە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: کاتێك (إياس) لەدایکبوو، کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوام کۆکردەوەو دەعوەتم کردنو پاش نان خواردن هەموویان دووعای خێری زۆریان کرد، منیش وتم: ئێوە دووعاتان کردو (بارك الله) لە هەموو دووعاکانتان، بەڵام منیش هەندێك دووعا دەکەم ئێوە ئامین بکەن بۆی، دەڵێ: دووعای زۆرم کرد بۆ دینداریو عاقڵیو شتی تریش، پاشان دەڵێ: من کە پاشتر سەیری ئەو منداڵەم دەکرد ئاسەواری ئەو دووعایانەم تێدا بەدی دەکرد.[٢]

* ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەدهەم پیاوێکی صاڵح بوو، کاتێك لە مەککەدا ئیبراهیمی بوو، خستیە پارچەیەك قوماشو گەڕاندی بەسەر خواناسو پیاوچاکانو دنیانەویستەکاندا پێی دەوتن: دووعای خێری بۆ بکەن ئیبراهیم دەڵێ: وادیارە دووعای هەندێکیانی بە ئاشکرا تێدا دیاربووە.[٣]

---

١ رواه البخاري به (الادب المفرد)دا (٩١٢).

٢ هەمان سەرچاوە (١٢٥٥).

٣ رواه ابو نعيم في الحلية (٧/٣٧) وابن عساكر في تأريخه (٦/٢٨٦).

هەشتەم:

منداڵ لەکاتی لەدایکبووندا چی لێ دەکرێت:

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە سوننەتە ئەمانەی لەگەڵدا بکرێت:

١-تەحنیك کردنی بە خورما.

٢- بردنی بۆ خزمەت ئەوانەی دووعای فەڕو بەرەکەتی بۆ دەخوازن.

٣- ناونانی.

٤-سوپاسکردنی پەروەردگار لەسەر لەدایکبوونی منداڵەکە بەبێ ناتەواوی‌و بە سەلامەتی:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما أنعم الله على عبد نعمة (في أهل ومال و ولد) فقال: الحمدلله (رب العالمين)، إلا كان قدُعطى خيراً مما أُخذ))[1]

واتە: خوا هیچ بەخشینێکی (لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەس) نەداوە بە هیچ بەندەیەکی‌و وتبێتی (سوپاس بۆ خوا پەروەردگاری جیهانیان، مەگەر ئەوەی پێی درابێت پاشتر باشترە لەوەی لێی سەنراوەتەوە).

* کثیری کوڕی عەبید دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) هەر کاتێك منداڵێکیان ببوایە نەیدەپرسی کوڕە یان کچ، بەڵکو هەمیشە دەیفەرموو: (خُلق سوياً) واتە تەواوەو نوقسان نیە؟ دەیان وت: بەڵێ: ئەویش دەیفەرموو (الحمدلله رب العالمين).[2]

---

١ رواه ابن ماجة (٣٨٠٥) واسناده حسن.

٢ رواه البخاري في (الادب المفرد)دا (١٢٥٦). (لە باسی گوێ نەدان نە نێرو مێی‌و هەواڵی تەواوی پرسین).

٥- بانگدان بەگوێی منداڵەکەدا:

* (أبی رافع) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: (کاتێك فاطمة (خوا لێی ڕزای بێت) حەسەنی بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی دا بەگوێی حەسەنی کوڕی عەلیدا).[١]

* عبداللەی کوڕی ئەبوبەکر دەگێڕێتەوە کە عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێك منداڵیان ببوایە دەیخستە پارچە پەڕۆیەكو بانگی دەدا بەگوێی ڕاستیداو قامەتیشی بە گوێی چەپیدا دەخوێند.[٢]

٦- دروستکردنی خواردن لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا:

کە عەرەب پێی دەڵێن: ڕۆژی خورس کە بریتیە لە خوارنێك کە لەو ڕۆژەدا لێ دەنرێتو خەڵکی بۆ بانگ دەکرێت کە ژنەکە بە بێوەی لە ژانو ئێش ڕزگاری بووەو منداڵەکەی بووە.

ئەم خواردنە لە سەردەمی نەفامیشدا دروستکراوەو ئیسلامیش هێشتوویەتیەوە.

* بیلالی کوڕی عەکی (العکی) دەڵێ: منو ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمو عبدالعزیزی کوڕی قەریرو موسای کوڕی یەسار چووین بۆ سەردانی یەحیای کوڕی حەسانی (البکری) فەلەستینی لە لادێکەی خۆی، ئەویش خواردنی زۆری خستە بەردەستمان، موسا چووە دواوەو وتی من بەڕۆژووم، یەحیا وتی: بۆماوەی چل ساڵ ئا لەم مزگەوتەدا هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (بنی کنانە) بوو بەرنوێژی بۆ دەکردین (أبا قرصافە)یان پێ دەووت، ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، من کوڕێکم بوو لەو ڕۆژەی بەڕۆژووبوو دەعوەتم کردو ئەویش ڕۆژووەکەی شکاند، ئیبراهیم هەستا مزگەوتەکەی گسکداو موسایش ڕۆژووەکەی شکاند.[٣]

---

١ رواه أبو داود (٥١٠٥) والحاكم (١٧٩/٣) وصححه الحاكم والترمذي.

٢ رواه عبدالرزاق في (مصنف)دا (٧٩٨٥).

٣ رواه البخاري في (الادب المفرد)دا (١٢٥٣). وە دەڵێ ناوی ئەو هاوەڵە (جندرة بن خيشنة)بوو (خوا لێی ڕازی بێت).

* موعاویەی كوڕی قوڕڕە دەڵێ: كاتێك إیاس لەدایكبوو، كۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوام دەعوەت كردو لەپاش نان خواردن دووعای خێریان كرد.[١]

* شافعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: چوون بۆ دەعوەتی (وەلیمەی منداڵبوون) واجبە، هەرچەندە ڕێگەیش نادەم بە نەچوون بۆ دەعوەتەكانی تری وەك أملاك، ڕزگاربوونی ژن لە حەمل، خەتەنەسوران‌و ڕووداوی خۆش، بەڵام وانازانم جگە لە (وەلیمە) كەس گوناهبار نابێت نەچێت بەدەمیانەوە.[٢]

منیش دەڵێم: ئەم خواردنە جیاوازە لە خواردنی (العقیقە) كە لە ڕۆژی حەوتەمدا حەیوانێك یان دووان سەردەبڕدرێت‌و دواتر باسی دەكەین إن شاء الله.

نۆیەم: سوننەتە مژدەدان‌و پیرۆزبایی لەو كەسەی منداڵی دەبێت:

* خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ﴾[٣]

* چونكە مژدەدان دڵی موسڵمان خۆش دەكات، سوننەتە مرۆڤ دڵی برا موسڵمانەكەی خۆش بكات، ئەگەر مژدەی لە دەست دەرچوو با پیرۆزبایی لێ بكات، چونكە موژدەدان بۆ دڵخۆشكردنە، بەڵام پیرۆزبایی دووعای چاكەكردنە بۆ منداڵەكە لەپاش زانینی هەواڵەكە:

هەر بۆیە كاتێك خوای گەورە تەوبەی كەعبی كوڕی مالیك‌و هاوەڵەكانی ڕاگەیاند (خوا لێیان ڕازی بێت) مژدەدەرێك ڕایكرد بۆلای مژدەی دایەو پاشتر خەڵكەكە لە مزگەوت پیرۆزباییان لێ كرد.[٤]

لە سەلەفی صاڵحەوە هەندێك شێوازی پیرۆزبایی دەگێڕنەوە لەوانە:

---

١ هەمان سەرچاوە (١٢٥٥).

٢ الاستذكار (٥/٥٣١).

٣ الصافات (١٠١).

٤ تحفة المودود (٥٨-٥٩).

* هیثمی کوڕی جمّاز دەڵێ: لە خزمەت حەسەنی بەسریدا پیاوێك بە پیاوێکی تری وت: پیرۆزت بێت سوارچاکێك! حەسەن فەرمووی: چۆن دەزانی سوارچاك دەردەچێت؟ کێ دەڵێ حوشترەوان یان گاوان دەرناچێت؟!

بەڵکو بڵێ: شکرت الواهب، وبورك لك في الموهوب، وبلغ أشده، ورُزقت برّه)[1]

واتە: سوپاسگوزاری بەخشندەبیت، بەخششەکەت لێ پیرۆزبێت، پێ بگاتو لەگەڵ تۆشدا چاك بێت.

* هەروەها سەری بن یەحیا دەڵێ: جارێك لە حزور حەسەنی بەسریدا (رەحمەتی خوای لێ بێت) پیاوێك بە هاوڕێیەکی خۆی وت: پیرۆزت بێت ئەو سوارچاکەت (کە بووتانە) لەوێدا پێشەوا حەسەن فەرمووی: بە چیدا دەزانیت سوارچاك دەردەچێت؟ ئەی کێ دەڵێ دارتاش یان خەیات دەرناچێت؟!

پیاوەکەش وتی: ئەی چی بڵێم قوربان؟ ئەویش فەرمووی بڵێ: (جعله الله مباركاً عليك وعلى امة محمد (ﷺ)) واتە: خوا پیرۆزی بکات بۆ تۆو ئوممەتی محمد (ﷺ).[2]

هەر بەم شێوەیەش لە (أيوب السختياني)یەوە دەگێڕنەوە (رەحمەتی خوای لێ بێت).[3]

*　　　*　　　*

---

١ رواه ابن الجعد في (المسند)دا (٣٥٢٣) وابن ابي الدنيا في (العيال) (٢٠١).

٢ رواه الطبراني في (الدعاء)دا (٩٤٥).

٣ رواه ابن ابي الدنيا في (العيال)دا (٢٠٢) والطبراني في (الدعاء)دا (٩٤٦).

## فەرموودەی بیستو چوارەم

## ((العقيقة))

## سەربڕینی حەیوان لە ڕۆژی حەوتەمدا

عن سُمره بن جندب (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((كُلُّ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسمَّى)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە (٥/٧-١٢،٨) وە أبو داود (٢٨٣٧) لە باسی (العقیقە)و ترمذي (١٥٢٢) و النسائی (٤٢٢١) و إبن ماجە (٣١٦٥)و الدارمی (٢٠٢١)و الحاکم (٢٣٧/٤)و کەسانی تریش.

فەرموودەیەکی (صحیح)ە، ترمذي و حاکمو أشبیلی بە صحیحیان داناوە.

### ئەو فەرمانو ئادابانەی لە فەرموودەکەوە وەردەگیرێت:

یەکەم: مانای وشەی (العقیقە): سەربڕینی حەیوان بەبۆنەی لەدایکبوونی منداڵەوە لە ڕۆژی حەوتەمدا.

دووەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە عەقیقە شتێکی دروستو ڕەوایە:

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بەردەوام لە حیجازدا عەقیقە کراوە لە کۆنو نوێداو زاناکان کاریان لەسەر کردووەو مالیك دەڵێ ئەمە یەکێکە لەو مەسەلانەی هەموو لەسەری کۆکنو کەس قسەیەکی لەسەر نیە.

* هەروەها دەڵێ: ئەوانەی کە (عەقیقە) بە سوننەت دەزانن: عبداللەی کوڕی عباسو عبداللەی کوڕی عمر و دایکی بڕواداران عائیشە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت)و تەنانەت کۆمەڵێکی زۆر لە ژمارە نەهاتووی زاناکانیش ئەمە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن، هەر کاتێکیش کە مەسەلەیەك لە سوننەتدا چەسپا کارپێکردنی واجب دەبێت.

ابن منـذر دەڵـێ: کۆمـەڵێك لەوانـەی کـە بـە (أصـحاب الـرأی) ناسـراون عەقیقـە بـە سوننەت نازانن‌و بەمەش پێچەوانەی سوننەتی چەسپاوی پێغەمبەریان کردووە (ﷺ)و هەروەها پێچەوانەی هاوەڵان‌و تابیعینیان کردووە.[1]

سێیەم: مەکروهە عەقیقە نەکردن بۆکەسێك لە توانایدا هەبێت بیکات:

* (أبو زناد) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (عقیقە تایبەتمەندیەکی موسـڵمانانەو پێیان ناخۆش بووە وازی لێ بهێنرێت)

* حەنبەل دەڵێ: (أبوعبدالله أحمدی کوڕی حەنبەل) فەرموویەتی: پـێم خـۆش نیـە بۆ کەسێك بتوانێت عەقیقە بکات‌و کەچی وازی لێ بهێنێت‌و نەیکات چـونکە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((الغُـلاَم مُـرتهنٌ بِعَقِيقَتِـهِ)) واتـە: منـداڵ پەیوەسـتە بـە عەقیقەکەیەوەو ئەمەش توندترین فەرمودەیە لەم بارەیەوە هاتبێت)[2]

چوارەم: ئایا ئەگەر لەو کاتەدا پارەی نەبوو دەتوانێت قەرزی بۆ بکات؟

*حارث دەڵێ: لە أحمدی کوڕی حەنبەلم پرسی: ئەی ئەگەر لەکاتی منداڵبوونەکـەدا پارەی لەدەستدا نەبوو چی بکات؟ أحمد فەرمووی: ئەگەر قەرزی بۆ بکات هیـوام وایـە خوای گەورە بۆی ببژێرێت چونکە سوننەتێکی زیندوکردۆتەوە.[3]

پێنجەم: بۆ کوڕ چەندو بۆ کچ چەند حەیوان سەردەبڕدرێت؟

* (أم کُـرز) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەڵێـت: لـە پێغەمبـەری خـوام بیـست (ﷺ) دەیفەرموو: ((عن الغلام شاتان، وعـن الجاريـة واحـدة، لايـضركم ذكرانـا كـنّ أو اناثـاً))[4] واتە: بۆ کوڕ دوو مەڕ، بۆ کچیش یەك مەڕ، زیانی نیە ئەگەر مەڕەکان نێرین یان مێ).

---

١ تحفة المودود لا (٦٩).

٢ تحفة المودود (٧٧،١٠٠).

٣ تحفة (١٩).

٤ رواه أبوداود (٢٨٣٤،٢٨٣٥) والترمذي (١٥١٦) والحاكم (٢٣٧/٤) وصححه الترمذي والحاكم

شەشەم: فەرموودەکە ئەوە دەبەخشێت کە عەقیقەکردنەکە لە ڕۆژی حەوتەمدا دەبێت:

ئەگەر لەو کاتەدا ڕێك نەکەوت زانایان پێیان وایە کە بخرێتە ڕۆژی چواردەیەمو ئەگەر ئەو ڕۆژەیش ڕێك نەکەوت با ڕۆژی بیستو یەکەمین بێت.

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەگەر لە ڕۆژی حەوتەمدا عەقیقەی بۆ نەکرا با لەڕۆژی چواردەدا بکرێت ئەگەر لەو ڕۆژەیشدا نەکرا با لە ڕۆژی بیستو یەکدا بکرێت.[١]

* ترمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەلای زانایان بەمە کار کراوەو پێیان خۆش بووە لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەرببڕێتو ئەگەر نەکرا با لە ڕۆژی چواردەدا بێتو ئەگەر نەشکرا با لە ڕۆژی بیستو یەکدا بکرێت.[٢]

منیش دەڵێم: ئەمە وەك سوننەت نەك وەك واجب، بەڵکو لە هەر ڕۆژێکدا بکرێت دروستە.

* محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (هیچی تێدانییە ئەگەر لەپێش ڕۆژی حەوتەم یان دوای ئەو ڕۆژە عەقیقە بکرێت، دەیووت: گۆشتەکەشی بە ئارەزووی خۆی دەبەخشێتەوە)[٣]

حەوتەم: مەبەست لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) چیە کە دەفەرموێت ((كُل غُلاَم مُرتهنٌ بِعَقِيقَتِه))؟

* یەحیای کوڕی حەمزە دەڵێ: لە (عطاء الخراساني)م پرسی دەربارەی مانای ((كُل غُلاَم مُرتهنٌ بِعَقِيقَتِه)) لە وەڵامدا وتی: لە شەفاعەتی منداڵەکەی بێ بەش دەبێت.

---

١ التمهيد (ابن عبدالبر) (٣١٢/٤) و (شرح السنة) بغوي (٢٦٨/١١).

٢ السنن (٨٦/٤).

٣ رواه ابن ابي شيبه (٤٣٠٨).

هەروەك حەسەنی بەسریو عطای کوڕی ئەبی ریباحو قەتادەو احمدو بغوییش هەمان مانای ئەو فەرموودەیان کردووە (رەحمەتی خوایان لیٚ بێت).[1]

هەشتەم:

کۆمەڵێك مەسەلەی پەیوەست بە عەقیقەوە:

١-سەربڕینی باشترە لەوەی پارەکەی بکات بەخێر با زیاتریش بدات:

* (أبو داود) (رەحمەتی خوای لیٚ بێت) گوێم لێبوو جارێکیان لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان پرسی ئایا کامیانت پیٚ خۆشە سەربڕینی حەیوانەکە یان خێرکردن بە پارەکەی؟ فەرمووی: سەربڕین.[2]

ئەمەش لەبەرئەوەیە کە سەربڕینی حەیوان سوننەتێکی شەرعیە بەهۆی دووبارە بەخشندەیی خوا لەگەڵ دایكو باوکەکەدا، وە نهێنیەکی شاراوەی جوانی تێدایە کە لە کۆندا یادەوەری سەربڕینی ئەو مەڕەیە لەجیاتی اسماعیل پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) -لەلایەن باوکیەوە ئیبراهیم پێغەمبەر- و لەدوای ئەو بوو بە سوننەت لەناو نەوەکانیدا کە لەکاتی لەدایکبووندا حەیوانێك سەربڕێت لەجیاتیدا، ئەمەش دوورنیە کە لەبەرئەوە بێت کە لە شەڕی شەیتان بەدووربێت وەك چۆن لەکاتی دروستبوونی دایكو باوکدا (ناوی خوا دەهێنرێت تا پاشتر لە شەڕی شەیتان بەدوور بێت) بۆیە زۆر بە دەگمەن باوك هەبووە واز لە عەقیقە بهێنی مەگەر پاشان شەیتان چووبێتە بنکلێشەی منداڵەکەیو نهێنیەکانی شەرعیش زۆر لەمانە زیاترو گەورەترن.[3]

---

١ العيال (ابن ابي الدنيا) (٧٦) و شرح السنة للبغوي (٢٦٨/١١).

٢ رواه الخلال في (تحفة المودود) لا(١١١).

٣ تحفة المودود (١١١،١١٢).

٢- هەر كەسێك بە سكێك دوو كوڕ یان بوو لەباتی هەریەكەیان یەك مەڕ سەردەبڕێت:

* (لیث)ی كوڕی سەعدە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ژنێك دوو كوڕی ببێت بە سكێك، دەڵێ: یەكی مەڕێك لەباتیاندا سەر دەبڕێت والله أعلم.

٣- ئەو مەرجانە چین كە دەبێت لەو مەڕەدا هەبێت كە سەری دەبڕێت:

* مالك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هەر كەسێك عەقیقە بۆ منداڵێك بكات هەروەك قوربانی وایە، نابێت حەیوانەكە كوێر یان شەل یان شوێنێكی شكا بێت، یان نەخۆش بێت یان نابێت لە گۆشتەكەی یان پێستەكەی بفرۆشێت.[١]

* ترمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: زانایان پێیان وایە ئەو مەڕەی دروستە عەقیقەی پێ بكرێت كە دروستە قوربانی پێ بكرێت.[٢]

٤- عقیقەكردن بە مەڕ یان بە مانگا یان بە حوشتر باشە؟

* (ابن ابی ملیكە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: كاتێك خوشكێكی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) كوڕێكی بوو (دوو بەچكە حوشتریان سەربڕی) كاتێك عائیشەیان لەمە ئاگاداركرد فەرمووی: (پەنا بە خوا بەڵكو دەبێت وەك پێغەمبەر فەرموویەتی: (شاتان مكافئتان)[٣].

* ابو داود (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بیستم لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەیفەرموو: (مكافئتان) واتە: وەك یەك وابن، لە یەكەوە نزیك بن)[٤]

---

١ الموطأ (٢/٥٠٢).

٢ السنن (٤/٦٨).

٣ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٥٩).

٤ السنن (٢٨٣٤).

٥- لەکاتی سەربڕینی حەیوانەکەدا چی دەڵێت:

* لە عائیشەوە دەگێڕنەوە (خوا لێی ڕازی بێت)و ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((اذبحوا علی إسمه، فقولوا: بسم الله، اللهم لك واليك، هذه عقيقة فلان))[1] واتە: سەری بڕن بەناویەوەو بڵێن: بەناوی خواوە، ئەی پەروەردگارم بۆ تۆیەو بۆ لای تۆیە، ئەمە عەقیقەی فلان کەسە (...) ناوی منداڵەکە دەبرێت.

* (ابن منذر) دەڵێ: ئەمە شتێکی باشە بەڵام ئەگەر نیەتی عەقیقە بیّو هیچیش نەڵێ هەر دروستە.

زانایانی فەرمودە لەسەر ئەوەن کە وەك چۆن لە قوربانیدا ناو دەبرێت لە عەقیقەیشدا ناودەبرێت. ئەمە وتەی: قەتادەو عطاو أحمدو ابن منذرە (رەحمەتی خوایان لێ بێت).

٦- شکاندنی ئێسقانەکانی مەڕەکە:

زۆربەی زانایان پێیان باش نیە کە ئیسقانەکانی ورد بکرێتو پێیان خۆشە لە جومگەکاندا لەت بکرێت.

* جەعفەر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا کە لەو عەقیقەیەی کە فاطمة بۆ حسنو حسینی سەربڕی یەك لاقی بنێرن بۆ مامانەکەو ((ولا یکسر منها عظم)) وە ئێسقانەکانی نەشکێنن)[2]

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە جومگەکاندا دەبڕدرێتو لێدەنرێتو ئێسقانەکانی ناشکێت.[3]

---

[1] رواه عبدالرزاق (٧٩٦٣). وابن ابي الدنيا في العيال (٤٣).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٤٣١٤). صحيح الاسناد.

٣ رواه ابن ابي شيبه (٤١١٥).

* (عطاء)یش دەڵێ: هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) حەزیان نەکردووە ئێسقانەکانی عەقیقە بشکێنرێت.

* جابری کوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت)و زوهەریو ابن جورەیجو شافعیو احمدی کوڕی حەنبەل ئەم ڕایەیان هەبووە.

٧- گۆشتەکەی چۆن دەبەخشرێتەوە:

زانایان وایان پێ خۆشە کە هەروەك قوربانی ببەخشرێتەوە کە خۆی لێی بخواتو لێی بکات بەخێرو لێشی بدات بە دراوسێکانی.

* (ابن عبدالبر) دەڵێ: هەمان شت لە عائیشەوە گێڕراوەتەوەو جمهوری زانایانیش لەسەر ئەوەن.[١]

٨- گۆشتەکەی بە کوڵاوی ببەخشرێتەوە:

زانایان وایان پێ خۆش بووە کە گۆشتەکە بە کوڵاوی بنێردرێت بۆ دراوسێکان چونکە بەو کارەی ئەرکی لێنان لەسەر هەژارانو دراوسێکانی ناهێڵێو ئەوەش چاکەیەکی زیاترەو سوپاسێکی زیاتری ئەم نیعمەتەیەو زیاتریش دڵی دراوسێکان، خۆش دەکات، چونکە کەسێك گۆشتی بەحارزکراویو لێنراوی بۆ بنێردرێت خۆشحاڵتر دەبێت لەوەی کە بە کاڵی بۆی بنێردرێتو ئەرکی کوڵانو لێنانی بخاتە ئەستۆ.[٢]

* جابری کوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە عەقیقەدا مەڕەکە لە جومگەکانیدا دەبڕدرێتو لەناو ئاوو خوێدا دەکوڵێنرێتو پاشان دەنێردرێت بۆ

---

١ التمهید (٣٢١/٤).

٢ تحفة المودود لا(١٢٦).

دراوسێکان، دەوترێت ئەمە عەقیقەی فلان کەسە، (أبو زبیر) دەڵێ بە جابرم وت: ئایا سرکەی تێبکرێت؟ فەرمووی: بەڵێ خۆشتری دەکات.[1]

* (الفضل)ی کوڕی زیاد دەڵێ: بە احمدی کوڕی حەنبەلیان وت: ئایا بە ئاوو خوێ لێدەنرێت؟ فەرمووی: وا سوننەتە، وتیان: ئەی ئەگەر بە شتێکی تر لێنرا؟ فەرمووی خراپی چیە.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ پێیان وت: ئاخر قورسە لەسەریان لێشی بنێن، فەرمووی: با تەحەمولی ئەوەش بکەن.[2]

نۆیەم:

(ویحلق رأسه) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە لە ڕۆژی حەوتەمدا سەری منداڵەکە بتاشرێت، ئەوەش مەبەستی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((وأمیطوا عنه الاذی)) خراپەو پیسی لێ دوور بخەنەوە:

* سلمانی کوڕی عامیر (الضبيّ) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مع الغلام عقیقه، فاهریقوا عنه دماً وامیطوا عنه الاذی))[3]

واتە: منداڵ عەقیقەی لەگەڵدایە بە سەربڕینی مەڕێكو کورتکردنەوەی قژی ڕزگاری بکەن لێی.

* حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ((اماطة الاذی)) واتە سەرتاشینی منداڵەکە.[4]

---

١ رواه ابن ابي الدنیا (العیال) (٤٨) اسناده حسن.

٢ رواه الخلال کما في (تحفة المودود) لا (١٢٦)

٣ رواه البخاري (٥٤٧٢).

٤ رواه ابو داود (٢٨٤٠).

## مەسەلەیەك:

ئایا سەری كچیش دەتاشرێت؟ بەڵێ
* مالك لە (الموطأ ٢/٥٠١ )دا هێناویەتی: لە جەعفەری كوڕی محمدەوەو ئەویش لە باوكیەوە كە وتویەتی: فاطمەی كچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورسایی قژی حەسەن‌و حسین‌و زینب و أم كلثوم زیووی بەخشی)[1]
و ((یحلق رأسه)) گشتیەو كچیش دەگرێتەوە.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) حیكمەتی لابردنی مووی سەری منداڵی بە لابردنی دەردو داو خراپە ناوبردووەو فەرموویەتی: ((وأمیطوا عنه الاذى)) سەری بتاشن‌و خراپەی لێ دوور بخەنەوەو ئەمەش كوڕو كچ دەگرێتەوە والله أعلم.

دەیەم: سوننەت وایە قژەكەی بكێشرێت‌و بە قورسایی مووەكانی زیو بكرێت بەخێر:
* عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەقیقەی كرد بە سەربڕینی مەڕێك بۆ حەسەن‌و فەرمووی: یا فاطمة، احلقي رأسه وتصدقي بزنة شعره فضة))

واتە: ئەی فاطمة ، سەری بتاشەو بە قورسایی مووەكانی قژی زیو بكە بە خێر.
دەڵێ: فاطمة كێشای‌و قورسایی درهەمێك یان چەند درهەمێك بوو.[2]

* حنبل دەڵێ: گوێم لێ بوو أبوعبدالله (أحمدی كوڕی حەنبەل) دەیفەرموو: ئاساییە ئەگەر بە قورسایی مووەكانی قژی كۆرپەلە بكات بە خێر.[3]

١ حدیث مرسل صحیح.
٢ رواه ابن ابي شیبه (٤٢٨٦)، والترمذي (١٥١٩) وقال حدیث حسن غریب.
٣ رواه الخلال في (جامعه) تحفة المودود لا (١٦).

یازدەیەم: سوننەتێکی فەرامۆشکراو: لەپاش تاشینی سەری منداڵەکە سەری بساوێ بە زەعفەران:

* بورەیدە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە سەردەمی نەفامیدا ئەگەر عەقیقەیان بۆ منداڵ بکردایە، بە خوێنەکەی لۆکەیان لێ دەژەندو لەپاش سەرتاشین دەیانهێنا بە سەریدا، بەڵام پاش ئەوەی ئیسلام هات ئێمە مەڕێکمان سەردەبڕیو سەری منداڵەکەمان دەتاشیو پاشان بە زەعفەران دەمان هەسوی).[1]

عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە سەردەمی نەفامیدا کاتێك عەقیقەیان بۆ منداڵێك دەکرد، بە خوێنەکەی لۆکەیان خوێناوی دەکردو لەپاش سەرتاشین دەیانهێنا بە سەریدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((اجعلوا مكان الدم خلوفاً))[2] واتە: لەجیاتی خوێنەکەدا شتێکی بۆن خۆشی لێ بدەن.

دوانزەیەم: ئایا وەلیەکەی لەپێشدا سەری بتاشێت یان مەڕەکە سەربیڕێت؟

بەو دەقانەی پێشوودا دەردەکەوێت کە عەقیقەکە لەپێشەوەیەو بەدوایدا سەرتاشینەکە دێتو پاشتریش زەعفەرانەکە دەدرێت لە سەری.

* عطاء (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەپێشدا سەردەبڕێت بۆیو پاشان سەری دەتاشرێت).[3]

سێزدەیەم: سوودەکانی تاشینی سەری منداڵی تازە لەدایکبوو:

* ابن قیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەندێك لە سوودەکانی سەرتاشینی کۆرپە لەوەدایە کە خراپەو زیانی لێ دوور دەکەوێتەوەو هەروەك لابردنی مووە لاوازەکانەو لە شوێنیدا مووی بەهێز سەوز دەبێتو بەسوودتریش دەبێت بۆ سەر، سەر سووکیەکە

---

١ رواه أبو داود (٢٨٤٣) واسناده صحيح.

٢ رواه ابو يعلى في مسنده (٢٨٤٣) وزاسناده صحيح.

٣ رواه ابن ابيي الدنيا في (العيال) لا (٧٧).

بۆمنداڵەكە، كونە ووردەكانی سەر واڵادەبن‌و هاڵاو گەرماوی سەر لەوێوە دەردەچێت‌و بەو هۆیەشەوە چاوو گوێ‌و بۆنی بەهێز دەبێت.

چواردەیەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە لە ڕۆژی حەوتەمدا سوننەتە ناوی منداڵەكە بنرێت كە پێشتر بەدرێژی لەسەری دواوین.

*　　　　*　　　　*

## فەرموودەی بیستو پێنجەم
## بەزەیی هاتنەوە بە منداڵدا

عن عبدالله بن عمرو (رضی الله عنهما) قال: قال رسول الله (ﷺ) ((لَيسَ مِنا مَن لَم يَرحَم صَغيرَنَا، وَيعرف حَقَّ كَبيرَنَا)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

احمد لە (٢/١٨٥،٢٢٢) گێڕاویەتیەوەو بوخاری لە (الادب المفرد)دا (٣٥٦-٣٥٨-٣٦٣) لە باسی بەزەیی هاتنەوە بە منداڵانداو أبوداود (٤٩٤٣) و الترمذی (١٩٢٠) و الحاكم (ا/٦٢) دەڵێ: فەرموودەیەكی (صحیح)ەو لەسەر مەرجی مسلمە.

لەڕاستیشدا فەرموودەیەكی (صحیح)ە.

### ئەو ئەحكامو ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دوو مەسەلەی گرنگ بە منداڵانەوە هەیە:

١- بەزەیی هاتنەوە بە منداڵاندا واجبە.

٢- ڕێزگرتنی منداڵانیش لە گەورەكان واجبە.

دووەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەزەیترین كەس بووە بەرامبەر بە منداڵان:

* ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەزەیترین كەس بووە بە خێزانیوماڵو منداڵ) وە لە ڕیوایەتێكی تردا بە منداڵان)[1]

نموونەش لەسەر سۆزو بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بە منداڵاندا زۆرو لەڕادەبەدەرەو لە باسكردن نایەت:

١ رواه البخاري في الادب المفرد (٣٧٦) وابن عساكر في (تأريخ دمشق) (٤-٨٨).

١- ماچکردنی منداڵانو باوەش پێداکردنیانو ئەو فەرموودەیەی کە بەرامبەر (عەرەبە دەشتەکیەکە) فەرمووی:

(ئایا ئێوە منداڵان ماچ دەکەن؟ ئێمە ماچیان ناکەین پێیِ فەرموو: ((أو املك لك ان نزع الله من قلبك الرحمة))[1]

واتە: جا من چیم لە دەست دێت ئەگەر خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی لە دڵدا دەرهێنابی.

٢- کورتکردنەوەو خێراکردنی نوێژەکەی کاتێك گوێی لە گریانی منداڵێك بووایە:

* (أبو قتادە) (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((أنّي لأقوم في الصلاة أريد أن أُطَوِل فيها فاسمع بكاء الصبي فاتجوز في صلاتي كراهية ان أشق على اُمهِ))[2]

واتە: من دەچمە ناو نوێژەوەو دەمەوێت درێژی بکەمەوە بەڵام کە گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت نوێژەکەم کورت دەکەمەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك دایکی نیگەران بکەم.

٣- فەرمانی داوە کە نوێژ درێژ نەکرێتەوە لەبەرئەوەی منداڵان ناڕەحەت نەکات:

* ئەبو هريرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((اذا أم احدكم الناس فليخفف، فانّ فيهم الصغير والكبير والضعيف والمريض، فاذا صلى وحده فليصل كيف شاء))[3]

---

١ رواه البخاري (٥٩٩٨).

٢ رواه البخاري (٧٠٧).

٣ رواه مسلم (٩٧٩).

واتە: هەر كاتێك بەرنوێژی موسڵمانانتان كرد با بە سووكی پێیان بكەن، چونكە هەیانە منداڵەو هەیانە بە تەمەنەو هەیانە لاوازەو هەیانە نەخۆش، بەڵام هەر كەسێك بە تەنها نوێژی كرد بە ئارەزووی خۆی درێژی بكاتەوە.

٤- سەردانی كردنی منداڵان كاتێك نەخۆش بن، وەك لە فەرموودەی (٣٥)دا بەدرێژی هێناومانە.

٥- گریان بۆیان كاتێك دەمرن: وەك چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ) گریا بۆ ئیبراهیمی كوڕی كاتێك بە منداڵی مرد.

هەروەك كچەزاكەی گرتە باوەش كاتێك گیانی دەداو چاوەكانی پڕبوون لە ئاو سەعد (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەمە چیە؟ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆش دەگریت؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده، وانما يرحم الله من عباده الرحماء))[1]

واتە: ئەمە سۆزو ڕەحمو بەزەیی خوایەو خستوویەتیە دڵی بەندەكانیەوە، بەڕاستی خوا ڕەحم بەو كەسانە دەكات لە بەندەكانی كە بەڕەحمو بەزەین.

٦- سوعبەتو شۆخی كردنو یاری كردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ منداڵاندا زۆر زۆرن، هەندێكی لە فەرمودەی (٣٧)دا باس دەكەین.

٧- هەڵگرتنو لەباوەش گرتنیان چ لە نوێژو دەرەوەی نوێژیشدا.

٨- بڕینی وتارو هاتنەخوارەوە لە مینبەرەكەی لەبەر خاتری منداڵان وەك چۆن بۆ حەسەنو حسەین وای كرد (خوایان لێ ڕازی بێت)

* بریدە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری بۆ دەدایەنو لەوكاتدا حەسەنو حسەین هاتن كە یەكی كراسێكی سووریان لەبەردابوو، دەكەوتن (تازە پێیان گرتبوو) پێغەمبەر (ﷺ) لە مینبەرەكەی دابەزیە خوارەوەو هەڵی گرتنو

---

١ رواه البخاري (١٢٨٤،٥٦٥٥) ومسلم (٢٠٩٠).

لە بەردەمی خۆیدا داینان، پاشان فەرمووی: ((صدق الله ورسوله ﴿إِنَّمَا أَموَالُكُم وَأَولادُكُم فِتنَةٌ﴾ نظرت الى هذين الصبيين يمشيان ويعثران، فلم أصبر حتى قطعت حديثي ورفعتهما))[1]

واتە: بەڕاستی خواو پێغەمبەرەكەی ڕاستن (سامانو ماڵو منداڵتان هۆی فیتنەو تاقیكردنەوەتانن) ﴿إِنَّمَا أَموَالُكُم وَأَولادُكُم فِتنَةٌ﴾ من لەكاتی وتاردا كە ئەم دوو منداڵەم بینی لە بەردەممدا دەهاتنو دەكەوتن خۆم بۆ پێ نەگیراو وتارەكەم بڕیو هەڵم گرتن.

٩- هێشتوویەتی منداڵان یاری لەگەڵدا بكەنو بچنە سەر پشتی لە نوێژدا بەڵكو نوێژەكەیشی درێژبكاتەوە لەكاتی سوژدەدا لەبەر خاتری ئەوانو بفەرموێت ((ان ابني إرتحلني فكرهت أن أعجله حتى يقضى حاجته))[2]

١٠- هەروەها ئەو ئافرەتە زیناكارەی كە دوو گیان بوو بە زیناكەیەوە (خوا لێی ڕازی بێت) لەبەر خاتری كۆرپەكەی سكی حوكمی زیناكاری بەسەردا نەدا لە جێدا بەڵكو دوای خست بۆ پاش ئەوەی منداڵەكەی ببێتو گەورەبێت.

١١- بانگكردنی منداڵان بە وشەی ((یا بُنّی)) واتە كوڕی خۆم، كوڕی شیرینم.

* ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((يَا بنيّ))[3]

١٢- نزاكردنی بۆیانو دەستهێنانی بە سەریاندا وەك سۆزو بەزەیی بۆیان.

١٣- زۆر لە باوەشگرتنی منداڵانو دانانیان لەسەر ڕانیو باوەشیدا.

* ئوسامەی كوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیبردمو لەباوەشیدا دایدەنامو حەسەنیشی لەسەر ئەو ڕانەكەی دادەناو پاشان

---

١ رواه أحمد (٥/٣٥٤) وابن خزيمة (١٤٥٦) والحاكم (١/٢٨٧).

٢ پێشتر ڕاویەكەی دراوە.

٣ رواه ابن ابي شيبه (٦٦٠٨) و أبو داود (٤٩٦٤).

هەردووكیانی بەخۆیەوە دەگوشیو پاشان دەیفەرموو: ((اللهم ارحمهما فاني أرحمهما))[١] واتە: ئەی پەروەردگارم رەحمیان پێ بكە چونكە من ڕەحمم هەیە بۆیان.

سێیەم: بەزەیی هاتنەوە بە منداڵدا دەبێتە هۆی چوونە بەهەشت:

* وەك لە چیرۆكی ئەو ئافرەتەدا دەردەكەوێت كە خورماكەی خۆیشی كرد بە دوو لەتەوەو بە هەر یەكەیان لەتێكی پێدان، وە خۆی هیچی نەخوارد پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی: ((ان الله قد أوجب لها بها الجنة، او اعتقها بها من النار))[٢]

واتە: خوای گەورە بەو هۆیەوە بەهەشتی بڕیارداوە بۆ ئەو ژنە، یان بەو هۆیەوە لە ئاگر ڕزگار دەكات.

چوارەم: نابێت لە هەڵەو ناشەرعیان چاوپۆشی بكرێت:

ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەو سۆزو خۆشەویستیەیدا بۆ منداڵان هەرگیز چاوپۆشی نەكردووە لە هەڵەو خراپەی منداڵان با نزیكترین كەسیشی بوبن‌و با منداڵەكش پێی ناخۆش بێت‌و خەفەتی پێ بخوات یان بیگرێنێت، وەك چۆن لەگەڵ حەسەنی كچەزایدا كردی كاتێك لە خورمای زەكاتی خواردو بەزۆر لە دەمی دەرهێنایەوە بە لیكەكەشیەوە.

پێنجەم: بەشی دووەمی فەرمودەكە ((وَيعرف حَقَّ كَبيرَنَا)) پێویستە لەسەر باوك‌و دایك‌و مامۆستاو سەرپەرشتیاران كە ڕێزگرتنی گەورەو بە ئەدەب بوون لەگەڵیاندا یان تێدا دروست بكات كە ئەمەش مافی منداڵە لەسەر باوكان.

* سوفیان (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: جاران دەیان فەرموو: لە مافی منداڵ بەسەر باوك‌و دایكیەوە ئەوەیە فێری ئەدەب‌و ڕێزی بكات.[٣]

---

١ رواه البخاری (٦٠٠٣).

٢ رواه مسلم (٦٧٨٧).

٣ العیال (٣٣٢).

* (أبوالحسن المداینی) دەڵێ: كاتێك زیاد بوو بە والی عیراق چووە سەر مینبەرو سوپاس‌و سەنای خوای كردو پاشان وتی: ئەی خەڵكینە من كۆمەڵێ خەڵەل‌و ناتەواوی‌و بەڵا دەبینم، كە خەڵكی قسەی خێرو ئامۆژگاریان تێدا ناكەن‌و وازیان لێ هێناوە. دەبینم ڕێزگرتنی گەورەپیاوان‌و حورمەت دانان بۆ زانایان‌و بەتەمەن‌و ڕیش سپیەكان تەواو نیە، من پەیمانم داوە بە خوا ئەگەر پیرێك بێت بۆ لام‌و ڕێزی لێ نەگیرابێت لەلایەن گەنجەكانەوەو بەسوك سەیر كرابێت سزای لەسەر دەدەم چونكە ڕێزو حورمەتی خەڵكی بە گەورەپیاو و زانایان‌و بەتەمەنەكانیانەوەیە.[1]

شەشەم: هەندێك ئادابی ڕێزلێنان كە دەبێت منداڵان فێربكرێن:

١-دەبێت بچوك سڵاو لە گەورە بكات:

* أبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((یسلم الصغیر علی الكبیر))[2] واتە: منداڵ سڵاو لە گەورەتر لەخۆی بكات.

٢-بچوك لەپێش گەورەوە قسە نەكات:

* سەهلی كوڕی ئەبی حەسمەو ڕافعی كوڕی خەدیج دەگێڕنەوە كە موحەیسەی كوڕی مەسعودو عبداللەی كوڕی سەهل بەرەو خەیبەر كەوتنەڕێ‌و لەناو دارخورماكاندا لەیەك دابڕان، لەوێ عبدالله كوژرا، جولەكەیان تۆمەتبار كرد، حوەیسەو مەحیسەی ئامۆزای‌و عبدالرحمنی برای هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) مەسەلەكەیان باسكردو سەرەتا عبدالرحمنی برای كەوتە قسەكردن كە لە هەردووكیان بچوكتربوو، پێغەمبەری

١ مكارم الاخلاق للخرائطی لا (٣٥٢).

٢ رواه البخاري (٦٢٣٤).

خوا (ﷺ) فەرمووی: ((الكُبرَ الكبرَ)) یان فەرمووی ((لیبدأ الاكبر)) واتە: (گەورەتر قسە بكات گەورەتر) یان با گەورەتر دەست پێ بكاتو ئیتر ئەو دووانەكە دەستیان كرد بە گفتوگۆكردن).[1]

٣- پێش گەورەكان ئاو نەخواتەوە:

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەركاتێك ئاو بگێڕدرایە دەیفەرموو: ((ابدأوا بالكبیر)) واتە: لە گەورەكانەوە دەست پێ بكەن یان ((بالاكابر)) واتە لە گەورەكانەوە.[2]

منیش دەڵێم: ئەمە لە خواردنەوەدا لە گەورەوە دەست پێ دەكرێت پاش ئەو لەلای ڕاستی ئەو گەورەیەوە دەست پێ دەكات بەو جۆرە سوننەتە ئیتر با ئەوەی لای ڕاستی منداڵیش بێتو ئەگەر بیەوێت بە گەورەكانی تری بدات دەبێت پرس بكات بە ئەو منداڵەی لای ڕاستیەوەیە چونكە مافی خۆیەتی.

* سەهلی كوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە خواردنەوەیەك هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش لێی خواردەوە، بینی لەلای ڕاستی ئەو كوڕێك دانیشتبوو لەلای چەپیەوە بەساڵاچوان دانیشتبوون، ڕووی كردە كوڕە گەنجەكەو پێی فەرموو: ((أتأذنُ لي أن اعطي هؤلاء)) ئایا ڕێگام دەدەی لەپێش تۆ بیدەم بە ئەوان؟

كوڕەش ووتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا پاش ماوەی دەمی تۆ بە كەس نادەم، پێغەمبەریش (ﷺ) ئاوەكەی دایەدەستی)[3].

---

١ رواه البخاری لە (الصحیح)دا و أبوداود (٤٥٢٠) وشەكان هی ئەوە.

٢ أبو یعلی لە (مسند)ەكەیدا (٣١٥/٤) اسنادەكەی صحیحە.

٣ رواه البخاري (٥٦٢٠).

٤-دەبێت خزمەتی گەورەساڵان بکات:

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك دەچووە سەرئاو، منو کوڕێك مەسینەی ئاوەکەیمان بۆ هەڵدەگرتو بە ئاو تاراتی دەگرت)[1]

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی بۆ شاری مەدینە هێنا من تەمەنم دە ساڵان بوو، کاتێك لە دنیا دەرچوو من تەمەنم بیست ساڵان بوو، دایکانی باوەڕدارانم هانیان دەدام کە بەردەوام خزمەتی بکەم).[2]

٥-دەبێت پێشی گەورە نەکەوێت لە ڕۆیشتندا:

* مالیك کوڕی میغوەل دەڵێ: لەگەڵ طلحةی کوڕی مصرّفدا بەڕێگایەکدا دەڕۆیشتین تا گەیشتینە تەنگەلانێكو ئەویش پێشکەوتو لای کردەوە وتی: بەس بمزانیایە یەك ڕۆژ لەمن گەورەتری پێشت نەدەکەوتم.[3]

٦- بانگکردنی گەورەکان بە (مامەگیان) یا عمی:

* عبدالرحمن کوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە ڕۆژی جەنگی بەدردا لەناو ڕیزەکاندا بووم سەیری ڕاستو چەپی خۆم کرد، دوو منداڵی ئەنصاریم کەوتە بەرچاو کە تازە پێگەیشتبوون، ئاواتم خواست کە لەنێوان هەردووکیاندا بوومایە، یەکێکیان بە چاو ئاماژەی بۆ کردم وتی: مامەگیان، ئەبوجەهل دەناسی؟

---

١ رواه البخاري (١٥٢) ومسلم (٢٧١).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٤٢٤٧).

٣ رواه الخطيب له (الجامع لاخلاق الراوي) (٢٥٢).

وتم: بەڵێ، ئیشت پێی چیە برازای خۆم؟ وتی: هەواڵم پێگەیشتووە کە جنێوی بە پێغەمبەری خوا داوە(ﷺ)، دەی سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بەس چاوم بەچاوی بکەوێت لەکۆڵی نابمەوە تا یەکێکمان نەکوژێت،

زۆر سەرم سوڕما لەو کارەی، ئەوی تریشیان بەو شێوە سەیری کردمو بەو جۆرەی ئەوی پێ وتم).[١]

*　　　*　　　*

١ رواه البخاري (٣١٤١) ومسلم (١٧٥٢).

## فەرموودەی بیستو شەشەم

## گەورەیی چاکە لەگەڵ کچان

عن انس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ)) وَضَمَّ أَصَابِعَهُ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

ابن ابی شیبه لە (٥٤٩١)دا ڕیوایەتی کردوە لە باسی (نواندنی سۆز لەگەڵ کچاندا) لەلایەن باوکانەوە، البخاری لە (الادب المفرد) (٨٩٤) و مسلم (٦٧٨٨)و الترمذی (١٩١٤) و الحاکم (٤/١٧٧).

### ئەو ئەحکامو ئادابانەی لەم فەرموودە وەردەگیرێت:

یەکەم:

لە ڕەوشتی سەردەمی نەفامیەو خوای گەورە بە قێزەون باسی کردووە کە ناوچاو دان بەیەکداو پێ ناخۆشبوونی لەدایکبوونی کچ، تەنانەت هەیانبووە بە زیندویی کردوویەتی بەژێر خۆڵەوە ئەوەندە ڕقی لە کچ بووە!

خوای (عزوجل)یش لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾[1].

واتە: هەرکاتێك مژدە بدرایە بە یەکێکیان بەوەی کچی بووە، دەمو چاوی ڕەش هەڵدەگەڕاو پشی دەخواردەوە، لە شەرماندا خۆی لە خەڵکی دەشاردەوە کە کچی بووە، ئایا بە سەرشۆڕی گەورەی بکات یان بیکات بەژێر خۆڵەوە بەڕاستی شتێکی خراپو چەوت دەکەن.

---

[1] النحل (٥٨-٥٩).

دووەم:

خوای گەورە ئیسلامی بە چەشنێك هێنا، کە هانی خەڵکی دەدا حەز بکەن کچیان ببێتو کچ گەورە بکەن، لەسەر ئەوەش پاداشتی گەورەی داناوە، لەوانە:

١- پەروەردەکردنو فێرکردنی کچ دەبێتە هۆی چونە بەهەشت.

* ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَن كانت له أنثى فلم يئدها ولم يهنها ولم يؤثر ولده عليها -يعني الذكور- أدخله الله الجنة))[١]

واتە: هەر کەسێك کچی هەبێتو زیندە بەچاڵی نەکاتو سوکایەتی پێ نەکاتو لەگەڵ کوڕەکانیدا فەرقی نەکات ئەوە خوای عزوجل بەو هۆیەوە دەیخاتە بەهەشتەوە.

* جابری کوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((من كنّ له ثلاث بنات يؤويهنّ ويرحمهنّ ويكفلهنّ، وجبت له الجنة البتة، قيل يارسول الله: فان كانت اثنين؟ قال: وان كانت اثنتين قال: فرأى بعض القوم ان لو قالوا واحدة، لقال: واحدة))[٢]

واتە: هەر کەسێك سێ کچی هەبێت گۆشیان بکاتو سۆزو بەزەییان پێ ببەخشێتو ئەرکیان لە ئەستۆ بگرێت، ئەوە بێ دوو دڵی بەهەشتی مسۆگەر کردووە، هاوەڵان وتیان: ئەی ئەگەر دوو کچی هەبوو، فەرمووی: با دوو کچیشی هەبێت، ڕاوی دەڵێ: هەندێك پێیان وایە ئەگەر بیان ووتایە یەك کچ، دەیفەرموو: یەك کچیش.

٢- وەك لە فەرموودەکەی ئەنەسدا پێشتر باسمان کرد هەر کەسێك کچی هەبێتو گەورەیان بکات دەبێتە هاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەهەشتدا.

٣- چاکبوون لەگەڵ کچدا دەبێتە هۆی پاراستنی باوكو دایك لە ئاگری دۆزەخ.

---

١ رواه أحمد (٢٢٣/١) و أبوداود (٥١٤٦).

٢ رواه أحمد (٣٠٣/٣) و البخاري له (الادب المفرد)دا (٧٨) واسنادەکەشی صحیحە.

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئافرەتێك هات بۆلام كە دوو كچی پێبوو، داوای خواردنیان كرد، هیچم شك نەبرد پێیان بدەم تەنها دەنكە خورمایەك نەبێت، كە دام پێی لەتی كردو دای بە هەردوو كچەكەی، خۆی هیچی نەخوارد، پاشان هەستان‌و چوونە دەرەوەو پێغەمبەر (ﷺ) هاتەژوورەوەو مەسەلەكەم بۆ گێڕایەوەو ئەویش فەرمووی: ((مَن ابتلى من هذه البنتان بشيء كنّ له ستراً من النار))و لە وشەیەكدا ((مَن ابتلى بشيء فأحسن اليهن من البنات كنّ له حجاباً من النار))[1].

واتە: هەر كەسێك خوای گەورە تاقی بكاتەوەو هەندێك كچی پێ ببەخشێت دەبنە بەربەست لەنێوان ئەو و ئاگری دۆزەخدا، لە ڕیوایەتێكدا– ئەگەر چاك بێت لەگەڵیاندا دەبنە هۆی پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ.

* هەروەها لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: (ئافرەتێكی هەژار هات بۆ لام‌و دوو كچی خۆی پێ بوو، منیش سێ دەنكە خورمام پێدان‌و ئەویش یەكی دەنكێكی دا بە كچەكانی‌و خواردنیان ویستی دانەكەی خۆی ببات بۆ دەمی، دەبینێت هەردووكیان سەیری دەكەن ئەویش خورماكەی كرد بە دوو كەرتەوەو یەكی لەتێكی پێدان، منیش زۆر سەرسامی ئەو دیمەنە بووم‌و پاشان بۆ پێغەمبەری خوام گێڕایەوە (ﷺ))و ئەویش فەرمووی: ((ان الله قد اوجب لها بها الجنة، او اعتقها بها من النار))[2]

واتە: خوا بەو هۆیەوە بەهەشتی پێ دەبەخشێت یان لە ئاگر دەیپارێزێت.

* عەقەبەی كوڕی عامر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((من كان له ثلاث بنات وصبر عليهنّ وكساهنّ من جدّته كنّ له حجاباً من النار))[3].

---

١ رواه البخاري (١٤١٨) ومسلم (٦٧٨٦) وترمذي (١٩١٣).

٢ رواه مسلم (٦٧٨٧).

٣ رواه أحمد (١٥٤/٤) والبخاري له (الادب المفرد)دا (٢٧٦١)، اسنادەكەی صحیحه.

واتە: هەر کەسێك سێ کچی هەبێتو بە سەبریێت لەگەڵیانو بە جوانی جلو بەرگیان بۆ بکات دەبنە هۆی پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ.

سێیەم:

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان دوای ئەوەی ئەم هەموو مژدە خۆشانەی بیست لەسەر بەخێوکردنو پەروەردەکردنی کچ پێویستە سوپاسو ستایشی خوا بکات لەسەر ئەو کچە نازدارانەی خوای میهرەبان پێی بەخشیوە تا ببنە هۆی پاراستنی لە ئاگری دۆزەخو هۆی چونە بەهەشتی، هەرگیز توورە نەبێتو دەموچاو نەدات بەیەکدا لەسەر ئەم نیعمەتە:

* صاڵحی کوڕی احمدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: باوکم هەر کاتێك کچێکی ببووایە دەیفەرموو: پێغەمبەران باوکی کچ بوون، دەیووت: کە دەربارەی کچان فەرموودەی زۆرم پێ گەیشتووە.[1]

* یەعقوبی کوڕی بەختان دەڵێت: حەوت کچم بوو، هەرکە کچێکم دەبوو، دەچووم بۆ لای احمدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت)و ئەویش دەیفەرموو: ئەی باوکی یوسف پێغەمبەران باوکی کچ بوون، ئیتر بەو قسەیەی خەفەتم نەدەماو ناوی دەکرد بە دەروونمدا.[2]

* رەبیعی کوڕی رۆحی کوڕی سەفوان دەڵێ: هەواڵی ئەو ئافرەتەیان لەلای وەلیدی کوڕی مسلمدا باسی کرد کە (١٠) کچی بووە، لێیان پرسیوە ئایا ئەگەر کچێکی ترت ببێت سوپاسی خوای لەسەر دەکەیت؟ لە وەڵامدا وتوویەتی: نەء هەرگیز، سەری یازدەیەم مەیمونێکی مێینەی بوو.[3]

* * *

---

١ تحفة المودود لا(٥٦).

٢ هەمان سەرچاوە لا (٥٦،٥٧).

٣ رواه ابن عساكر في تأريخه (٢٢/٣٦١،٣٦٢).

## فەرموودەی بیستو حەوتەم
## گەرەویی لەئەستۆگرتنی هەتیوو

عن سهل بن سعد (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: ((أَنَا وَكَافل اليَتِيم فِي الجَنَّةِ كَهذا)) وقال بِاصبعه: السبَابَة وَالوُسطَى)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

ئەحمەد (٣٧٥/٢) ڕیوایەتی كردووەو بوخاری (٦٠٠٥) و لە (الادب المفرد) لا (١٣٣)دا و مسلم (٧٥٧٨)و أبو داود (٥١٥٠)و ترمذی (١٩١٨)و ابن حبان (٤٦٠).

### ئەو ئەحكامو ئادابانەی لە فەرموودەكەوە وەردەگیرێت:

یەكەم: هەتیو ئەو كەسەیە پێش باڵقبوون باوكی مردبێت.

دووەم: ئەگەر هەتیو باڵق بوو ئیتر ناوی هەتیووی لێ دەكرێتەوە.

* عەلی كوڕی ئەبوطالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ئەوەم لەبەركردووە كە فەرموویەتی: ((لايُتم بعد احتلام))[1] واتە: لەدوای باڵقبوونو پێگەیشتن هەتیووی نامێنێتو لە هەتیوی دەردەچێت.

سێیەم: مەبەست چیە لە گرتنە ئەستۆی هەتیوو؟

مەبەست ئەوەیە: ئیشو كارەكانی بەڕێ بكاتو بەرژەوەندیەكانی بپارێزێت لە خواردنو جلوبەرگو پارەكانی بخاتە كاسبیەوەو ئەگەر پارەشی نەبوو خۆی خەرجی بكێشێتو جلی جوانی لەبەر بكاتو تەنهایش لەبەر ڕەزامەندی خوای تەعالا.[2]

چوارەم: قورئانی پیرۆز گرنگی داوە بە گرنگیدان بە هەتیوو سەرپەرشتی كردنیانو پاراستنی بەرژەوەندیەكانیان لە بیستو سێ جێگادا بۆ نمونە:

---

١ رواه أبوداود (٢٨٧٣). والبيهقي لە (السنن الكبرى) (٥٧/٦) واسنادەكەی صحيحە.

٢ الكبائر (الذهبي) لا (١١٠).

١- چاكەكردن لەگەڵ هەتیوانی خستۆتە دوا بەدوای یەكتاپەرستی:

وەك خوای (عز وجل) دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا﴾[1]

٢- سووكایەتیكردنو ڕێزلێنەنانی هەتیوانی بە ڕەوشتی سەردەمی نەفامی نابردووە: وەك دەفەرموێت: ﴿كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ﴾[2]

٣- كردوویەتی بە ڕەوشتی ئەوانەی ئیسلام بەدرۆ دەخەنەوە كە سووكایەتی بە هەتیو دەكەنو بەڕەقی لەگەڵیان دەجووڵێنەوە.

وەك دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ﴾[3]

٤- هەڕەشە لەو كەسانە دەكات كە بە ستەم ماڵی هەتیوان دەخۆن كە لە ڕۆژی دوایدا سكیان پڕ دەبێت لە ئاگر.

وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾[4].

واتە ئەوانەی ماڵو سامانی هەتیوانی ژێردەستیان دەخۆن بە ستەم وەك ئەوەیە ئاگر بكەنە سكیانەوە بە ئاگرو بڵێسەی دۆزەخ دەگەن.

---

١ النساء ٣٦.

٢ الفجر: ١٧.

٣ الماعون: ١، ٢.

٤ النساء: (١٠).

* ابو هريره (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((اجتنبوا السبع الموبقات)) قالوا يارسول الله وماهنّ؟ قال: الشرك بالله والسحر وقتل النفس التى حرم الله الا بالحق واكل الربا واكل مال اليتيم...))[1]

واتە: لە حەوت لەناوبەرەکە دوورکەونەوە وتیان کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: هاوەڵ بۆخوا پەیداکردن و جادووگەری و پیاوکوژی و سووخواردن و خواردنی سامانی هەتیو...هتد.

٥- لە قورئاندا بەرگری لە پێغەمبەرەکەی دەکات کە هەتیوان دڵ شکێنی نەکات وەك دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ﴾[2]

٦- خێرو ماڵ بەخشین بە هەتیوانی کردووە بە بەشێك لە کاری چاکە:

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ﴾[3]

پێنجەم:

هەروەها لە سوننەت و ڕێنموونیەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) گرنگی دان هاتووە بە هەتیوان و چاکەکردن لەگەڵیان و دڵخۆش کردنیان.

١- پێغەمبەر (ﷺ) هانی موسڵمانان دەدات تا هەتیوان لە ئەستۆ بگرن و پاداشتەکەیشی بە هاوڕێیەتی کردنی خۆی لە بەهەشتدا دیاریکردووە وەك فەرموودەکەی سەر باسەکە.

---

١ رواه البخاري (٢٧٦٦) ومسلم (١٧٥).

٢ الضحى: (٩).

٣ البقرة: (١٧٧).

٢- پێغەمبەرمان (ﷺ) پاداشتی ئەو ژنانەی کە شوو ناکەنەوەو خۆیان تەرخان دەکەن بۆ بەخێوکردنی هەتیوەکانیان لەدوای مردنی مێردەکانیان بەهەشتی بەرینی داناوە بۆیان:

* ابو هريره (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((أنا أول من يفتح له باب الجنة، الا انه تأتي إمراة تبادرني: فأقول لها: مالكِ؟ تقول انا إمراة قعدتُ على ايتامٍ لي))[1]

واتە: من یەکەمین کەسم کە دەرگای بەهەشتم بۆ دەکرێتەوە کاتێك دەمەوێت بڕۆمە ژوورەوە دەبینم ئافرەتێك شانەخڕێی چوونە ژوورەوەم لەگەڵدا دەکاتو منیش پێی دەڵێم: چیتە؟ بۆ وا دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: من ژنێکم کە دانیشتم بەسەر کۆمەڵێ هەتیومداو بەخێوم کردوون (واتە شووم نەکردۆتەوە لەبەر ئەوان).

٣- دەست هێنان بەسەری هەتیوانی داناوە بە هۆکاری نەرمبوونی دڵ:

* ابو هريره (خوا لێی ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و سکاڵای دڵڕەقی خۆی کرد، پێغەمبەریش (ﷺ)پێی فەرموو: ((إن اردت تلين قلبك فاطعم المسكين وامسح رأس اليتيم))[2]

واتە: ئەگەر دەتەوێت دڵت نەرم ببێت خواردن بە هەژاران بدەو دەست بە سەری هەتیواندا بهێنە).

٤-دووعابۆکردنی هەتیوان لەکاتی مردنی باوکیانداو دەستهێنان بەسەریاندا:

کاتێك جەعفەری کوڕی أبوطالب شەهیدبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی هێنا بە سەری عبداللەی کوڕیداو فەرمووی: ((اللهم اخلف جعفراً في أهله، وبارك لعبدالله في صفقة يمينه))[3].

---

١ رواه ابو يعلى (٦٦٥١) منذري لە (ترغيب وترهيب)دا دەڵێ: اسنادەکەی (حسن)ە.

٢ رواه أحمد (٢/٢٦٣) والطبراني لە (مكارم الاخلاق) (١٠٧) و اسنادەکەی حسن)ە.

٣ رواه أحمد (١/٢٠٤) و (الضياء في الاحاديث المختارة) (٩/١٦٨) (١٤٤).

واتە: پەروەردگارم جێگای جەعفەر پڕبكەرەوە بۆ كەسەكانیو بەرەكەتیش بخەیتە ڕزقو كەسایەتی دەستی عبدالله.

* ابو هريره (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((خير نساءٍ ركبن الابل –قال أحدهما– صالح نساء قريش –وقال الاخر– نساء قريش احناه على يتيم في صغره وارعاه على زوج في ذات يده))[1]

واتە: باشترین ژنانێك كە سواری حوشتربوون –یەكەمیان– ژنە چاكەكانی قورەیشە، –دووەمیان– ئەو ژنانەی قورەیشن كە زۆر بەسۆزو بەزەین لەگەڵ منداڵە هەتیوەكانیانداو زۆریش لە دڵی مێردان لەكاتی دەست تەنگیدا).

٥–پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەدحو سەنای ئافرەتانی عەرەب دەكات لەبەر سۆزو شەفەقەیان بۆ هەتیوەكانیان.

شەشەم: كاری هەتیو بەخێوكەرو كاری پێغەمبەر (ﷺ)و لەیەك دەچن:

(... لەوانەیە بۆیە بەخێوكەری هەتیوان دەچێتە بەهەشت یان پلەو پایەی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) نزیكە لە بەهەشتدا لەبەرئەوەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوە بۆ گەلێك كە نەفامنو لە ئیسلامدا زۆر نەشارەزانو ئەو دەیانگرێتە ئەستۆو فێریان دەكاتو ڕێنموونیان دەكات.

هەروەها بەخێوكەری هەتیویش هەر وایە كۆمەڵێك منداڵ دەگرێتە ئەستۆ كە لە ئایینەكەیو لە كاروباری دنیایش سفرەو ناشارەزایەو ئەو دەستی دەگرێتو فێری دەكاتو ئەدەبی جوانی دادەدات).[2]

---

١ رواه مسلم (٦٥٤٥).

٢ (الفتح) (١٠/٤٣٧).

حەوتـەم: ئەگـەر بەخێوکـەری هـەتیوو نـەداربوو دەتوانێـت لـە پـارەی هـەتیوەکان بخوات بەپێی پێویست:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەر ئەو ئایەتە: ﴿مَن كَان غَنيـاً فَلْيَـستَعفِف ومَـن كَان فَقيراً فَلْيَأكل بالمَعرُوف﴾ واتـە هـەر کـەس دەوڵەمەنـدە بـا خـۆی لـە ماڵی هـەتیو بپارێزێتو هەر کەسیش هەژارە با بەپێی پێوسیتو بەجوانی لێی بخوات)

دەڵێـت: دەربـارەی بەخێوکـەری هـەتیوان هاتۆتـە خـوارەوە: کـە ئەگـەر هـەژارو نـەداربوو دەتوانێـت لـە پارەکانیـان بخـوات بـەڵام بەشـێوەیەکی جـوان واتـە بـەپێی پێویست).[١]

* عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێـك هاتە خزمەت پێغەمبـەر (ﷺ)و پێـی وت: مـن زۆر دەسـت کـورتو نـەدارمو کۆمـەڵێك هەتیوم لەلایە، پێی فەرمو: ((كل من مال يتيمك، غير مسرف، ولامبادر ولامتأثل))[٢]

واتـە: قـەیناکات لـە پـارەی هـەتیوەکان بخـۆ بـەڵام زیـادەڕۆی نەکـەیتو دەسـت پێشخەری نەکەیت لە خەرجیداو لێی هەڵنەگریت بۆ خۆت.

هەشتەم: ئایا ماڵی هەتیو زەکاتی لێ دەدرێت؟

* لە عومەری کوڕی خطابەوە دەگێڕنەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) کـە فەرموویـەتی: (ابتغوا باموال اليتامى لاتذهبها الصدقة)[٣] واتە: ئاگـات لـە مـاڵی هـەتیوان بێـتو بۆیـان بخەنە کاسبیەوە با زەکات گشتی تەواو نەکات.

---

١ رواه البخاري (٢٧٦٥).

٢ رواه ابو داود (٢٨٧٢) و ابن ماجة (٢٧١٨).

٣ رواه ابو عبدالله لە (الاموال)دا (١٣٠١) والدار قطني (٢/١١٠).

* ابن عبدالبر دەڵێ: لە عەلی کوڕی ئەبوطالب‌و عبداللەی کوڕی عمرو حەسەنی کوڕی عەلی‌و جابرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە فەرموویانە ماڵی هەتیو زەکاتی دەکەوێت، هەروەك مالکیش لە عمرو عائیشەوە هەمان حوکم دەگێڕێتەوە.[١]

* أبوعبید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لەلای ئێمە لەژێر ڕۆشنایی ئەو پاشماوانەی لە پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بەدرو کەسانی دوای ئەوانیش لە تابیعینەوە دەگێڕنەوە کە زەکات دەرکردن لە ماڵی هەتیوان واجبە).[٢]

* هەروەها دەڵێت: لەلای ئێمە زەکات دەرکردن لە ماڵی منداڵی بچکۆڵەدا واجبە، سەرپەرشتیارەکەی پێی هەڵدەستێت وەك چۆن کڕین‌و فرۆشتنەکانی بۆ دەکات، هەر کاتێك گەورەبوو پارەو پوولەکانی دەداتەوە دەستی خۆی‌و وەك عبداللەی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: فێری کاسبی بکات چونکە گوناهبار دەبێت پارەکانی بداتە دەستی ئەو ئەویش هەمووی فەوت‌و ڕەوت بکات وەك (طاوس) دەڵێ: ئەگەر وانەکات گوناهبارە.[٣]

نۆیەم: لێدان‌و تەمێکردنی هەتیووان:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پیاوێك بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: لەسەر چی دەتوانم لە هەتیوەکانی ژێردەستم بدەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((مما کنت ضارباً منه ولدك، غیر واق مالك بماله ولامتأثل من ماله مالاً))[٤]

واتە: لەسەر هەر شتێك کە لە کوڕەکەی خۆت دەدەیت بەڵام ماڵ‌و سامانت لە ماڵ‌و سامانەکەی ئەو بپارێزەو پارەکانی ئەومەخەرە لاوەو کۆی مەکەرەوە بۆ خۆت).

---

١ الاستذکار (٣/١٥٥).

٢ الاموال (٤٦٠).

٣ هەمان سەرچاوە لا (٤٦١)..

٤ رواه الطبراني في (الصغیر)دا (٢٤٤) و ابن حبان (٤٢٤٤) و اسنادەکەی لاوازە

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەربارەی ئەدەب دادانی هەتیوان دەفەرموێت: (اني لاضربه حتى ينبسط)[١]

واتە: جاری وا دەبێت ئەوەندەی لێ دەدەم لە زەویەکەدا تەخت ڕادەکشێت.

* * *

[١] البخاري في الادب المفرد (١٤٢)، اسناده حسن.

## فەرموودەی بیستو هەشتەم

## خۆگرتنو ئارامی لەكاتی منداڵ مردندا

عن انس بن مالك (ﷺ) : ان رسول الله (ﷺ) أتى على إمراة تبكي على صبيٍّ لَها، فَقَالَ لَها: ((إتّقِ الله وَاصبِري))، فقَالت: وَما تبالي بِمصيبتي، فَلما ذَهَب قيل لَها: إنّهُ رَسول الله (ﷺ)، فأخذها مثل الموت، فأتت بابه –فلم تجد على بابه بوابين– فقالت: يَا رسُول الله، لَم أعرفك، فقال: ((إنّما الصَّبرُ عِندَ أولِ صَدمَة)) او قال ((عِندَ أوّل الصدمَة)).

## دەرهێنانی فەرموودەكە:

بوخاری (١٢٥٢) ڕیوایەتی كردووەو (١٢٨٣)، (١٣٠٢)و (٧١٥٤) و مسلم (٢٠٩٥) وشەكانیش هی ئەوە، أبوداود (٣١٢٤) وە الترمذی (٩٨٧)و النسائی (١٨٦٩)، ابن ماجه (١٥٩٦) گێڕاویانەتەوە.

## ئەو ئەحكامو ئادابانەی لە فەرموودەكە وەردەگیرێت:

یەكەم: مانای ئارامگرتن چیە؟

ئارامگرتن: سێ بنەمای هەیە: یەكەم/ لە دڵو دەروونەوە لەو بڕیارەی خوا دڵگرانو زویر نەبێت، دووەم/ زمانی بگرێت لە وشەی ناشوكریو ناڕەزایی دەربڕین، سێیەم/ بە ئەندامەكانی لەشی ناڕەزایی دەرنەبڕێت وەك لەخۆدانو ڕەش پۆشیو سنگ دادڕانو قوڕپێوان.

* ناصرالدین الدمشقی لە كتێبی (برد الاكباد) لا(٦٧)دا دەڵێ: هەر كەسێك ئەو سێ بنەمایەی پێشوو لەخۆیدا بهێنێتەدی ئەوە كارەساتە گەورەكەی بۆ دەبێتە پاداشتو بەخششێكی زۆر گەورەو وای لێ دێ موسیبەتو ڕووداوە دڵتەزێنەكان بە بەخشندەیی خوای دەزانێتو پێی خۆشە نەك دڵتەنگ.

دووەم: سەبرو خۆگری لەسەر بەڵاو قەزاو قەدەرەکانی خوا لەلای هەموو زانایان واجبە، نیوەی باوەڕە، ئیمان دوو بەشە: بەشێکیان سەبرو ئارامیە بەشەکەی تریان شوکرو سوپاسەو خوای گەورەیش دەفەرموێت: : ﴿ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾.[١]

* احمدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: سەبرو ئارامگرتن لە نزیکەی (٧٠) ئایەتی قورئاندا باسکراوە.[٢]

سێیەم:

مەبەست لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت ((الصبر عند أول صدمة)) واتە ئارامگرتنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە ساتەوەختەکانی سەرەتای بیستنی هەواڵە ناخۆشەکەدا خۆی بگرێت ئەگەرنا هەموو کەسێك بە مروری کات هێور دەبێتەوەو ئارامی ڕووی تێ دەکاتو لەبیری دەچێتەوە، بەڵام ئەجرو پاداشت لەسەر خۆگری یەکەمجاری کارەساتەکەیە چونکە ئاکامی هەموو کارەستاێك سەبرو خۆگریو لەبیرکردنە ئیتر با ماوەیەکی زۆریش لەسەر گۆڕەکەی دانیشێت).[٣]

چوارەم:

پێغەمبەر (ﷺ) هاوارو ڕۆڵە ڕۆو دەنگ بەرزکردنەوەی قەدەغەکردووە لە کاتی مردندا یان هەر کارەستێکی تر.

* أبوهریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرد ئوسامە هاوارێکی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لیس هذا مني، وليس بصائح حق، القلب يحزن والعين تدمع ولانقول مايغضب الرب))[٤]

---

١ البقرة: (١٥٣).

٢ مدارج السالكين (١٥٢/٢).

٣ برد الاكباد لا(١٥).

٤ رواه الحاكم (٣٨٢/١) وابن حبان (٣١٦٠) واسناده حسن.

واتە: ئەم کارەی ئوسامە لە کاری ئێمە نیە، ئەم هاوارەیشی هاوارێکی ڕاستو لەجێگەی خۆیدا نەبوو، بەڵی دڵ خەفەتبار دەبێتو چاو فرمێسك دەڕێژێت بەڵام هەرگیز شتێك ناڵێین کە پەروەردگار زویرو توڕەبکات.

هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) هاوارو شیوەنگێڕیو یەخەدادڕینو لە کوڵمدانو شتی تری قەدەغەکردووە.

پێنجەم: لەکاتی ڕوودانو کارەساتی ناهەمواردا موسڵمان دەبێت چی بڵێ؟

* خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾[١]

واتە: ئەی مرۆڤەکان تاقیتان دەکەینەوە بە ترسو لەرزو برسێتیو کەمبوونەوەی سامانو منداڵو باخو باخاتتان، بەڵام مژدە لە سابیرو خۆگران ئەوانەی کە کارەساتێك لێیان ڕوویدات یەکسەر دەڵێن ئێمە موڵکی خواینو سەرەنجامیش هەر دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەو، ئەوانە لێخۆشبوونو ڕەحمەتی پەروەردگاریان بەسەردا دەرژێتو ئەوانە هیدایەت دراوانن.

* (أبو موسى الاشعري) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((اذا مات ولد العبد، قال الله للملائكة: قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون: نعم، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون: نعم، فيقول: ماذا قال عبدي؟ فيقولون: حمدك واسترجع، فيقول: ابنوا لعبدي بيتاً في الجنة وسموه بيت الحمد)).[٢]

---

١ البقرة (١٥٥–١٥٧).

٢ رواه أحمد (٤/٤١٥) والترمذي (١٠٢١) وابن حبان (٢٩٤٨).

واتە: هەرکاتێك منداڵی بەندەیەك بمرێت، خوای عزوجل بە فریشتەکان دەفەرموێت: منداڵی بەندەکەمتان گیان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێت: بەرهەمی دڵیتان کوشت؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێت: ئەی باشە بەندەکەم هەڵویستی چۆن بوو؟ دەڵێن: سوپاسی دەکردیتو (انا لله وانا الیە راجعون)ی دەوت، خوای گەورەیش دەفەرموێت: دەی کۆشکێك لە بەهەشتدا بۆ ئەم بەندەیەم دروست بکەنو ناوی بنێن کۆشکی سوپاس.

* (أُم سلمه) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: ((مامن مسلمٍ تصیبه مصیبة، فیقول ما امره الله، (انا لله وإنا الیه راجعون) اللهم اجرني في مصيبتي واخلف لي خيراً منها، إلا اخلف الله له خيراً منها))[1].

واتە: هەمو موسڵمانێك کە تووشی کارەسات یان مەرگەساتێك دەبێتو ئەوە دەڵێ کە خوا فەرمانی داوە کە بڵێ: (انا لله وإنا الیه راجعون) پاشان بڵێ: ئەی خوای گەورە پاداشتی چاکەم بدەیتەوە لەسەر ئەم کارەساتەمو چاکترم پێ ببەخشەرەوە لێی، ئەوە بێگومان خوا شوێنەکەی پڕ دەکاتەوە بە چاکتر.

* (أُم سلمه) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: چ موسڵمانێك باشترە لە (أبو سلمه) یەکەمین خانەوادەبوو کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و کاتێك لە دەستم چوو ئەم دوعایەم خوێندو خوایش لە (أبوسلمه) چاکتری پێ بەخشیم کە پێغەمبەری خوابوو (ﷺ).[2]

شەشەم:

خەفتاربوونو فرمێسك ڕشتن دژایەتی نیە لەگەڵ ئارامگرتندا لەسەر مردنی منداڵ بەڵکو ئەوە ڕەحمەتێکەو خوا خستوویەتیە دڵی هەر کەسێك لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێت.

---

١ رواه مسلم (٢٠٨٢).

٢ رواه البخاري (١٣٠٣).

* ئەنەسی كوڕی مالك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفـەرموێت: لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چووین بۆلای أبوسیف القین هاوسەری شیرپێدەری ئیبراهیمی كوڕی پێغەمبـەر بووە (ﷺ)و پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوەشی كرد بە ئیبراهیمی كوڕیداو تێرتێر ماچی كـردو بـۆنی دەكـرد، پاشـان جـارێكی تـر چـووینەوە بینیمـان ئیـبراهیم گیـان دەدات، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) هۆن هۆن ئاو بە چاوەكانیدا دەهاتنەوە خوارەوە.

تا عبدالرحمن ی كوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێـت) پێـی وت: تـۆش دەگریـت ئـەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((یا ابن عوف إنها رحمة)) واتـە ئـەی كوڕی عـەوف ئـەوە سۆزو بەزەییـە، پاشـانیش فـەرمووی: ((ان العـین لتـدمع، والقلـب یحزن، ولانقول الا مایرضی ربنا، وانا بفراقك یا ابراهیم لمحزونون)).

واتە: چاو فرمێسك دەڕێژێتو دڵیش غەمبار دەبێت، بەڵام هـیچ شـتێك نـاڵێین جگـە لەو وتانەی خوا پێی ڕازیە، ئێمـەیش هـەموومان ئـەی ئیـبراهیم بـەم كۆچـەت دڵگـرانو خەفەتبارین.

* ئوسـامەی كـوڕی زەیـد (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەڵـێ: كـچێكی پێغەمبـەر (ﷺ) جوابی نارد بۆ پێغەمبەری خواو پێی وت: كوڕێكمان خەریكە دەمرێت وەرە بـۆ لامـان، ئەویش بە نوێنەرێكدا سڵاوی بۆ ناردو پێی فەرموو: ((ان لله ما اخذ وله ما اعطی، وكـلّ عنــده بأجـل مـسمّی، فلتــصبر ولتحتــسب)) واتــە: ئــەوەی دەیباتــەوەو ئــەوەیش دەیبەخشێت هـەمووی هـی خوایـە، هـەموو شـتێك لـەلای خـوا مـاوەی دیـاریكراوی بـۆ دانراوە، با ئەو كچەم ئارام بگرێتو چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت.

لـە درێـژەی فەرموودەكـەدا هـاتووە: منداڵەكـەیان دایەدەسـتی پێغەمبـەری خـواو ئەویش گیانی دەداو ئەمیش چاوەكانی پڕبوون لە ئاو وەك بڵێ: بووە بە پێستە كۆنـە، سەعد (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەم گریـانو شتەت لەچیـە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده، وانمـا یـرحم الله في عباده الرحماء)).[1]

---

١ رواه البخاري (١٢٨٤) (٦٦٥٥). ومسلم (٢٠٩٠).

واتە: ئەمە سۆزو بەزەییەو خوای گەورە خستوویەتیە نێو دڵەکانەوە، خوایش بەس ڕەحم بەو کەسانە دەکات کە بەڕەحمن.

* (ابن قیم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) خشوعیو غەمباریو گریانێك كە دەنگی نەبێتو نیگەرانبوونی دڵی بە سوننەت داناوە بۆئوممەتەکەیو دەفەرموێت: (( العین تدمع، ویحزن القلب ، ولانقول الا مایرضی ربنا))[١]

هەروەك بە سوننەتی داناوە بۆ ئوممەت كە سوپاسی خوا بکرێتو (انا لله وإنا الیه راجعون) بگوترێتو ڕازیبوون بەو کارەی خودا دەرببڕدرێت، ئەمەش دژایەتی نیە لەگەڵ فرمێسك ڕشتنو خەفەتباربوونی دڵ، چونکە ڕازیترین کەس بە کارەکانی خواو سوپاس گوازرترین کەس بۆی (محمد) بووە (ﷺ) کەچی بۆ مردنی کوڕەکەی گریاوەو خەفەتباریش بووە، بەڵام دڵی کێوێك بووە لە ڕەزامەندیو زمانیشی بەزیکرەوە خەریك بووە.

حەوتەم: ئارامگری سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە لەسەر مردنی ڕۆڵەکانیان:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە کوڕێکی (أبوطلحة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەمرێت، (ام سلیم) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: کەس بە باوکی نەڵێت تا من خۆم بۆی باس دەکەم، تەرمی جگەر گۆشەکەی خۆی لە ژوورێکی ماڵەکەیدا داپۆشت، کاتێك (أبوطلحة) گەڕایەوە هەواڵی کوڕەکەی لێی پرسی وتی: کوڕەکەم چۆنە؟ (ام سلیم) وتی: زۆر نتمو بێ دەنگ بووە، هیوادارم بە جوانی بحەوێتەوە، (أبوطلحة) وای زانی مەبەستی ئەوەیە خەوتووە.

١ زاد المعاد (١/٤٩٩).

بۆیە (ام سلیم) خواردنی ئامادەکردو خستیە بەردەستی (أبوطلحة)و پاشان خۆی بۆ جوان کردو بۆنی خۆشی لەخۆی داو ئەویش کاری ژن‌و پیاوی لەگەڵدا ئەنجامداو پاشان ڕووی کردە (أبوطلحة)و پێی وت:

ئەی (أبوطلحة) فلان ماڵ شتێکیان قەرزکرد لە فلان ماڵ‌و هەر ویستیان لێیان داوا بکەنەوە، چوون بەگژیانداو وتیان ناتاندەینەوە! (أبوطلحة)یش وتی: هەقی نیە وایان بکردایە چونکە ئەمانەت دەبێت بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی (ام سلیم)یش وتی: دەی کوڕەکەت سپاردەیەکی پەروەردگار بوو لەلای ئێمەبوو، دەی خوای (عز وجل) سپاردەکەی بردەوەو گیانی سپاردووە، ئەویش هیچی پێی نەکرا جگە لەوەی وتی: (انا لله وإنا الیه راجعون).

ئەنەس دەفەرموێت: لە ڕۆژەکەیدا مەسەلەکەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوەو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((بارك الله لهما في لیلتهما))[1]

واتە: ئەو شەوەیان لێ پیرۆزو موبارەك بێت.

* (ابو علی رازی) دەڵێ: ماوەی سی ساڵ هاوڕێی (فُضیل)ی کوڕی (عیاض) بووم، نەمدیوە پێبکەنێ یان زەردەخەنەیەك بکات تەنها ئەو شەوە نەبێت کە عەلی کوڕی گیانی سپارد، منیش بە سەرسامیەوە لە هۆی ئەو پێکەنینەیم لێ پرسی؟ لە وەڵامدا وتی: خوای گەورە کارێکەو پێی خۆش بووە بیکات دەی منیش پێم خۆشە ئەوەی خوا خۆشی دەوێت‌و حەزی پێ دەکات.[2]

* زوهەری بانی دەڵێت: کوڕێکی (مطرف)ی کوڕی عبداللەی کوڕی شیخیر مرد، ئەویش هەستا ئەسپەکەی زین کردو جلی جوانی لەبەرکرد، وتیان پێی: ئێمە ڕازی نین تۆ ئاوات کردووە لەم وەختەدا کە کوڕەکەت مردووە؟!

---

١ رواه أحمد (٢٨٨،٢٨٧/٣) والبخاري (١٣٠١) ومسلم (٥٦٦٤).

٢ رواه ابونعیم في الحلیة (١٠٠/٨).

ئەویش لە وەڵامدا وتی: بۆ ئێوە دەتانەوێت لە بەردەم کارەساتێکدا چۆك دابدەم، دەی سا وەڵلاهی هەموو دنیاو ئەوەشی کە تێیدایە هی من بووایەو خوای گەورە بەرامبەری پەرداخێك ئاو لێی بسەندمایە قبوڵم بوو، دەی چی دەڵێن کە لەجیاتیدا لێبووردنو لێخۆشبوونو ڕێنموونی بدات بە خاوەنەکەی.[1]

دەڵێم سەبرو ئارامی سەلەفی صالح لەم بارەیەوە گەیشتبووە ئاستێك کە ئەوەندە ڕازی بوو بە قەزاو قەدەری پەروەردگار یەك گریانو کڕوزانەوەی لێ نەبیستراوە.

ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ئەوەندە ڕازیە بە قەزاو قەدەری خوا کە سوپاسی دەکات لەسەر کارەساتی مردنی کوڕە گەورەکەیو لەبەرامبەریشدا ئەوەندە بەسۆزە بۆی چاوەکانی پڕدەبێت لە ئاو، ئەمەش جوانترین شێوازی پرسەگێڕانە.[2]

هەشتەم: سوننەتی ئیسلام وایە کە سەرەخۆشیو دڵنەوایی ئەو کەسە بکرێت کە کەسێکی دەمرێت:

* بورەیدەی کوڕی حەسیب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنسارەکانی بەسەرکردەوەو سەردانی دەکردنو هەواڵی دەپرسین، جارێك هەواڵی ژنێکی زانی کە کوڕێکی مردبوو، ئیتر کەسی دیکەی نەمابوو، بۆیە زۆر گریابوو بەسەریدا، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ سەردانی کردنیو فەرمانی پێدا بە تەقواو لەخوا ترسانو ئارامگرتن، ژنەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن هاوار نەکەمو چۆن نەگریم، کە من ژنێکم منداڵم نابێتەوەو دەمرنو منداڵی دیکەم نیە جگە لە ئەو.

---

[1] رواه ابونعیم في الحلیة (٢/١٩٩) و ابن عساكر له (تأریخەکەیدا) لا(٨/٣١٩).

[2] ئەمەش ئەوپەڕی گەورەیی بەرنامەی ئیسلام دەردەخات کە شوێنکەوتووانی وای لێ دەکات لەبەردەم گەورەترین توشهاتدا خۆگرو بەئارام بن کە لە هیچ قوتابخانەیەکی ڕۆژئاوادا شتی وا بەدی ناکرێت. وەرگێڕ.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((الرقوب الذي يبقى ولدها)) واتە: ئەو ژنانەی منداڵیان بۆنامێنێتو دەمرن هەر ئەوانە منداڵیان بۆ ماوەتەوە، پاشان فەرمووی: ((ما من امراۃ مسلمة يموت لها ثلاث أولاد –يحتسبهم– الا ادخلهم الله بهم الجنة)) واتە: هیچ پیاوو ژنێکی موسڵمان سێ منداڵیان نامرێت بە مەرجێك خۆیان بگرنو ناشوکری نەکەن بەهۆیانەوە خوای گەورە دەیانباتە بەهەشتەوە، عمریش لەوێدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەگەر دووان بوون؟ فەرمووی: دووانیش).[١]

* ابن قدامە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ سوننەتە –مستحب– پرسەو سەرەخۆشیکردن لە کەسو کاری مردوو، هیچ یەکێك لە زانایان جیاوازیان لەمەدا نیە،... مەبەستیش لە سەرەخۆشیکردن واتە: دڵنەوایی کردنی کەسو کاری مردووەکەو جێ بەجێ نەکردنی کارەکانیانو مانەوە لە نزیکیانەوە، چونکە پێداویستی دوای ناشتن وەك پێداویستی پێش ناشتنەکە وایە.

هەروەك سوننەتە لە هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە سەرەخۆشی بکرێت، گەورەو بچوکیان.[٢]

هەر لەسەر خێرو چاکەو گەورەیی سەرەخۆشیکردنی کەسوکاری مردوو ئەم فەرموودەیە هاتووە:

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من عزّى أخاه المؤمن في مصيبته كساه الله حُلة خضراء، يحبر بها يوم القيامة)) قيل يا رسول الله، مايحبر؟ قال يُغبط))[٣]

---

١ رواه البزاز في كشف الاستار (٨٥٧١) والحاكم (١/٣٨٤) و دەڵێ: (صحيح الاسناد)ە.

٢ المغني (٣/٤٨٥).

٣ رواه الخطيب في (تاريخ بغداد) (٧/٣٤٧) و(ارواء الغليل) (٣/٢١٧).

واتــە: ئــەو کەســەی سەرەخۆشــی لــە بــرا موســڵمانەکەی بکــات لــەکاتی مــردن‌و کارەساتەکاندا خوای گەورە لە بەهەشتدا جلوبــەرگێکی ســەوزی پــێ دەبەخــشێت، لــە ڕۆژی قیامەتدا خۆی پێ هەڵدەنێت، وتیان: (یحبر) یانی چی؟ فــەرمووی: زۆر دڵخــۆش بوون.

*　　　　　*　　　　　*

## فەرموودەی بیستو نۆیەم

## خێرو گەورەیی ئارامیو خۆگری لەسەر مردنی منداڵ:

عن ابي حسان قال: قلت لأبي هريرة (ﷺ) : انه قد مات لي إبنان، فما أنت محدثي عن رسول الله (ﷺ) بحديث: تطيب به أنفسنا عن موتانا؟ قال: قال نعم ((صغارهم دعاميص الجنة، يتلقى أحدهم أباه، أو قال: أبويه فيأخذ بثوبه، او قال: بيده، كما اخذ انا بِصَنِفَةِ ثوبك هذا، فلا يتناهي– او قال: فلا ينتهي– حتى يدخله الله وأباه الجنة)).

## دەرهێنانی فەرموودەكە:

أحمد (٢/٤٨٨) ڕیوایەتی كردووەو بخاری لە (الادب المفرد) لا (١٤٥)داو (مسلم)یش لە (٦٧٩٤)داو وشەكانیش هی ئەوە.

## ئەو ئەحكامو ئادابانەی لە فەرموودەكە وەردەگیرێت:

یەكەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە پاداشتی ئەو كەسە زۆر گەورەیە كە منداڵێكی دەمرێتو بە ئارامیەوە بە قەزاوقەدەری خوا ڕازی دەبێت، چونكە منداڵ مردن گەورەترین تاقیكردنەوەیەو قورسترین كۆس كەوتنە، ئاگرێكە جگەر دەسوتێنێتو بۆیە پاداشتی ئارامگرتن لەسەری زۆر گەورەیەو لە ڕۆژی قیامەتداو لەناوی كردەوەكانیدا زۆر كێشی قورسە.[1]

دووەم: مەبەست لە برگەی فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموێت: ((صغارهم دعاميص الجنة)):

* خەلیلی كوڕی احمدی فەراهیدی دەڵێ: (دعموص) واتە: گیانلەبەرێكی ناو ئاوەو زۆر دێتو دەچێت یان (دعموص): پیاوێكە دەچێتە هەموو مەسەلەیەكەوە، واتە: ئەو منداڵانە گەشتیارن لەناو بەهەشتداو دەچن ناو ماڵەكانەوەو كەس دەست ناداتە

---

١ برد الاكباد عند فقد الاولاد لا(٢٠).

ڕێگەیان وەك چۆن لەم دنیایەدا منداڵ خۆی دەکات بە هەموو ژوورێکداو کەس لێی توڕەنابێتو کەس دەرگایان بەڕوودا داناخات.[١]

سێیەم: لەبەرئەوەی منداڵ مردن زۆر ناڕەحەتە لەسەر دڵو دەروونی دایکو باوك، پاداشتەکەشی زۆر گەورەیە بۆ ئەوانەی ئارام دەگرنو بەتەمای پاداشتی خوان:

١- مردنیان بە منداڵی دەبنە هۆی چوونە بەهەشتی دایكو باوك: وەك لە فەرموودەکەی (ابو هريرە)دا باسمان کرد.

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مامن مسلم يتوفى له ثلاث لم يبلغوا الحنث الا أدخله الله الجنة بفضل رحمته إياهم))[٢] واتە: هەموو موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێتو هیچیان نەگەیشتبنە تەمەنی باڵغبوون ئەوە خوای گەورە بەهۆی خۆشەویستی بۆیان، دایكو باوکی دەخاتە بەهەشتەوە.

* موعاویەی کوڕی قوڕە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوڕێکی (بچوکی) خۆی پێبوو، پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی: (أتحبه؟) ئایا خۆشت دەوێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەندەی من خۆشم دەوێت خوایش تۆی خۆش بووێت، پاش ماوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ما فعل ابن فلان؟ واتە ئەوە کوڕەکەی فلان کەس چی بەسەرهات؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مرد، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە باوکی فەرموو: ((أما تحب ان لا تأتي باباً من أبواب الجنة تستفتح الا جاء يفتح لك))[٣] واتە: ئایا حەز ناکەیت بتەوێت هەر دەرگایەکی بەهەشت بکەیتەوە یەکسەر بکرێتەوە بۆت؟

---

١ لسان العرب (٣٦/٧).

٢ رواه البخاري (١٢٤٨).

رواه أحمد (٤٣٦/٣) السنائي (١٧٨٠) والحاكم (٣٨٤/١)و بە (صحيح)یشی داناوە. (الذهبي)یش ٣پشتگیری کردووە.

هاوەڵان وتیان: ئەمە تەنها بۆ ئەو پیاوەیە یان بۆ هەر هەموومانە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرووی: ((بل كلكم)) واتە: بۆ هەمووتانە.

٢- ئەگەر بە منداڵی بمرن ئەوە لە قیامەتدا شەفاعەتو تكا بۆ دایكو باوكیان دەكەن.

* هەندێك لە هاوەڵان دەگێڕنەوە كە لە پێغەمبەری خوایان بیستووە (ﷺ) كە فەرموویەتی: (یقال للولدان یوم القیامة: أدخلوا الجنة، قال: فیقولون: یارب حتی یدخل أباءنا وامهاتنا، قال: فیأتون، قال: فیقول الله عز وجل: مالي اراهم محبنطئین؟ ادخلوا الجنة، قال: فیقولون: یارب اباءنا وامهاتنا، قال، فیقول: ادخلوا الجنة أتنم وأباءكم))[1]

واتە: لە ڕۆژی دواییدا بە منداڵان دەڵێن: فەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە، دەڵێ: ئەوانیش دەڵێن: خوایە گیان -ناڕۆین- تا لەگەڵ دایكو باوكماندا نەبێت، دەڵێ: باوكو دایكیان دێنو خوای (عز وجل)یش دەفەرموێت: ئەم خاوە خاوەیان لە چیە؟ بۆ ناچنە ناو بەهەشتەوە؟ دەڵێ: ئەوانیش دەڵێت: ئەی خوایە گیان لەگەڵ دایكو باوكماندا دەڕۆین، دەڵێ: خوایش دەفەرموێت: لەگەڵ دایكو باوكتاندا بچنە بەهەشتەوە.

٣- مردنی منداڵ بە بچوكی دەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهی دایكو باوك:

* أبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كەی فەرموویەتی: ((ما یزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه و ولده وماله حتی یلقی الله وما علیه خطیئة))[2]

واتە: بەردەوام خوا ژنانو پیاوانی موسڵمان تاقی دەكاتەوە بە لەدەستچوونی ئەندامێكی لەشی خۆی یان مردنی منداڵ یان لەدەستچوونی سامانی تا لە ئاكامدا وای لێ دەكات گوناهی پێ ناهێڵێتو پاكی دەكاتەوە لە تاوان.

---

١ رواه أحمد (٤/١٠٥) و (اسناده حسن).

٢ رواه أحمد (٤/٤٥٠) والترمذي (٢٣٩٩)و دەڵێ فەرموودەیەكی (حسن صحیح)ە.

٤- مردنی منداڵ بە بچوکی دەبێتە پارێزەری دایکو باوك لە ئاگری دۆزەخ:

* لە (أبو سعید)ەوە دەگێڕنەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئافرەتان بە پێغەمبەری خوایان وت بەڵکو ڕۆژێکمان بۆ دابنێیتو تیایدا ئامۆژگاریمان بکەیت، ئەویش بۆی دانانو تیایدا فەرمووی: ((ایما امراة مات لها ثلاثة من الولد، کانوا لها حجاباً من النار)) قالت امراة: واثنان؟ قال: ((واثنان))[1]

واتە: هەر ئافرەتێکی موسڵمان سێ منداڵی بمرێت، دەبنە بەربەست لەنێوان ئەو و دۆزەخدا، ئافرەتێك وتی: ئەی دووان؟ ئەویش فەرمووی: دووانیش.

٥- مردنی منداڵ بە منداڵی دەبێتە هۆی سەنگین کردنی تەرازووی چاکەی دایکو باوکی:

* (أبو سلمی) (خوا لێی ڕازی بێت) شوانی پێغەمبەری خوابوو (ﷺ)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: ((بخ بخ لخمس ماأثقلهنّ في المیزان: سبحان الله والحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبر والولد الصالح یتوفی للمسلم فیحتسبه))[2] واتە: بەه، بەه، پێنج شت چەند قورسن لە میزانی کردەوەکاندا: (سبحان الله)و (الحمدلله)و (لا إله إلا الله)و (الله أكبر)و منداڵێکی صاڵحی موسڵمانێك بمرێتو باوكو دایكی خۆڕاگرو بەئارام بن لە پاداشتەکەی.

٦- ئەگەر بە منداڵی بمرن دەگەن بە باوكو دایکیان لەبەردەمی دەرگاکانی بەهەشتداو دەراکانیان بۆ دەکەنەوە:

* عوتبەی کوڕی عبدالسُلمی (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوای بیست (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مامن مسلم یموت لە ثلاث من الولد لم یبلغوا الحنث، الا تلقوه من ابواب الجنة الثمانیة، من أیهما شاء دخل))[3] واتە: هەر موسڵمانێك

---

١ رواه البخاري (١٢٤٩) وشەکانیش هی ئەوە، مسلم (٦٧٩٢).

٢ رواه أحمد (٥/٣٦٥-٣٦٦)، (٤/٢٣٧) والبزاز.

٣ رواه أحمد (٤/١٨٣) و ابن ماجة (١٦٠٤).

سێ منداڵی نابالغی بمرێت لەبەردەمی دەرگاكانی بەهەشتدا دەوەستن‌و لە هەر دەرگایەكەوە پێی خۆش بێت دەیبینە ژوورەوە.

چوارەم:

هەندێك لە سەلەف (رەحمەتی خوایان لێ بێت) ئاواتی مردنی منداڵەكانیان خواستووە، لەبەر ئەو پاداشتە گەورەو گرانەی بۆ باوك‌و دایكیان ئامادەكراوە ئەگەر خۆیان بگرن‌و ناشوكری‌و لەخۆدان‌و سەرمۆرگرتن نەكەن:

* سەهلی كوڕی حنظلة (خوا لێی ڕازی بێت) هاوەڵێك بوو منداڵی نەدەبوو، دەیووت: حەزم دەكرد لە ئیسلامدا منداڵێكم ببوایە ئیتر با لەباریش بچووایە لە هەموو دنیا كە هی من بووایە پێم خۆشتر بوو بۆ ئەوەی ئارام بگرم‌و پاداشتی باوكانی بەئارامم دەست بكەوتایە لەسەر مردنی ڕۆڵەكانیان.[1]

* أبو الاحوص (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: چووینە خزمەت عبداللەی كوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) سێ كوڕی جوانی لەپاڵیدا بوون ئەوەندە جوان بوون وەك دینار پرشەیان لێ دەهات، ئێمەیش سەیرمان دەكردن، ئەویش هەستی كرد بۆیە فەرمووی: دەڵێی (شاكامی)م پێ دەبەن؟ وتمان: بەڵێ ئەی توخوا وێنەی ئەوانە شاكامی پێ نابرێت؟ ئەویش سەری بەرزكردەوە بۆ بنمیچی دیوارەكە كە پەڕەسێلكە هێلانەی تێدا كردبوو، فەرمووی: ئەگەر بەدەستی خۆم بیاننێژم‌و خۆڵ بكەمە سەر قەبرەكانیان پێم خۆشترە لەوەی كە هێلكەیەكی ئەم باڵندەیە بكەوێتە خوارەوەو بشكێت)[2]

* محمدی كوڕی خەلەفی كوڕی وكیع دەڵێ: (ابراهیم الحربی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) كوڕێكی هەوو یانزە ساڵان بووو هەموو قورئانی پێ لەبەركردبوو لە فیقهدا زۆر شارەزای كردبوو، دەڵێ: مرد منیش چووم بۆلای تا سەرەخۆشی لێ بكەم، ئەویش وتی حەزم كردووە ئەم كوڕەم بمرێت.

---

١ رواه البخاري له (الادب المفرد)دا (١٥٢).

٢ رواه عبدالرزاق (٢٠٦٤٨) وابونعيم في (الحلية)دا (١٣٣/١).

دەڵێ: وتم بۆ خاتری خوا (باوکی ئیسحاق) تۆ زانای هەموو دنیای کەچی دەربارەی منداڵێك کە قورئان‌و فەرمودەو فیقهت فێرکردووە وا دەڵێی؟!

دەڵێ: وتی: لە خەومدا قیامەت هەڵسابوو، کۆمەڵێك منداڵم بینی یەکی گۆزەیەکیان بەدەستەوە بوو ئاوی تێدابوو، پێشوازیان لە خەڵکەکە دەکردو ئاویان پێدەدان، ڕۆژەکە زۆر گەرم بوو، دەڵێ: وتم بە یەکێکیان ئاوم پێ بدە، سەیرێکی کردم‌و وتی: ئاخر تۆ باوکم نیت! وتم ئێوە کێن؟ وتی: ئێمە ئەو منداڵانەین کە لە دنیادا مردین‌و باوکمان بەجێ هێشتووە وا ئێستا ئاویان پێ دەدەین‌و دەڵێ: لەبەرئەوەیە ئاواتەخوازبووم بمرێت.[1]

* سوفیان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کوڕێکی بچوکی خۆی بینی لە حەجدا تەوافی کەعبەی دەکرد، فەرمووی: ئەمە خۆشەویسترین کەسە لەلام، هیچم ئەوەندەی ئەو پێ خۆش نیە کە بچێتە ناو تەرازووی چاکەکانم.[2]

* عەمری کوڕی مەیمونی کوڕی مەهران (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەگەڵ باوکمدا بووم، لە کەعبەدا تەوافمان دەکرد، باوکم گەیشت بە پیاوێکی بەتەمەن‌و باوەشیان کرد بەیەکداو لەگەڵ کوڕێکی بەتەمەنی منداڵدا بوو، باوکم پێی وت: ئەمە کێیە؟ وتی: کوڕمە، پێی وت: ئەمە ڕازیت لێی؟ وتی: ئەی بۆنا هیچ ڕەوشتێکی خێرو چاکە نیە کە لەم منداڵەمدا نەبێت‌و هەموویانم تێدا بەدی کردووە تەنها یەك شت نەبێت، وتی: ئەو شتە چیە؟ وتی: دەمەوێت بمرێت‌و بگەمە ئەجرو پاداشتی دایك‌و باوکە ئارامگرەکانم لەسەری دەست بکەوێت!! پاشان باوکم لێی جیابوویەوە وتم باوکە ئەوە کێ بوو؟ وتی: مەکحول* بوو.[3]

---

١ رواه الخطيب في (تأريخ بغداد) (٦/٣٧).

٢ رواه المدائني في (التعازي) (٦٦) وابونعيم في (الحلية)دا (٤/٢٧٥).

* مەکحول: زانایەکی پایە بەرزی فیقهی ناو شامە.

٣ رواه القشيري في (تأريخ الرقة) (١٠٠) وابو نعيم في (الحلية) (٤/٩٠-٩١).

پێنجەم:

ئەم هەڵوێستەی سەلەفی صاڵح پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەوەی کە هەندێك لە زانایان لەلایان مەکروهـ بووە ئاواتی مەرگی منداڵ کە مەبەست لێی ترسی هەژاریو کەم دەستی بێت.

●لەلای (ابن عمر)دا (خوا لێی ڕازی بێت) پیاوێك (کە کۆمەڵێك کچی هەبوو) ئاواتی مردنی خواستنو ابن عمریش زۆر تورەبوو و فەرمووی: بۆ ئێوە ڕۆزییان دەدەن.[1]

بەڵام ئاواتی زانایانی سەلەف (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لەبەر ترسی هەژاریو کەم دەرامەتی نەبوە بەڵکو لەبەر دەستەکەوتنی ئەو کێوە ئەجرو پاداشتەیە کە بۆ باوكو دایکانی بەئارامو خۆگر ئامادەکراوە کاتێك منداڵێکیان دەمرێت والله أعلم.

شەشەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵانی موسڵمان دەچنە بەهەشتەوە:

* احمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان زانایاندا کە وان لە بەهەشتدا).[2]

بەڵام مەسەلەی منداڵی بێ باوەڕان جێگای ناکۆکیو جیاوازیە لەنێوان زانایاندا لەبەر ئەو هەموو فەرمودەیەی بە هەردوو بارەکەدا هاتووە، بۆیە زۆرێك لە زانایان پێیان خۆش نەبووە لەم مەسەلە تێکەڵەدا قسە بکەن چونکە:

* عبداللەی کوڕی عەباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لایزال أمر هذه الامة موائماً –مقارباً– مالم يتكلموا في الولدان والقدر))[3]

واتە: ئیشو کاری ئەم ئوممەتە زۆر تەباو لەیەکەوە نزیکە مادەم دەربارەی سەرئەنجامی قیامەتی منداڵانو مەسەلەی قەزاو قەدەر قسە نەکەنو بێ دەنگ بن.

---

١ رواه البخاري في (الادب المفرد)دا (٨٣).

٢ رواه الخلال في (أحكام أهل الملل) (١٤).

٣ رواه الحاكم (٣٣/١) وصححه ووافقه الذهبي.

* (ابو عبدالله) ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هەر کەسێك دەربارەی سەرئەنجامی منداڵانی بێ باوەڕان دوا (ئەوە سەرچاوەی هەموو ناکۆکیەکە) کەس لەو بارەیەوە ناپرسێت جگە لە کەسێك مەگەر خوا خۆی بزانێت چی لە دڵیدایە.

هەروەها دەڵێ: ئێمە دەدەین بەلای هەموو ئەو فەرموودانەداو لە خۆمانەوە قسەیان لەسەر ناکەین.[١]

* دیسان (ابو عبدالله) ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: (بیشری کوڕی سەری) پرسیاری کرد لە سوفیانی سەوری دەربارەی قیامەتی منداڵانی بێ باوەڕان؟ ئەویش هاواری کرد بەسەریداو پێی وت: ئەی منداڵ تۆ دەربارەی شتی وا دەپرسی؟![٢]

* حەنبەل: دەڵێ: گوێم لە (ابو عبدالله) ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو کە کوڕەکەی ئیمام شافیعی پرسیاری لێکرد دەربارەی دوارۆژی منداڵی مردوو؟ لە وەڵامدا فەرمووی: مەبەستت منداڵی موسڵمانە یان بێ باوەڕان؟ وتی: بێ باوەڕان، أحمد هاواری کرد بەسەریداو فەرمووی: ئەم مەسەلانە ئەهلی زەیغو گومانچیان دەیجوڵێنن؟ تۆ هەقت چیە بەسەر ئەم جۆرە مەسەلانەوە؟

دەڵێ: کوڕەکەی شافعی (کە والی حەلەب بوو) بێ دەنگ بوو هەستاو ڕۆیی‌و هەرگیز نەگەڕایەوە خزمەت أبوعبدالله تا لە نیا دەرچوو.[٣]

*　　　*　　　*

---

١ رواه الخلال في (احكام أهل الملل) (٢١).

٢ هەمان سەرچاوە (٢٢).

٣ هەمان سەرچاوە (٢٢) لەگەڵ (الاداب الشرعيه) (ابن مفلح) لا (٦٩/٢).

## فەرموودەی سی یەم
## ماچکردنی منداڵان

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قبَّل رسول الله الحسن بن علي، وعنده الاقرع بن حابس التميمي جالساً، فقال الاقرع: ان لي عشرة من الولد ماقبلت منهم احداً، فنَظر إلَيه رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ثم قال ((مَن لايَرحَم لايُرحَم)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

بوخاری لە (٥٩٩٧)دا ڕیوایەتی کردووەو لە (أدب المفرد)دا (٩١)و مسلم لە (٦٠٩٧)دا و أبوداود لە (٥٢١٨)و الترمذي لە (١٩١١)دا گێڕاویانەتەوە.

### ئەو ئەحکامو ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە منداڵان ماچ بکرێن لەبەر هۆکاری ڕەحمو بەزەیی وەك بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەرباسێکی ناوناوە (باسی بەزەیی هاتنەوە بە منداڵداو ماچکردنو دەست کردنە ملی).

فەرموودەیش لەم بارەیەوە زۆرە:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: ئایا ئێوە منداڵان ماچ دەکەن ئێمە هەرگیز منداڵی خۆمان ماچ ناکەین، پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((أو املك لك ان نزع الله من قلبك الرحمة))[1] واتە: من چ دەسەڵاتێکم هەیە کە خوا سۆزو بەزەیی لەناو دڵتدا دەرهێناوە.

دووەم:

دادپەروەری لە ماچکردنی منداڵاندا:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو لەو کاتەدا منداڵێکی هات بۆ لایو پیاوەکەش ماچی کردو لە باوەشیدا

---

١ رواه البخاري (٥٩٩٨) ومسلم (٦٠٦٩).

داینا، پاشان کچێکی هاتو دەستی گرتو لەلای خۆیدا داینشاند، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((فما عدلت بينهما))[١] واتە: دادپەروەر نەبوویت لەنێوانیاندا.

* لە ئیبراهیمەوە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: سەلەف پێیان خۆش بووە دادپەروەربن لەنێوان منداڵەکانیاندا تەنانەت لە ماچکردنیشیاندا)[٢]

سێیەم: کوێی منداڵ ماچ بکرێت؟

١- ماچکردنی دەم:

* ابوهریره (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: بەم دوو چاوەی خۆم دیومەو بەم گوێیانەی خۆم بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەستی حەسەن یان حسەینی گرتووەو پێی فەرموو: ((ترقَّ عين بقه)) واتە: خۆت بەرزکەرەوە چاو بچکۆلە، دەڵێ: منداڵەکەش دەچوە سەر قاچی پێغەمبەرو ئەویش بەرزی دەکردەوەو دەیخستە سەر سنگیو پێی دەفەرموو: ((افتح فاك)) دەمت بکەرەوە؟ دەمی ماچ دەکردو پاشان دەیفەرموو: ((اللهم اني أحبه فأحبَّه)) واتە: ئەی خوایە من خۆشم دەوێت تۆش خۆشت بوێت.[٣]

٢- ماچکردنی ناوك:

* عومەیری کوڕی ئیسحاق (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەبوهریرەم بینی (خوا لێی ڕازی بێت) بە حەسەنی کوڕی عەلی فەرموو: ئەو جێگایەم پێ پیشاندە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماچی کردووە لە جەستەت؟ ئەویش ناوکەی خۆی پیشاندا.[٤]

---

١ رواه البزار (الزوائد) (١٨٩٣) والبيهقي في (الشعب الايمان)دا (٦/٤١٠) واسناده صحيح.

٢ رواه ابن ابي شيبه (١١٠٤٢) وابن ابي الدنيا في (العيال) (٣٧)دا.

٣ رواه ابن ابي شيبه (١٢٢٤١).

٤ رواه ابن ابي الدنيا في (العيال)دا (٢١٢).

چوارەم:

لە بارەی ماچكردنی منداڵەوە بەهۆی ڕەحمو بەزەیی‌و خۆشەویستیەوە:

١- مژینی لێوی‌و دەمی:

* موعاویە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) زمانی یان لێوی حەسەنی كوڕی عەلی دەمژی، هەرگیز لێویك یان زمانێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژیبێتی بە ئاگری دۆزەخ ناسوتێت.[1]

* ئەبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) زمانی حسینی كوڕی عەلی دەمژی وەك چۆن منداڵ خورما دەمژێت.[2]

* هەروەها ئەبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) حەسەنی لە باوەشدا بوو دەستی دەكرد بە ناو ڕیشی پێغەمبەرداو پێغەمبەریش (ﷺ) زمانی دەخستە ناو دەمی‌و دەیفەرموو: ((اللهم إنّي أُحبه فأحبه))[3] واتە: ئەی خوایە من خۆشم دەوێت تۆش خۆشت بوێت.

٢- بۆنكردنی منداڵ لەگەڵ ماچكردنیدا:

* لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیبراهیمی ماچ دەكردو بۆنی دەكرد.[4]

* ئەسمای كچی عومەیس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: كاتێك جعفر (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ هاوڕێكانیدا شەهیدبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: منداڵەكانیم بۆ بێنن ((ائتني ببني جعفر)) دەڵێ: منیش هەموویانم بۆ هێناو یەك یەك بۆنی دەكردن‌و چاوەكانی پڕبوون لە ئاو.[5]

---

١ رواه أحمد (٢/٩٣) وابن عساكر في (تأريخ دمشق)دا (١٣/٢٢١) (اسناده صحيح).

٢ رواه (ابن عساكر) في (تأريخ دمشق) (١٤/١٦٩).

٣ رواه الحاكم (٣/١٦٩) دەڵێ: (صحيح الاسناد)ه.

٤ رواه البخاري (١٣٠٣).

٥ رواه أحمد (٦/٣٧٠).

پێنجەم: ئایا پیاو دەتوانێت کچی خەڵکی ماچ بکات؟

بەڵێ، دەتوانێت ئەگەر لەبەر سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی بێتو کچەکەش بچوك بێتو لە فیتنەو خراپەیش دڵنیابێت).

* بوکەیر دەگێڕێتەوەو دەڵێ: بینیم عبداللەی کوڕی جعفر (خوا لێی ڕازی بێت) زەینەبی کچی عومەیری کوڕی ابی سلمەی ماچ دەکرد کە تەمەنی نزیکەی دوو ساڵان بوو.[1]

**مەسەلەیەك:**

ماچکردنی کوڕی جوان یان کۆسە یان نێرەموك:

نێرەموك بە کوڕێك دەڵێن تەمەنی بگاتە ئاستی ڕیشو سمێڵ بەلام ڕیشو سمێڵی دەرنەکات..

هەندێك لە سوفیەکان کەوتوونەتە هەڵەی ماچکردنو سەلامکردن لە کۆسەکانو شەیتان بەهەدەری بردوون لەم مەسەلەیەدا، تەنانەت یەکێکیان ئەگەر بیەوێت کوڕێکی نێرەموکی جوان ماچ بکات فێڵێکی لێ دەکاتو پێی دەڵێ بڵێ: (لا إله إلا الله). هەر کە منداڵەکە ئەوەی وت: سوفیە نەگبەتەکەش دەڵێ: دەی لێم بگەڕێ با ئەو دەمەی کە (لا إله إلا الله)ی پێ وتراوە تێر ماچی بکەم.

* شێخ الاسلام (ابن تیمیه) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: منداڵی جوانی (بێ موو) وەك کچی بێگانە وایە لە زۆر شتدا،نابێت ماچ بکرێت بۆ چێژ وەرگرتن، بەڵکو نابێت ماچ بکرێت مەگەر کەسانێك کە دڵنیابن لە خراپەو فیتنەو (مەحرەم بن) وەك باوكو برا، هەروەها سەیر کردنیشی دروست نیە.[2]

* * *

---

١ رواه البخاري في (الادب المفرد)دا (٣٦٥).

٢ مجموع الفتاوى (٢٤٧/٣٢).

## فەرموودەی سی و یەکەم

## سڵاوکردن لە منداڵان

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: أتى علي رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وأنا العب مع الغلمان، قـال: فسلم علينا، فبعثني إلى حاجة، فأبطأت على أمي، فلما جئت، قالت: مـا حبسك؟ قلـت: بعثني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لحاجة، قالت: ما حاجته؟ قلت: انها سِرُّ، قالت: لا تحـدثنَّ بِـسرِّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) احداً)).

قال أنس : والله لو حدثتُ به أحداً لحدثتك يا ثابت.

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

أحمد ڕیوایەتی کردووە (٣/١٩٥) و مسلم (٦٤٦١) وشـەکان هـی ئـەوە، وە أبـوداود (٥٢٠٣).

### ئەو ئەحکام و ئادابانەی فەرموودەکە دەیبەخشێت:

یەکەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر سوننەتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لەم ڕۆژگارەدا فەرامۆشکراوە ئەویش سەلامکردنە لە منداڵان.

دووەم: چۆنیەتی سەلامکردن لە منداڵان:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) دای بەلامانـدا کە یاریمان دەکرد فەرمووی: ((السلام عليكم يا صبيان))[1]

سێیەم: تەوقەکردن لەگەڵ منداڵان:

* سەلەمەی کوڕی ویردان دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی (خوا لێـی ڕازی بێـت) تەوقەی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد، گەیشتە سەرەی منو وتی: تۆ کێی؟ وتم: مەولای بـەنی لەیسم، سێ جار دەستی هێنا بە سەرمدا وتی: (بارك الله فيك)[2].

---

١ رواه أحمد (٣/١٨٣) و ابن ابي شيبه (٥٨٢٦).

٢ رواه البخاري في (الادب المفرد) (٩٦٦).

چوارەم: سڵاوکردن لە گەنجی جوان یان سافو لووس یان نێرەموك:

* أبوسهل دەڵێ: لەناو ئوممەتدا سێ جۆر نێرباز (لوطی) پەیدا دەبن پێرێك بە سەیرکردنو بە تەوقەکردنو پێرێك بەکردنی کارە خراپەکە).[١]

* شێخ الاسلام (ابن تیمیه) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ((چێژ وەرگرتن بە دەست بەرکەوتنی کوڕی جوانو لوس وەك تەوقەکردن لەگەڵیدا حەرامە لەسەر ڕای هەموو زانایان، هەروەك چۆن حەرامە چێژ وەرگرتن لە دەستدان لە دەستی ئەو کەسانەی حەرامن لێی وەك خوشكو دایكو ئافرەتی بێگانەیش، ئەوەی ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرە دەستدان لەو کەسانەی حەرامن بۆی بە مەبەستی چێژ وەرگرتن لەدەستدان لە ئافرەتی بێگانە ترسناکترەو گوناهەکەی گەورەترە).[٢]

پێنجەم: لە فەرموودەکەدا ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە سڵاو لە منداڵان بکرێت کاتێك خەریکی یاریو گەمەی خۆیانن.

شەشەم: منداڵان فێردەکرێن کە سڵاو بکەن لەو کەسانەی لەخۆیان گەورەترن:

* ئەبوهریرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يُسلم الصغير على الكبير، والمار على القاعد والقليل على الكثير)).[٣]

واتە: منداڵ سڵاو لە گەورە دەکاتو سوار یان پیادە سڵاو لە دانیشتوو دەکاتو کەم سڵاو لە زۆر دەکەن.

حەوتەم: منداڵ فێری شێوازی سڵاوکردنو ڕوخسەت خواستن دەکرێت.

* خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ

---

١ رواه ابن ابي الدنيا (ذم الملاهي) (١٤٠).

٢ مجموع الفتاوى (٢١/٢٤٥).

٣ رواه البخاري (٦٢٣٤).

صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[1].

واتە: ئەی کۆمەڵی ئیمانداران با کەنیزەك‌و منداڵە بچوکەکانتان ئەوانەی باڵق نەبوون لە سێ کاتدا بێ پرسکردن خۆیان نەکەن بە ژووردا کە پێش نوێژی بەیانی‌و پاش نیوەڕۆو دوای نوێژی عیشا ئەم سێ کاتە (عەورەتن)، جگە لەم سێ کاتە چ کاتی بیانەوێت قەیناکات با خۆیان بکەن بە ژووردا بۆ لاتان چونکە ئێوە بەردەوام دێن‌و دەچن بەناویەکداو ئا بەو جۆرە خوا ئایەتەکانی خۆی ڕۆشن دەکاتەوە بۆتان، بەڵام ئەگەر ئەو منداڵانە گەیشتنە ئاستی باڵغبوون وەك گەورەکان ڕوخسەت وەربگرن ئا بەو جۆرە خوا ئایەتەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان‌و بەڕاستی ئەو زاناو کار دروستە).

* عامری کوڕی عبداللەی کوڕی زوبێر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ڕەیحانە دەڵێ کەس‌و کارەکەی ناردیان بۆ لای عمر (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ کارێك‌و بێ پرس چووە ژوورەوە بۆ لای، عمریش فێری کردو پێی فەرموو: کچم برۆ دەرەوەو سەلام بکەو پاشان داوای ڕوخسەت بکە.[2]

* زەیدی کوڕی ئەسلەم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: باوکم بۆ کارێك ناردمی بۆ لای عبداللەی کوڕی عمر (خوا لێی ڕازی بێت) وتم: بێمە ژوورەوە؟ ئەویش وتی: کوڕی خۆم وامەڵێ، بەڵکو ئەگەر چوویت بۆ ناو کۆمەڵێ کەس بڵێ: السلام علیکم، هەر کاتێك وەڵامی سلاوەکەیان دایەوە بڵێ: ڕێگام دەدەن بێمە ژوورەوە؟.[3]

---

١ النور (٥٨،٥٩).

٢ رواه ابن أبي شيبه (٥٧٢٥).

٣ رواه أحمد (٢/٣٣) و ابن اي شيبه (٥٧٢٧).

* محمدی كوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لەسەر ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ﴾ ماڵەوەمان فێریان دەكردین كە سڵاو بكەین‌و ئەگەر یەكێكیان بچوایە بۆ شوێنێك دەیووت: السلام علیكم من فلانم ئایا بێمە ژوورەوە؟[1]

هەشتەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دەبێت ڕێگا بە منداڵان بدرێت پێكەوە یاری بكەن.

نۆیەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌و كارەكان مرۆڤ منداڵی دراوسێی بەكاربهێنێت ئەگەر ناڕەحەتی‌و فەوتانی لێ نەكەوێتەوە.

دەیەم: مەسەلەیەكی گرنگ: پرسیارێك: ئایا ئەگەر منداڵێكی دراوسێ بنێردرێت بۆ كارێك‌و لەوێ منداڵەكە تیاچوو یان كارەساتێكی بەسەرهات تۆ تاوانبار‌و زامنیت؟ بەڵێ.

* (ابن منذر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) (هەموو ئەو زانایانەی كە ئێمە شتمان لێ وەرگرتوون لەسەر ئەوەن كە ئەگەر منداڵێكی نابالق یان خزمەتكارێك بەبێ پرسی ماڵەوەیان بنێردرێت بۆ جێگەیەك‌و تیاچوو، ئەوە تاوانبار‌و زامنیشە)[2]

* مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەوەی زانایانی فیقهی لەسەرە ئەوەیە كە ئەگەر كەسێك منداڵێك یان خزمەتكارێكی نارد بۆ كارێك ئەوە شتێكی لێ بێت ئەو زامن‌و بەرپرسە لێی، ئەگەر بەبێ پرسی ماڵەوەیان بنێردرێت، وە ئەگەر كەسێك بە منداڵێك بڵێ بڕۆ ناو ئەو بیرە یان بڕۆ سەر ئەو درەختە‌و لەوێ تیاچوو ئەوە زامن‌و بەرپرس دەبێت بەرامبەری.

---

١ رواه ابن ابي شيبه (٥٨٧).

٢ ابن منذر في الاشراف (٣/١٢٥-١٢٦).

بەڵام ئەگەر بە پرس‌و ڕەزامەندی ماڵەوەیان ئەو کارەی کرد هیچ بەرپرس نابێت بەرامبەری:

* عەلی کوڕی ئەبوطالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەگەر پیاو منداڵێك تا (٥) بست درێژ نەبوو، ناردی بەلایەکدا بۆ کارێك ئەوە بەرپرسە لێی تا دێتەوە بەڵام ئەگەر پرسی بە کەس‌وکاری کردبوو هیچ بەرپرس نیە لێی.[١]

یازدەیەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت منداڵ فێری ڕەوشتی جوان‌و ئادابی کۆمەڵایەتی دروست بکرێت، ئەو ڕەوشتانەی کە شەرع گرنگی پێداون‌و هانی خەڵکی داوە تا خۆیانی پێ بڕازێننەوە وەك: ئەمانەت پاراستن‌و دەستپاکی‌و نهێنی پارێزی‌و پەیمان بردنە سەر و ڕاستگۆیی لە قسەکردنداو ...هتد.

تا منداڵەکە لەسەر ئەم ڕەوشتانە گەورە ببێت‌و ببێتە بەشێك لە خوو هەڵس‌و کەوتی ڕۆژانەی تا مردن:–

* نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە شاری (طائف)ەوە بە دیاری ترێیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)و منی بانگ کردو پێی فەرمووم: ((خذ هذا العنقود فابلغهُ أُمك)) واتە: ئەم بۆشکە ترێیە بگەیەنەرە دایکت، منیش پێش ئەوەی بگەمە دایکم هەموویم خوارد، پاش چەند شەوێك پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم: ((ما فعل العنقود؟ هل ابلغته امك؟)) واتە: چیت کرد بە بۆشکە ترێیەکە؟ گەیانتە دەستی دایکت؟ وتم: نەء، پێغەمبەر بۆ خۆشی پێی فەرموو: ((یا غُدر))[٢] واتە: ئێی غەدار واتە ئەی ناپاك.

---

١ المحلی (١١/٦٤) وهو صحیح عن علي.

٢ رواه ابن ماجة (٣٣٦٨) دەڵێ (إسناده صحیح).

* عبداللەی كوڕی بسر المازنی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: دایكم هەندێك ترێی پێدا ناردم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش ئەوەی بیگەیەنم پێی لێم خوارد، كاتێك بۆم هێنا، گوێچكەی ڕاكێشتمو فەرمووی: ((یا غُدر))[1] واتە: ئێی غەدار واتە: ئەی ناپاك.

*عبداللەی كوڕی عامیر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵمان بوو، دایكم پێی وتم: با بتدەمێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((ما أردت أن تعطیه؟)) واتە: دەتویست چی پێ بدەیت؟ وتی: خورمایەكم دەدایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((أما إنك لولم تعطیه شیئاً، كتبت علیك كذبة))[2] واتە: ئەگەر هیچت نەدایە پێی درۆیەكت بۆ دەنوسرا..

* عەكریمەی كوڕی خالید دەڵێ: لە خزمەت عمری كوڕی خطابدا دانیشتبووین (خوا لێی ڕازی بێت) كوڕێكی كەشخەی خۆی كرد بە ژووردا كە قژی داهێنابوو، جلی سپۆرتی لەبەركردبوو، عمریش (خوا لێی ڕازی بێت) هەستاو دارێكی لێداو گراندی، حفصەیش (خوا لێی ڕازی بێت) پێی وت: خۆ هیچی نەكردبوو بۆچی لێتدا؟ بینیم زۆر لەخۆی بایی بوو بوو، ویستم لەبەرچاوی خۆی بچوكی بكەمەوە.[3]

* عەونی كوڕی عبداللەیش دەڵێت: دایكم جلێكی جوانی لەبەركردم، پێیەوە چوومە دەرەوە، هاوڕێكانم پێیان وتم: دەڵێی پاشا (أمیر) پێی بەخشیویت؟ منیش حەزم كرد هەروا بزانم ئەمیر بۆی كڕیووم بۆیە وتم:، خوا پاداشتی ئەمیر بداتەوەو خوای گەورە لە بەهەشتدا جلو بەرگی ئاوای پێ ببەخشێت، مەسەلەكەم بۆ باوكم گێڕایەوەو ئەویش وتی: كوڕی خۆم درۆ نەكەیتو خۆت بەدرۆزن پیشان مەدە.[4]

---

١ رواه ابن السني –عمل اليوم والليلة– (٤٠١).

٢ رواه أبو داود (٤٩٩١) إسناده صحيح.

٣ رواه عبدالرزاق (١٩٥٤٨).

٤ رواه ابن ابي الدنيا في (الصمت) (٥٣٦).

* عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت بە کوڕەکەی: کوڕی خۆم، ئەگەر وشەیەکت لە موسڵمانێکەوە بیست بە گومانی چاکەوە لێکی بدەوە مەگەر هەر مانای چاکە هەڵنەگرێت.[1]

* محمدی کوڕی عبدالله الرداد دەڵێ: محمدی کوڕی واسیع (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چاوی کەوت بە کوڕێکی کە دەستەکانی بە جۆرێك ڕادەوەشاند کە خۆی زۆر بە گەورە دەزانی پێی وت: ئەگبەت: دەزانی تۆ کێی؟ تۆ کوڕی ژنێکی بە دوو سەد درهەم کڕیمو باوکیشت پیاوێکە لە موسڵمانان کە نموونەی لەناو موسڵماناندا دووبارە نەبێتەوە (واتە لە خراپیدا).[2]

* ئیبراهیم النخعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: منداڵ بووین لەسەر شایەتیدانو پەیمان شکاندن لێیان دەداین.[3]

دوانزەیەم:

فەرموودەکەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرپەرشتیاری منداڵ دەبێت لە منداڵ بپرسێتەوە لە ئەنجامی دواکەوتنی لە گەڕانەوە بۆماڵ، چونکە کەمتەرخەمی کردن لەگەڵیانو چاودێری نەکردنیانو لێ نەپرسینەوەیان گەورەترین هۆکاری تێکچوونی ڕەوشتو هەڵسوکەوتیانە.

چونکە ئەوانەی چورادەورە کاریگەریان لەسەری دەبێت کە لەگەڵیان دەگەڕێنو تێکەڵی هاوڕێی خراپ دەکات وەك ئیبراهیم النخعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (سەرەتای خراپ بوونی منداڵان لەناو خۆیانەوە دەست پێ دەکات).[4]

---

١ رواه ابن ابي الدنيا في (مدارات الناس) (٣٩).

٢ رواه ابونعيم في (الحلية) (٢/٣٥٠).

٣ رواه البخاري – معلقاً (٣٦٥١).

٤ رواه ابن الجوزي فى (ذم الهوى) لا (٩٧).

زۆر بەداخەوە كە ئەمڕۆ سەرپەرشتیارانی منداڵ وازیان هێناوە لە چاودێریكردنو لێپرسینەوەیان لە كاتەكانیان، لە هاوڕێكانیان، هەر بەو هۆیەشەوەیە كە زۆریّ لە منداڵی موسڵمانان ئەمڕۆ لەسەر جادەكانو قەراغ دەریاو ناو پاركەكاناندا چەندان سەعات دەمێننەوە بەبیّ هیچ چاودێرو لێپرسینەوەیەك!!.

لە بەرامبەر ئەمەشدا كۆمەڵێك باوكان هەن بەپێچەوانەوە ناهێڵن منداڵەكانیان لە ماڵ دەربچنو وەك زیندانی لە ماڵ دەیانهێڵنەوە بە بیانووی ئەوەی نەوەك هاوڕێیەتی كەسانی خراپ بكات، بەڵام لەلایەكی ترەوەو لەڕێگەی تەلەفزیۆنو سەتەلایتو ئینتەرنێتو گۆڤارە بیّ ئابڕووەكانەوە هەموو گۆرانی بێژو تەمسیلكەرە -بیّ ئابڕووەكان- دەهێننەوە بەردەستی ئەم منداڵە داماوە كە ئەو شتانە غەزووی هەموو ماڵە موسڵمانەكانیان كردووە، مەگەر كەسێك خوا ڕەحمی پیّ كردبێت كە منداڵە داماوەكان چەندان سەعات لەبەردەمیاندا دادەنیشنو هەموو هۆكارێكی خراپەیان لێوەردەگرن لەوانە:

١- شەهەواتو ئارەزوكاری كە ڕایان دەكێشیّ بەرەو بەد ڕەوشتی.

٢- شتی گومانـاوی كە لادانیان تێدا دروست دەكات یان ڕوو یان گویّ پێنەدانو دەرچوون لە پەیڕەو و پرۆگرامی سەلەفی صالحو هیچ زانیاریەكی پێشتریان نیە كە بەرگری پیّ بكەن لە خۆیان وەك ئەو كەسەیان لێدێت كە عەلی كوڕی ئەبوطالب (خوا لێی ڕازی بێت) وەسفیان دەكاتو دەفەرموێت:

(گێلو گەوارن، شوێن هەموو ویقەیەك دەكەون، لەگەڵ بادا لار دەبنەوە، بە ڕووناكی زانست چواردەوری خۆیان ڕووناك نەكردۆتەوە، پشتێكی بتەویان بۆ خۆیان دروست نەكردووە)[1].

---

١ رواه ابو نعيم في (الحلية) (١/٨٠).

دەبێت ئەی پەروەردەکاران‌و سەرپەرشیاران لەخوا بترسن‌و ئاگاتان لەوانە بێت کە خوا خستوویەتیە بەردەستتان‌و ژێر دەستتان‌و وتەی پێغەمبەرتان لەبیر بێت کە (ﷺ) دەفەرموێت: ((مامن عبد يسترعاه الله رعية، يموت يوم يموت وهو غاش لرعيته الا حرم الله عليه الجنة))[1]

واتە: هەر بەندەیەك خوای گەورە ژێردەستەی پێدابێت‌و کاتێك دەمرێت غەش‌و ناپاکی لەگەڵ کردبن ئەوە خوای (عز وجل) بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

زۆر بکۆشن ئەی ئەوانەی خوای گەورە کردوونی بە سەرگەورەی ماڵ‌و منداڵ‌و سووربن لەسەر پەروەردەکردنیان، لەسەر پرۆگرامی پێغەمبەر (ﷺ)و سەلەفی صالح، چونکە هەرگیز کۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێتەوە مەگەر بەوەی ئەوەڵ جار چاکبوو پێی ئەمەش وتەی: پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس (رەحمەتی خوای لێ بێت).

لە پەروەردەکردنی منداڵەکانتاندا پشت بەخوا ببەستن لە هەموو حاڵەتەکاندا چونکە مەسەلەکە ترسناکەو بەرپرسیارێتیەکی گەورەیە، بەتایبەت لەم سەردەمەی دواییماندا کە یارمەتی کەم بۆتەوە، نامۆیی پەرەی سەندووە، هۆکاری خراپەو خراپەکاری زۆربووە، بانگخوازانی ئاگری دۆزەخ زۆربوون، لەوانەی کە جگە لە ڕێبازەکەی محمد (ﷺ) ڕێچکەی تریان گرتۆتەبەر، شتی تر بە ڕێنمونیکەر دەزانن (لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)

بەڵام بەوە دڵی خۆمان خۆش دەکەین کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا﴾[2] واتە: هەر کەسێك لە خوا بترسێت خوایش دەرووی لێ دەکاتەوە، یان ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾[3] واتە: ئەوانەی بۆ ئێمە خۆیان ماندوو دەکەن‌و دەرەنجێنن، ڕێبازی ڕاستەقینەی خۆمانیان پیشان دەدەین‌و دەیانخەینە سەر ڕێ.

---

١ رواه مسلم (٢٨٠).

٢ الطلاق (٢).

٣ العنكبوت (٦٩).

سێزدەیەم:

لە فەرموودەکە ئەوە وەردەگرین کە دەتوانین لە پاراستنی نهێنیدا متمانە بە منداڵ بکەین، فێری وانەی کەتمانیان بکەین.

چواردەیەم:

لە فەرموودەکەدا ئەوەش وەردەگرین کە بچوك دەبێت خزمەتی گەورە بکاتو کاری بۆ ڕاپەڕێنێت.

پازدەیەم:

ئەگەر کارمان بە سەر منداڵدا دا با لەسەرخۆو بە نەرمی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەینو پێیان هەڵنەشاخێینو لێیان نەدەین هەر کە کەمێك دواکەوتن یان سستیان نواند لە جێ بەجێ کردنەکەدا.

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ماوەی دە ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەری خوابووم ڕۆژێك پێی نەوتووم: ئۆف لە دەستت، بۆچی ئەمەت کرد یان بڵێ ئەوەت نەکردووە؟[1]

* هەروەها دەفەرموێت: ماوەی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام کردووە (ﷺ) لەسەر کارێك کە نەمکردبێت یان سستیم نواندبێت یان شتێکم ون کردبێت، لۆمەی نەکردووم‌و ئەگەر کەسێکیش لۆمەی بکردمایە پێی دەفەرموو: وازی لێبێنن قەدەر وابوو ((دعوه لو قضی ان یکون کان)).[2]

* * *

١ رواه البخاري (٦٠٣٨).

٢ رواه أحمد (٣/٢٣١).

## فەرموودەی سی و دووەم

## دووعا نەکردن لە منداڵان

عن جابر بن عبدالله (رضی الله عنهما) قال: قال النبي (ﷺ): ((لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَوْلاَدِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لاَ تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ سَاعَةً يُسأَل فِيهَا عَطَاءً فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

موسلیم ڕیوایەتی کردووە (٧٦٢٢) و أبو داود (١٥٣٢).

### ئەو ئەحکامو ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە بەرگری کراوە لە باوكو دایکان دووعا لە منداڵەکانیان بکەن.

دووەم: لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) سابت بووە کە دووعای باوك لەسەر منداڵەکانی گیرایە.

* ئەبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ثلاث دعوات مستجاب لاشك فیهنَّ: دعوة المظلوم، ودعوة المسافر، ودعوة الوالد علی ولده))[1]

واتە: سێ دووعا هەیە بێگومان دێنەدیو خوا وەری دەگرێت: دووعای ستەملێکراو، دووعای گەشتیار، دووعای باوك لە منداڵەکەی.

* حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: دووعای دایكو باوك ریشکی ماڵو منداڵ دەردەهێنێت) پێیان وت: مەبەست چیە لە دووعای دایكو باوك لەسەر کۆرپەیان؟ فەرمووی: (نجاه) واتە: لێی گیرا دەبێت) وتیان لەسەر منداڵەکەی؟ فەرمووی: لە ڕیشە دەری دەهێنێت)[2]

---

١ رواه أحمد (٢/٥٢٨) والبخاري في الادب المفرد (٤٨١) والترمذي (١٩٠٥).

٢ رواه ابن الجوزي في (البر والصلة) (١٦١).

* پیاوێك هاتە خزمەتی عبداللەی کوڕی مبارەك (رەحمەتی خوای لێ بێت) و سکاڵای ناساڵمی کوڕەکەی دەکرد لەلایدا، ئەویش فەرمووی: دووعات لێ کردووە؟ وتی: بەڵێ، عبدالله فەرمووی: خۆت فەوتاندووتە.

* محمدی کوڕی فضل البلخی دەڵێ: بە منداڵی محمدی کوڕی ئیسماعیل البخاری چاوی کوێر بوو، دایکی لە خەودا چاوی کەوت بە ئیبراهیم الخلیل (سەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: ها، ژنەکە لەبەر خاتری ئەو هەموو گریان و دووعاکردنانەت بۆی خوای (عز وجل) چاوەکانی بۆ گێڕایەوە، دەڵێ: بەیانی لە خەو هەستاین چاوەکانی بوخاری چاك بوو بوونەوە.[١]

سێیەم: لە ڕەحمەت و سۆزی خوایە کە لەکاتی توڕەبوون و هەڵچوونی باوك و دایکاندا دووعاکانیان لە منداڵەکانیان گیرا ناکات:

* خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَـٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ عَجُولًا﴾[٢]

* حەسەنی بەسری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَـٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ عَجُولًا﴾ دەفەرموێت: مەبەستی لەوەیە کە باوك توورە بوو دوعای شەڕ لە منداڵ و خێزان و ماڵ و سامانی دەکات ئەگەر ئەم دووعایە بێتەدی تەواو نارەحەت و ڕەنجەڕۆ دەبێت بەڵام پاشان دووعای خێر دەکات و ئەو دووعایەیانی گیرا دەبێت.[٣]

* إبن جرير الطبري (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: خوای گەورە (وەك یادخستنەوەیەکی بەندەکانی) مرۆڤ دوعای شەڕ لە ماڵ و منداڵەکانی

---

١ رواه اللالكائي في (كرامات الاولياء) (٢٢٩).

٢ الاسراء (١١).

٣ رواه عبد بن حميد و ابن منذر وابن أبي حاتم في (الدر المنثور) (٥/٢٤٦).

دەكاتو دەڵێ: خوایە لەناویان بەرە، خوایە لەعنەتیان لێ بكە وەك چۆن لەكاتی خۆشیدا دووعای خێر دەكاتو دەڵێ: خوایە ماڵو منداڵو خێزانمان بێ وەی بكەیت.

دەڵێ: وەك چۆن پێشتر دووعا چاكەكانی بۆ هێناوەتەدی، هەر بەو شێوەیش دووعا شەڕەكانی بهێنایەتەدی تیادەچوو، بەڵام خوا بەڕەحمو بەزەیی خۆی دووعا شەڕەكانی ناهێنێتەدی.[١]

چوارەم:

هەندێك لە پێشەوایانی سەلەفی صالح ئەگەر زۆر لە منداڵەكانیان توڕە ببونایە، پێیان دەووت: (بارك الله فيك):

* ئەحمەدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ابن عوف هەر كاتێك توڕە ببوایە لە خێزانی یان منداڵێكی پێی دەوت: (بارك الله فيك) تا ڕۆژێكیان وتی بە كوڕێكی (بارك الله فيك) كوڕەكەشی وتی: من خوا موبارەكم كات؟ وتی: بەڵێ، یەكێك لە ئامادەبووان وتی: ئێ خۆ شتی خراپی پێ نەوتووی، كوڕەكەش وتی: نا قەد شتی وام پێ ناڵێت مەگەر كاتێك زۆر توڕە بێت لێم.[٢]

پێنجەم:

سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وایە كە موسڵمان دوعای خێر زۆر بكات بۆ ماڵو منداڵی خۆی بەڵكو خوای گەورە دووعاكانی گیرا بكات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر دووعای كردووە بۆ منداڵان:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر منداڵێكیان دەهێنایە خزمەتی دووعای خێری بۆ دەكردن.[٣]

---

١ تفسير الطبري (٤٧/١٥).

٢ رواه ابن عساكر في تأريخه (٣٥٢/٣١).

٣ رواه البخاري (٦٣٥٥).

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەردانی ئەنصاریەکانی دەکردو سڵاوی لە منداڵەکانیان دەکردو دەستی دەهێنـا بـە سـەریانداو دووعای خێری بۆ دەکردن.[1]

شەشەم: لە دووعاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ منداڵان:

١- دووعای فەڕو بەرەکـەت بۆیـان وەك چـۆن لـە فەرمودەکـەی سـائیبی کـوڕی یەزیددا (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی هێنـاوە بـە سەریداو دوعای بەرەکەتی بۆکردووە.[2]

٢- دووعای بۆ حەسەن‌و ئوسـامەی کـوڕی زەیـد کـرد (خوایـان لێ ڕازی بێـت)و فەرمووی: ((اللهم ارحمهما فـاني ارحمهمـا)) واتـە: خوایـە مـن زۆر بـەزەییم پێیانـدا دێتەوە تۆش بەزەییت بێتەوە پێیاندا.[3]

٣- نزاکردن بۆمنداڵ بۆ ئەوەی خوا خۆشی بوێت:

* بـەراء (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوام بینـی (ﷺ) کـە حەسەنی بەسەر شانەوەبوو دەیفەرموو: ((اللهم اني أحبه فاحبـه))[4] واتـە: ئـەی خوایـە من حەسەنم خۆشدەوێت تۆش خۆشت بوێت.

منیش دەڵێم: ئاشکرایە هەر کەسێك خوا خۆشی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگـای خێـرو چاکە.

٤- دووعاکردن بۆ منداڵ بەوەی کە لە ئیسلام شارەزا بێت:

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوشاردمی بەخۆیەوەو فەرمووی: ((اللهم علمه الكتاب)) واتە خوایە لە قورئان شارەزای بکە.

---

١ رواه النسائي في (الكبرى) (١٠١٦١).

٢ رواه البخاري (٦٣٥٢).

٣ رواه البخاري (٦٠٠٣).

٤ رواه البخاري (٣٧٣٥) ومسلم (٦٣٣٨).

٥- دووعاکردن بۆمنداڵ کە دەوڵەمەندو کوڕو کچدار دەربچێت:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: دایکم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە ئەنەسی خزمەتکارتە دووعای بۆ بکە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((کثر ماله و ولده، بارك له فيما أعطيته))[١].

٦- دووعاکردن بۆیان بە هیدایەتو ڕێنموونی:

* کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) منداڵێکی سەرپشك کرد لە هەڵبژاردنی دایکی یان باوکیو فەرمووی: ((اللهم اهده)) خوایە ڕێنموونی بکە، منداڵەکەش باوکی هەڵبژارد.[٢]

٧- دووعاکردن بۆ منداڵ کە بەرەکەت بکەوێتە کاسبیو بازرگانیەکانی:

* عەمری کوڕی حورەیس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دای بەلای عبداللەی کوڕی جەعفەردا یاری بە خۆڵ دەکرد فەرمووی: ((اللهم بارك له في تجارته))[٣] واتە: خوایە بەرەکەت بخەرە بازرگانیەکەیەوە.

٨- داوای لێخۆشبوون کردن بۆی:

* (أبو أياس) دەڵێ: باوکم -أياس کوڕی رياب المزني- هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا منداڵێکی بچوکی بوو، دەستی هێنا بەسەریداو داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد.[٤]

*　　　　*　　　　*

١ رواه البخاري (٦٣٤٤) ومسلم (٦٦٠).

٢ رواه أحمد (٥/٤٤٦-٤٤٧) والنسائي (٣٤٩٥)

٣ رواه ابن عساكر في تأريخه (٢٧/٢٦٠) و (ابن قانع) في (معجم الصحابة) (٢/٣٠٢).

٤ رواه أحمد (٤/١٩) و (ابن ابي عاصم) في (الاحاد والمثاني) (١٠٩٨).

## فەرموودەی سی و سێیەم

## منداڵان فێری ئادابی نان خواردن بکرێن

عن عمر بن ابي سلمة (ﷺ) قال: كنت غلاماً في حجر رسول الله (ﷺ) وكانت يدي تطيش في الصحفة، فقال لى رسول الله (ﷺ) ((يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ))

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

بوخاری لە ژمارە (٥٣٧٦) و (٥٣٧٧) و مسلم (٥٣١٧) و الترمذی (١٨٥٧)و ابن ماجه (٣٢٦٧) لە باسی خواردن بە دەستی ڕاستدا.

### ئەو ئەحکام و ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە سوننەتە منداڵان فێری ڕەوشتی خواردن و خواردنەوە بکرێن.

دووەم: فەرموودەکە ئەوەش دەگەیەنێت کە سوننەت وایە نەهێڵی منداڵ پێچەوانەی شەرع بکات و هەوڵی ڕاستکردنەوەی بدرێت و ڕێڕەوی سوننەتیان بۆ ڕۆشن بکرێتەوە تا لەسەر ڕێبازی سوننەت کۆش بکرێن و دووربن لە سەرپێچی کردنی.

سێیەم: فەرموودەکە ئەوەش دەگەیەنێت کە منداڵان دەتوانن لەگەڵ گەورەدا لەسەر سفرە و خوان و لەگەڵیان نان بخۆن.

چوارەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت منداڵ فێر بکرێت پێش نان خواردن ناوی خوا بهێنێت و بڵێ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ )و لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) سابیت بووە کە شەیتان لەگەڵ منداڵدا نان دەخوات کاتێك ناوی خوای گەورە نەهێنن:

* حذيفة (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووینایە (ﷺ) لەکاتی نان خواردندا ...لە فەرموودەکەدا... کچێك هات و دەستی برد بۆ خواردنەکان و پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی گرت و نەیهێشت، پاشان دەشتەکیەکیش هات و ویستی خۆی بکات بەناو خەڵکەکەداو دەست ببات بۆ خوارنەکە و دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی ئەویشی گرت و فەرمووی: ((ان الشيطان يستحلُّ الطعام ان لا يذكر اسم الله

علیه، وانه جاء بهذه الجاریة، لیستحل بها، فأخذتُ بیدها، فجاء بهذا الاعرابي لیستحل به فاخذت بیده، والذي نفسی بیده ان یده في یدي مع یدها)).[١]

واتە: شەیتان خواردنەکە بۆ خۆی مسۆگەر دەکات بەوەی ناوی خوای لەسەر نەبرێت، شەیتان ویستی لە رێگەی ئەم کچەوە لەم خوارنە بخوات‌و من نەمهێشت، پاشان ئەو عەرەبە لادێ نشینەی هێنا تا بێتە ناو خواردنەکەوەو دووبارە من بوارم پێنەداو دەستیم گرت، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە دەستی شەیتان کەوتە ناو دەستم کاتێك دەستی جاریەکەم گرت.

پێنجەم: فەرمان بەمنداڵ دەدرێت بە دەستی ڕاستی نان بخوات‌و فێربکرێت کە تەنها شەیتان بە دەستی چەپی نان دەخوات‌و ئاو دەخواتەوە:-

* (ابن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((اذا اکل أحدکم فلیأکل بیمینه، واذا شرب فلیشرب بیمینه، فان الشیطان یأکل بشماله ویشرب بشماله))[٢]

هەرچەندە لەم ڕۆژگارەدا زۆرێك لە دایك‌و باوکان‌و سەرپەرشتیاران ئەم سوننەتە گەورەیان فەرامۆش کردووە مەگەر یەکێك خوا رەحمی پێ کردبێت (لە خۆیدا چجای منداڵەکانیان) لەم کارەشیاندا کتومت چاو لە جولەکەو گاور دەکەن کە ئەوان بەدەستی چەپ نان دەخۆن.

شەشەم: منداڵ فێری ئەوە دەکرێت کە دەست بۆ بەردەمی خۆی ببات‌و لەبەردەمی خۆیەوە بخوات:

ئەمە ئەگەر خواردنەکە یەك جۆر بوو، بەڵام ئەگەر زیاتر بوو لە یەك جۆر ئەوە بۆی هەیە شەرعەن دەست ببات بۆ هەر لایەکی سفرەکە بە ئارەزووی خۆی:

---

١ رواه مسلم (٥٣٠٧).

٢ مسلم (٥٣١٣).

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: بەرگ دروویەك پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەعوەت کرد بۆ نان خواردنێكو منیش چووم لەگەڵیداو پێغەمبەر نانەکەی نزیك کردمەوە لەگەڵ قاپێك شلەی کولەکەدا، پێغەمبەرم (ﷺ) بینی کە لەناو تەشتەکەدا دەستی دەگێڕاو بۆ کولەکە دەگەڕا.[1]

حەوتەم: وشەی یاغلام (یا بنيّ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بە جوانترین شێوە منداڵانی بانگ کردووەو قسەی لەگەڵ کردوونو بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیو سۆزو میهرەبانی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ منداڵاندا.[2]

هەشتەم: وشەی (أُدن یا بني) واتە: کوڕی خۆم نزیك بەرەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە بە منداڵی خەڵك بڵێی کوڕم یان کوڕی خۆم بە پێچەوانەی هەندێك لە سەلەف کە پێیان ناخۆش بوە چونکە جۆرێکە لە درۆ.[3]

نۆیەم:

وتەی عمری کوڕی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێت): (کنت غلاماً في حجر رسول الله (ﷺ)) واتە: لە ماڵەکەیداو لەژێر چاودێری ئەودا بوومو مەبەست لە (تطیش في الصحفة) واتە دەستم دەبرد بۆ ئەملاو ئەولای خواردنەکەو لە یەك لاوە نەم دەخوارد.

دەیەم: مەبەست لە وشەی عمری کوڕی سەلەمە کە دەڵێ: (فما زالت تلك طعمتي) واتە لەو ڕۆژەدا بەدوا بەو جۆرە نانم دەخوارد کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمونی کردم بۆی) بەڵگەیە لەسەر پابەندبونی منداڵانی هاوەڵان بە ڕێنمونیو سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)و لێیان لانەداوە.

*　　　*　　　*

---

١ رواه البخاري (٢٠٩٢).

٢ یابنيّ لە (مصنف عبدالرزاق)دا (١٩٥٤٤).

٣ مصنف ابن ابي شيبه (٨٢/٩) والبخاري (الادب المفرد) لا (١١٧) و أبوداود لا(١٨٣).

## فەرموودەی سی و چوارەم

## پەنادانی منداڵ لە خراپە

عن ابن عباس (رضی الله عنهما) قال: كان النبي (ﷺ) يعُوذُ الحسنَ والحسين: ((أعيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّه التَّامَّة، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ، ثم يقول: كان أبوكُم يعوذ بِهما إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

أحمد ڕیوایەتی کردووە (١/٢٧٠)و ابن ابی شیبه (٣٦٢٩) و البخاری (٣٣٧١) و أبو داود (٤٧٣٧) و الترمذی (٢٠٦٠)و ابن ماجه (٣٥٢٥)و ابن حبان (١٠١٢).

### ئەو ئەحکام و ئادابانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێن:

یەکەم:

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر دروستی سوننەتێکی فەرامۆشکراو ئەویش: (پەنادانی منداڵە لە خراپە). بەڵکو تەنانەت فەرمانیش دراوە بەوەی منداڵان پەنا بدرێن وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((عوِّذوا بها أبنائكم، فان ابراهيم عليه السلام كان يعوذ بها بنيه- اسماعيل واسحاق))[1]

واتە: منداڵەکانتان پەنابگرن لە خوا بەو دووعایانەی پێشوو چونکە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) دەیخوێند بەسەر اسماعیل و ئیسحاقی کوڕیدا.

دووەم:

لە سوننەتدا ڕێنمونی کراوە بۆ کۆمەڵێك شت کە بەهۆیانەوە منداڵان لە شەڕو خراپەی شەیتان بەدوور دەگیرێت لەوانە:

١- (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)کردن لەپێش دروستبوون لەگەڵ خێزاندا (جماع):

* ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لو ان أحدكم اذا اتى أهله قال: اللهم جنبني الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتني، فان كان بينهما ولد، لم يضره الشيطان ولم يسلط عليه))[2]

---

١ مصنف -عبدالرزاق (٧٨٩٧).

٢ رواه البخاري (٣٢٨٣).

واتە: ئەگەر بێتو هەر یەکە لە ئێوە کاتێك دەچێتە لای خێزانی بڵێ: خوایە لە شەیتان بمپارێزەو ئەو ڕۆڵەیەش کە پێم دەبەخشی لە شەیتان بیپارێزە ئەگەر بەهۆی ئەو (کاتەوە) منداڵیان ببێت شەیتان ناتوانێت هیچ زیانی پێ بگەیەنێتو دەستی بەسەریدا ناڕوات.

٢- پەناگرتنی لە شەیتان لەکاتی منداڵ بووندا:

وەك چۆن خوای عز وجل باسی خێزانی عمرانمان بۆ دەکات کاتێك مەریەمی بوو، کە چۆن فەرمووی: ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾[1]

سەیرکە چۆن لەپاشی بوونی یەکسەر فەرمووی: خوایە وەك دەبینی کچ بووە دەی پەروەردگار من پەنای خۆیو نەوەکانیشی بە تۆ دەگرم لە شەیتانی نەفرت لێکراو.

* (ابو هریرە) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مامن بني ادم مولود الا يمسه الشيطان حين يولد، فيستهل صارخاً من مس الشيطان غير مريم وابنها))

واتە: هەرچی منداڵە کاتێك لەدایك دەبێت شەیتان دەستی بۆ دەبات لەکاتی لەدایکبوونداو هۆی ئەوەشە لەکاتی لەدایکبووندا دەگری جگە لە مریەمو عیسای کوڕی.

وە (ابو هریرە) لەپاش ئەم فەرموودەیە فەرمووی: (ئەگەر حەز دەکەن ئەو ئایەتە بخوێنن کە دەفەرموێت:﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾)[2].

١ ال عمران (٣٦).

٢ رواه البخاري (٣٤٣١) ومسلم (٦٢٠٩).

٣- لەکاتی خۆر نیشتن یان سەرەتای شەودا نەهێڵین بچنە دەرەوە، چونکە شەیتانەکان لەو دوو کاتەدا بڵاو دەبنەوە:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی ((اذا كان جنح الليل أو امسيتم فكفوا صبيانكم فان الشياطين تنتشر حينئذ، فاذا ذهب ساعة من الليل فخلوهم...))[١]

واتە: هەر کە شەو داهات یان لەکاتی ئێواراندا (پێش ئاوابوون) منداڵەکانتان لە شەیتانەکان بەدوور بگرن چونکە لەو دوو کاتەدا بڵاودەبنەوە، هەرکە ماوەیەك لە شەو تێپەڕی ئیتر وازیان لێ بهێنن -واتە قەیناکات لە دەرەوەبن بۆ کارێك-.

٤- پەنایان پێ بگرن لە خوا هەر بەو شێوازەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) پەنای منداڵەکانیان پێ دەگرن لە شەیاتین.

٥-هەر لە منداڵییەوە دوژمنایەتی شەیتانیان پێ بکەن:

* وەك چۆن خوای گەورە لەسەر زمانی یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) یوسفی بچکۆلە لە دوژمنایەتی شەیتان حاڵی دەکات وەك دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰبُنَىَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾[٢]

سێیەم: ئەگەر مرۆڤ بێ ئاگایانە وازبهێنێ لە پەنادانی منداڵ لە خراپەی شەیاتین، ئەو کاتە شەیتانەکانی جنۆکە دەست دەگرن بەسەریانداو ئازاریان دەدەن، هەروەك لە چیرۆکی ئەم ئافرەتەدا دەردەکەوێت:

* یەعلای کوڕی مورە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە: ئافرەتێك کوڕە بچوکەکەی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەشتێکی بەسەر هاتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((اخرج عدو الله انا رسول الله)) واتە: واز لەو منداڵە بێنە ئەی دوژمنی خوا، من پێغەمبەری خوام) دەڵێ: منداڵەکە چاکبوویەوەو دایکیشی دوو بەرانو هەندێك کەشكو ڕۆنی بە دیاری دا بە

---

١ رواه البخاري في (صحيحه) (٣٢٨٠) و (الادب المفرد) (١٢٣١) ومسلم (٥٢٩٨).

٢ يوسف (٥).

پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش فەرمووی: ((یا علي خذ الاقط والسمن، وخذ احد الکبشین وردّ علیمها الاخر))[١]

واتە: عەلی برۆ کەشكو ڕۆنەکەی لێ وەربگرەو بەرانێکیان گل بەرەوەو ئەوی تر بدەرەوە بەخۆی.

چوارەم: لەبەرئەوەی کە جنۆکەکان توانای ئازاردانی منداڵیان هەیەو منداڵ ناتوانێت خۆی دەرباز بکات لێیان بۆیە لەسەر سەرپەرشتیارەکەیەتی کە: ئەو دووعایانەی بەسەردا بخوێنێت کە پەنای پێ دەگرێت لە شەیتانو لە بەیانیانو ئێواراندا بەردەوام بیانخوێنێت بەسەریدا، لەوانە:

١- خوێندنی (قُل أعُوذ)وەکان-یەکی سێ جارو فوو بکاتە دەستەکانیداو بیهێنێت بەسەر چاو و لەشی منداڵەکەدا.

٢- سورەتی فاتحەی بەسەردا بخوێنێت:

* سائیبی کوڕی یەزید (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فاتحەی بەسەردا خوێندمو پاشان فووی کرد پیامدا)[٢]

٣- خوێندنی ئایەتی کورسی بەسەر منداڵەکەو ماڵەکەشدا:

* (أبو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت:: پێغەمبەر کاری ئاگاداری زەکاتی ڕەمەزانی خستە ئەستۆی من، یەکێك هات بۆ لام، دەستی خستە ناو خواردنەکە، منیش گرتمو وتم پێی دەبێت بتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)... ئەویش وتی: مەمبە بەڵام هەر کاتێك چویتە سەر جێگا بخەویت (ایة الکرسی) بخوێنە بێگومان لەلایەن خواوە دەپارێزرێیتو شەیتان نزیکت نابێتەوە تا بەیانیو کاتێك مەسەلەکەم

---

١ رواه أحمد (١٧٢/٤) والطبراني (٢٦٤/٢٢-٢٦٥) والحاكم (٦١٧/٢) وقال صحيح الاسناد و وافقه الذهبي.

٢ رواه الطبراني (المعجم الكبير) (١٥٩/٧) ٦٦٩٢.

بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کرد فەرمووی: ((صدقك وهو كذوب، ذلك الشيطان))[١] واتە: ڕاست دەکات، هەرچەندە خۆی درۆزنەو ئەوە شەیتان بووە.

* یەحیای کوڕی مەعین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە شەودا کە دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە (٥) جار ئایەتی کورسیم دەخوێند، جارێکیان دەمخوێند دەنگێک هاتو پێی وتم: تا کەی هەر بەردەوام دەیخوێنیت دەڵێ کەس جوان نایزانێت تۆ نەبێت؟! وتم: وابزانم پێت ناخۆشە؟ها؟ دەی وەڵڵاهی زیاتری دەخوێنمو ئەو شەوە بەدواوە کردم بە (٥٠) تا (٦٠) جار.[٢]

پێنجەم:

دەبێت منداڵەکە خۆیشی فێری ئەو دووعایانە بکرێت کە لە شەڕی شەیتانەکان دەیپارێزێت بە یارمەتی خوا:

* عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوەو لە باپیریەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك وشەی فێرکردین کە لەکاتی لە خەو ڕاچڵەکاندا بیخوێنین: ((بسم الله، أعوذ بكلمات الله التامة، من غضبه وعقابه وشر عباده، ومن همزات الشياطين وان يحضرون))

واتە: بەناوی خوا، پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە تووڕەبوونو سزای‌و خراپەی بەندەکانی‌و لاقرتێکانو ئامادەبوونی نادروستیان.

عبداللەی کوڕی عەمر (خوا لێی ڕازی بێت) هەر منداڵێکی پێبگەیشتایە ئەم دووعایەی پێ لەبەر دەکردو ئەگەر زۆر بچوکیش بووایە دەینوسیەوە بە بەرۆکیدا هەڵیدەواسی.[٣]

---

١ رواه البخاري (٥٠١٠).

٢ سير اعلام النبلاء (١١/٨٧).

٣ رواه أحمد (٢/١٨١) والترمذي (٣٥٢٨) وقال حديث حسن غريب.

شەشەم: زانایانی ئەهلی سوننە جیاوازیان هەیە لە مەسەلەی هەڵواسینی دووعا بە منداڵدا، کۆمەڵێکیان ڕێگەیان پێداوە وەك عائیشەو عبداللەی کوڕی عەمر (خوایان لێ ڕازی بێت)و سەعیدی کوڕی موسەیبو یحیی کوڕی سەعیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو ضحاكو مالكو احمد لە ریوایەتێکداو زانایانی دواتریش لەسەر ئەو ڕێڕەوە ڕۆیشتوون.

لە بەرامبەردا دەستەیەکی تریش نەیان هێشتوە ئەم کارە بکرێتو بەرگریان لێ کردووە لەوانە:

* عەقەبەی کوڕی عامیر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: هەوڵواسینی دووعاو نوشتە بە مرۆڤدا هاوبەشی بۆ خوا پەیدا کردنە.[١]

*حەرب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بە احمدی کوڕی حەنبەلم وت: هەڵواسینی نوشتە کە ئایەتی قورئانی تێدابێت یان شتی تر دروستە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (ابن مسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) زۆری پێ ناخۆشو مەکروە بووە بە کەراهەتێکی زۆر توند.[٢]

منیش دەڵێم: هۆی پێ ناخۆشبوونەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەڵواسینەکەی سووکایەتی بە ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەیە بە بردنی بۆ سەر ئاوو شوێنی پیس.

* ئیبراهیم نەخەعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی ناخۆش بووە دوعاو نوشتە بە منداڵاندا هەڵبواسرێتو دەیوت: دەچنە سەرئاو پێیەوە.[٣]

لەلایەکی ترەوە کە لایەنێکی زۆر گرنگەو بەتایبەت لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا کە خەڵکی دەربارەی یەکتاپەرستیو هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا هیچ نازاننو جادو

---

١ رواه ابن ابي شيبه (٣٥١٦).

٢ ابن ابي شيبه (٣٥١٨).

٣ رواه ابن ابي شيبه (٣٥٢٧).

نوشتەی پڕوپوچ (شعوذة) زۆربووە– لەبەر ئەوەی ناتوانرێت ئەوەی بە ئایەتی قورئانی کراوە لەوەی بە ئایەتی قورئان نەنوسراوە جیا بکرێتەوە لەبەر ئەوە فەتوا دراوە بە نەکردنی بەم سێ بەڵگەیەی خوارەوە:

١– بە گشتی بەرگری کراوە لە هەڵواسینی نوشتەو تەمیمە.

٢– ئەگەر ڕێگە درا بە ئایەتی قورئان بنوسرێت ئەوە سەردەکێشێت بۆ هاوبەش پەیداکردن چونکە هەموو جۆرە تەمیمەو نوشتەیەك دەنوسرێتو نازانی کامیان قەدەغە بکەیت چونکە تێکەڵ دەبن.

٣– سوکایەتی کردن بە قورئانی پیرۆزی تێدایە بەوەی دەبرێتە سەرئاو.

حەوتەم: لەسەر باوکان پێوستە کە منداڵەکانیان لەچاو بپارێزن چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە چاو ڕاستەو کاریگەری هەیە بەتایبەت لەسەر منداڵان زیاتر:

* ئەوەتا خوای گەورە باسی یەعقوب پێغەمبەرمان بۆ دەکات (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە چۆن ترساوە کوڕەکانی ببن بە چاوەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾[1].

* ضحاك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا بە یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) لەوە ترساوە کوڕەکانی ببن بە چاوەوە چونکە زۆر جوانو پێکەوتە بوون.[2]

* (ابن قيم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لە چارەسەرەکانی گرفتی چاوو خۆپاراستن لێی، ئەوەیە جوانیەکانی منداڵ لەبەرچاوی خەڵك بشارێتەوە وەك بەغەوی لە (شرح السنه)دا لە عثمانی کوڕی عەفانەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە جارێکیان چاوی کەوت بە منداڵێکی زۆر جوان فەرمووی: چەناگەی ڕەش بکەن با لە چاو پارێزراو بێت.

---

١ يوسف (٦٧).

٢ رواه ابن جرير في تفسيره (١٣/١٣).

هەشتەم: هەر کاتێك منداڵەکە بە چاولێکردن دووچار بوو دووعای تایبەتی بۆ دەکرێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەسمای کچی عومەیسی فەرموو: ((مالی أری اجسام بني أخي ضارعة تصیبهم الحاجة؟ واتە ئەوە چی دەبینم لەشی برازاکانم لاوازە ئایا لە نەبوونیدایە؟ وتی: نەء، بەڵام چاو کاریان تێدەکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((ارقیهم)) واتە دووعایان بۆ بکەن، دەڵێ بردنم بۆ لای دیسان فەرمووی: ((ارقیهم)) دووعایان بۆ بکەن.[1]

* (ام سلمە) خێزانی پێغەمبەرمان (ﷺ)(خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کچێکی بینی لە ماڵی (أم سلمە) کە دەمو چاوی زەرد هەڵگەڕا بوو فەرمووی: ((بها نظرة، فاسترقوا لها)) واتە: ڕەنگی زەردە (چاو کاری لێکردووە) دووعای بۆبکەن.[2]

* عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە گوێی لە منداڵێك بوو دەگریا فەرمووی: ((ما لصبیکم هذا یبکي؟ فهلا استرقیتم لە من العین؟)) واتە: ئەم منداڵەتان بۆ چی دەگری؟ ئایا دوعایەکی بۆ ناکەن بۆ کاریگەری چاو لێی؟

نۆیەم: پێچەوانەی یەکتاپەرستیە کە هەندێك لە نەفامان لە کاتێکدا منداڵێکیان دەبێت شتی سەیرو سەمەرە دەخەنە ژووری سەری یان بەناو چاویدا هەڵیدەواسن یان بە بەر دەرگاکانیدا هەڵیدەواسنو لەو باوەڕەشدان (پەنا بەخوا) کە ئەوانە سودیان پێ دەگەیەنێتو لە چاو دەیانپارێزێت:

---

١ رواه مسلم (٥٧٧٧).

٢ رواه مسلم (٥٧٧٦).

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) هەر كەسێك منداڵی دەبوو دەیان هێنایە خزمەتیو دووعای بۆ دەكردن، جارێكیان منداڵێكیان بۆ هێنا كە پشتیەكی لە ژوور سەردابوو پشتیەكەی هەڵدایەوە دەبینی موسێكی لەژێردایە، پرسیاری لێ كردن دەربارەی ئەو موسە؟ وتیان: لەبەرئەوەی لە جنۆكە پارێزراو بێت، عائیشەیش (خوا لێی ڕازی بێت) موسەكەی گرتو فڕێی داو وتی شتی وانەكەنو فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (طیرة)ی پێ ناخۆش بووەو عائیشەیش بەرگری لێ كردووە.

دەیەم: مەبەست چیە لە وشەی (من كل شیطان وهامة ومن كل عین لامّة)؟:

* أبو عبیدە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: وشەی (هامة) واتە: جانەوەری زەوی وەك دوپشكو مارو هەموو شتێكی تر كە بەسەر زەویدا بڕواتو بگەزێت.[1]

مەبەست لە وشەی (ومن كل عین لامّة):

* الحربی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ:مرۆڤ دووچار دەكاتو لێی دەپچڕێت.[2]

* * *

١ غریب الحدیث (٥٦٢/٢).

٢ هەمان سەرچاوە (٣١٩/١).

## فەرموودەی سی‌و پێنجەم
## چارەسەركردنی منداڵان

عن ام قيس بنت محصنَ (رضى الله عنها): انها أتَـت رسـول الله (ﷺ) بإبنٍ لَها لَـم يبلغ أن يأكل الطعام، وقد أغلقت عليه من العذرة، قالت: فقال رسـول الله (ﷺ) ((عَـلاَمَ تَدْغَرْنَ أوْلاَدكُنَّ بِهَذَا الإِعْلاَقِ، عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ -يَعْنِـى بِـهِ (الْكُسْتَ)- فَـإِنَّ فِيـهِ سَبْعَةَ أشْفِيَةٍ مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

أحمـد ريوايـەتی كـردووە (٦/٣٥٥-٣٥٦)و ابـن ابـی شـيبه (٣٤٨٧)و البخـاری (٥٦٩٢)لە باسی (الطب) و مـسلم (٥٨١٦)و أبـو داود (٣٨٧٧)و النـسائی لـە (الكـبرى) (٧٥٨٣) و ابن ماجه (٣٤٦٣).

### ئەو ئەحكام‌و ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە منـداڵ چارەسـەر بكرێت لەسـەر ئەو دەردو داو و نەخۆشیانەی توشی دەبێت‌و چی باشە بۆی بكرێت.

دووەم: پاداشتی چاك لەلایەن خواوە بۆ باوك‌و دایك ئامادەكراوە ئەگـەر خـۆگرو بـە ئارام بن لەسەر نەخۆشی منداڵەكەیان چونكە ئەوەش بەلاو تاقیكردنەوەیەكی قورسە:

* أبو هريره (خوا لێـی ڕازی بێـت) لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە كـە فەرموویەتی: ((مايزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه ولده وماله، حتى يلقـى الله ومـا عليه خطيئة))[1].

---

[1] رواه أحمد (٢/٤٥٠) والبخاري في الادب المفرد (٤٩٤) والترمذي (٢٣٩٩) وقال حديث حسن صحيح.

واتە: بەردەوام بەڵاو تاقیکردنەوە بەشوێن پیاوانو ژنانی باوەڕدارەوییە، چ لە خۆیدا یان منداڵەکانی یان سامانەکەی تا وای لێ دێت کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا یەك گوناهی نامێنێت، واتە دەبنە کەفارەتی تاوانەکانی.

سێیەم: چارەسەر دوو جۆرە (ماددیو مەعنەوی) بەڵام لەم ڕۆژگارەدا زۆرێك لە موسڵمانان پشت بە بەشە ماددیەکەی دەبەستن وەك دەرزیو دەرمانو بەشە مەعنەویە گرنگەکەیان فەرامۆش کردووە کە چارەسەرە بە ئایەتەکانی قورئانو دووعاکانی پێغەمبەر (ﷺ):

ئەوەتا خوای (عز وجل) دەفەرموێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾[1] واتە: ئەو قورئانەی ناردوومانە چارەسەرەو رەحمەتە بۆ باوەڕداران بەڵام ستەماران جگە لە زیانی سودی لێ نابینن.

* عبداللەی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: دوو چارەسەرە مەزنەکە بەکاربهێنن یەکەم قورئان دووەم هەنگوین.[2]

چوارەم: لەو سوننەتە فەرامۆش کراوانەی کە لەگەڵ منداڵی نەخۆشدا بەکاردێن:

١- خوێندنی هەر سێ (معوذات) واتە: ﴿قُل هُوَ اللهُ أحَد﴾ و ﴿قُل أعُوذ بِرَب النّاس﴾و ﴿قُل أعُوذُ بِرَب الفَلَق﴾ فووکردن بەسەر نەخۆشەکەدا.

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە هەر کاتێك یەکێك نەخۆش بکەوتایە (معوذات)ی بەسەردا دەخوێندو فووی دەکرد پیایدا.[3]

---

١ الاسراء (٨٢).

٢ رواه ابن ابي شيبه (٣٧٤١) واسناده صحيح.

٣ رواه مسلم (٥٧٦٥).

٢–خوێندنی سورەتی فاتیحە بەسەریدا:

* (ابو سعيد الخدری) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چوونە ناو هەندێك لە هۆزە عەرەبەکان، بەڵام بەگەرمی خوڵکیان نەکردن، لەو کاتەدا سەرۆك هۆزەکەیان مار پێوەی دابوو، وتیان: ئایا چارەسەرێك، دوعایە، شتێکتان پێ نیە؟

هاوەڵانیش (خوا لێیان ڕازی بێت) فەرموویان: ئێوە فەرمووتان لە ئێمە نەکرد، بۆیە دەبێت لە بەرامبەردا شتمان پێ بدەن، ئەوانیش لەسەر چەند سەر مەڕێك ڕێکەکەوتن، یەکێکیان دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی فاتحە بە سەریداو تفەکەی لەگەڵ فودا دەهێناو بەشوێن دەمی مارەکەدا –چاك بوویەوە بە جۆرێك هەستایەوە ڕای کرد بەو ناوەدا– ئەوانیش مەڕەکانیان پێدان، بەڵام وەریان نەگرت وتیان تا پرس بە پێغەمبەر (ﷺ) نەکەین، کاتێك لێیان پرسی: دەستی کرد بە پێکەنینو فەرمووی: ئەوە چۆن زانیت سورەتی فاتیحە دوعایەکی چارەسەرە (رقیة)یە؟ بەڵێ لێیان وەربگرنو بەشێکیش بۆمن دابنێن) وە فەرمووی: (وما ادراك انها رقية؟ خذوها واضربوا لي بسهم)[1].

پێنجەم: هەر لە سوننەتە فەرامۆشکراوەکانە دەست هێنان بە سەری نەخۆشەکەداو دووعاکردن بۆی:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: هەر کاتێك یەکێکمان ئازارێکمان هەبووایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی دەهێنا بە سەر ئازارەکەداو دەیفەرموو: ((إذهب البأس، رب الناس، واشف انت الشافي، لاشفاء الا شفاءك، شفاءً لايغادر سقماً))[2].

واتە: ئازارەکە لابە ئەی پەروەردگاری خەڵکی، چارەسەری بکە چونکە تەنها تۆیت چارەسەرکەر، جگە لە چارەسەری تۆ چارەسەرێکی تر نیە، چارەسەرێکی وای بکە نەخۆشی تێدا نەمێنێت.

---

١ رواه البخاري (٥٧٣٦).

٢ رواه البخاري (٥٧٥٠) و مسلم (٥٧٥٨) واللفظ له.

* محمدی کوڕی حاطب (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: مەنجەڵێکی گەرمم بۆ دایکم هەڵگرتو دەستم سووتا، ئەویش بردمی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش: دەستی هێنا بەسەر دەستە سووتاوەکەمداو شتێکی بەسەردا خوێند کە من لەبەر منداڵیم نەمزانی چی خوێند، پاشان لە دایکم پرسی ئەوە چی خوێند بە سەرمدا؟ ئەویش وتی: ئەمەی دەفەرموو: ((إذهب البأس، رب الناس، واشف انت الشافي، لاشفاء الا شفاءك))[1]

* أبو سعيد الخدري (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە: جیبریل (سەلامی خوای لەسەر بێت) هات بۆلای پێغەمبەرو پێی وت: ئەی محمد، ئازارت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش وتی: ((بسم الله أرقيك، من كل شيء يؤذيك، من شر كل نفس أو عين حاسد، الله يشفيك بسم الله أرقيك))

* عائیشەی کچی سەعد (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: باوکم وتی لە مەککە بووین – پێش کۆچکردن بۆ مەدینە– ئازارێك کەوتە سەرم، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلام بۆ سەردانم دەستی خستە سەر ناوچەوانمو پاشان دەستی گەڕاند بەسەر سنگو سکمداو فەرمووی: ((اللهم اشف سعداً واتمم له هجرته))[2]

واتە: ئەی پەروەردگارم شیفای سەعد بدەو کۆچەکردنەکەی بۆ تەواو بکە.

شەشەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) منداڵانی فێر دەکرد هەر کاتێك نەخۆش بوون بە تاو لەرز یان هەر نەخۆشیەکی تر هاوار بکەنە خوا تا چاکیان بکاتەوە:

* ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی لەرزو تاو هەر ئازارێکدا فێری دەکردین بڵێین: ((بسم الله الكبير، من شرِّ عرق نعّار، ومن شر حر النار))[3]

واتە: بەناوی خوای مەزنەوە، پەنا دەگرین لە خوێن بەربوونی ڕەگەکانی لەش و خراپەی سوتانی ئاگر.

---

١ رواه أحمد (٢٥٩/٤) والنسائي في الكبرى (٧٥٣٨) والطبراني في الدعاء (١١٠٧) واسناده صحيح.

٢ رواه البخاري (٥٦٥٩) وابو داود (٣١٠٤) واللفظ له.

٣ رواه أحمد (٣٠٠/١) والترمذي (٢٠٧٥) وابن ماجة (٣٥٢٦) والحاكم (٤١٤/٤) وصححه.

* (عوثمان)ی کوڕی (ابي العاص الثقفی) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لەو کاتەوە موسڵمان بوو بوو ئێشێك پەڕیبوە سکی، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو: ((ضع يدك على الذي تألم من جسدك (امسحه بيمينك سبع مرات) وقل: بسم الله (ثلاثاً) وقل سبع مرات: (أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر)) واتە: دەست بخەرە شوێنی ئازارەکەو حەوت جار دەستی ڕاستی پێدا بێنەو سێ جار بڵێ بەناوی خوا، حەوت جاریش بڵێ: پەنا دەگرم بە خواو دەسەڵاتی خوا لە هەمو ئێش‌و ئازارێك کە تێمدا بێت‌و لێی بترسم.

دەڵێ: بەو جۆرەم کردو خوای گەورەیش ئازارەکەی هەڵگرتم‌و بەردەوام بە ماڵ‌و منداڵەکەم دەڵێم وا بکەن.[1]

حەوتەم: فەرموودەکە گرنگیدانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیەنێت بە چارەسەری منداڵان‌و پاراستنی لە دەردو داو نەخۆشی کە دەبێتە هۆی گریان‌و ئازاریان.

وەك چۆن لە فەرموودەکەدا بەرگری لێکردن لەوەی پەڕۆ بکێشنە لوتی منداڵەکەو جێگە ئازارەکە بکوڵێننەوەو خوێنی ڕەشی لێ دەربهێنن، کە لەو کاتەدا باوی بووە.

تەنانەت ویستیشی بەرگری بکات لە موسڵمانان کە لە ماوەی شیرپێدانی منداڵدا پیاوان بچنە لای خێزانەکانیان کە پێی دەڵێن –غیله–:

* (جدامه)ی کچی (وهب الاسديه) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوای بیست (ﷺ) کە دەیفەرموو: ((لقد هممت ان انهى عن الغيلة، حتى ذكرت ان الروم والفارس يصنعون ذلك فلا يضرُّ أولادهم))[2].

واتە: نیازم کردووە قەدەغەی بکەم لەسەر پیاوان لەماوەی شیرپێدانی منداڵدا بچنە لای خێزانەکانیان بەڵام بیرم کردەوە ڕۆم‌و فارسەکان ئەو کارە دەکەن‌و هیچ زیانێکیشی نیە بۆ منداڵەکانیان، بۆیە ئەو کارەم نەکرد.

---

١ رواه مسلم (٥٧٨٨) وابو داود (٣٨٩١) وابن ماجة (٣٥٢٢).

٢ رواه مسلم (٣٥٥٤) وابو داود (٣٨٨٢) والترمذي (٢٠٧٦).

هەشتەم:

فەرموودەكە ئەوەش دەگەیەنێت كە دروستە منداڵ چارەسەر بكرێت لەكاتی نەخۆش كەوتنیدا، ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) شێوازی چارەسەركردنی نەخۆشی گەروو –عذرة–یان فێر دەكات، بەرگریان لێ دەكات بەو شێوەیەی پێشوو چارەسەری بكەن كە زیان بە منداڵەكە دەگەیەنێت.

وشەی (عذرة) واتای چیە لە فەرموودەكەدا؟

عذرة: ئازارێكە لە گەروداو بە زۆری منداڵان تووشی دەبنو برینێكە لەنێوان گوێو گەرووداا.

* مصعبی كوڕی عبدالله دەڵێ: عذرة لەو سەردەمەدا بەو شێوەیە چارەسەر دەكرا كە ئافرەتان پەڕۆیەكی درێژیان دەئاخنیە لووتیو دەگەیشتە ئەوپەڕی بڕناخو برینەكەی دەكولاندەوەو خوێنی ڕەشی لێ دەهاتو لەوانەیە ئەو برینە دوای ئەوە هەر خۆش نەدەبوویەوە ئەوەش مانای (العُذرة)یە.[١]

* پزیشك محمد بن علي البار دەڵێ: وا دیارە بە نیشانەكانیدا (العذرة)یە بە مانای سوربوونەوەی لەوزەكانی گەروە واتە (لەوزەتەین)[٢]

نۆیەم:

لە فەرموودەكەدا ئەوە هاتووە كە دروست نیە بۆ دایكو باوكان چارەسەری منداڵەكانیان بكەن بە شتانێكی ترسناك كە لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی منداڵەكە:

* (ابن حبیب) لە كتێبی (الطب النبوي) لاپەڕە (١٢٢)دا دەڵێ: قدامە پێی وتم (الاعلاق) واتە: ئاسنێك سووردەكرێت وەك نوكی تیری لێ دەكرێتو زۆر تیژ دەكرێتو پاشان دەكرێت بە قوڕگی منداڵەكەداو دەیچەقێنن پیایدا تا خوێنی لێ دێت.

---

١ غریب الحدیث/ للحربي (١/٢٦٩).

٢ حاشیة الطب النبوي– ابن حبیب– لا (١٢٢).

دەیەم: لەبەرئەوەی ئەو چارەسەرەی پێشەوە بە ئازارو ترسناكە بۆ منداڵەكەو لەوانەیە تووشی خوێنبەربوون ببێت لە هەندێك حاڵەتدا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری لێ كردووە، ڕێنمونی كردووە بۆ چارەسەرێكی گونجاوتر:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووەتە ژوورەوە لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەبینێت منداڵێك لە بڕناخیەوە دێتە خوارەوە، فەرمووی: ((ما شأن هذا الصبي))؟ ئەم منداڵە چیەتی؟ عائیشە فەرمووی: (نەخۆشی گەرووی هەیە (العذرة)، پێغەمبەر فەرمووی: ((لاتقتلوا اولادكم، ولكن أيّة امراة تصيبها (العذرة)، أو وجع في رأسه، فلتأخذ قُسطاً هندياً، ثم لتحته بالماء –سبع مرات– ثم لتُسعِطهُ إياه))

واتە: هەر كەس تووشی ئەو نەخۆشیە بوو یان سەری دەئێشا شتی وا مەكەن منداڵەكانتان مەكوژن، با ڕووەكی هندی بهێنن، بیكەن بەناو ئاودا –حەوت جار– و پاشان لە ڕێگەی لوتەوە بیدەنێ، پاشان فەرمانی دا بە عائیشە وابكات و ئەویش بەو جۆرەی كردو چاك بوویەوە.[1]

یازدەیەم: مەبەست چیە لە (القُسط البحري) لە فەرموودەكەدا:

* (ابن قیم) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: داری هندیەو ڕەنگی سپیەو تامی شیرینەو سودێكی زۆری هەیەو چارەسەری منداڵەكانیان پێ كردووەو بە پەنجە برینەكەیان كون كردووە یان شتیان بە منداڵەكەدا هەڵواسیوەو پێغەمبەر قەدەغەی كردن لەم شتانەو ڕێنمونی كردن بۆ شتانێكی بەسودترو ئاسانتر.

بەڵام (السَّعوط) دەرمانەكەیە كە لە لوتەوە دەدرێت بە منداڵەكە (وەك قەترەی ئەمڕۆمان) دەرمانە لەگەڵ گیراوەی تردا جوان دەشێلرێتو پاشان وشك دەكرێتەوەو لەكاتی پێویستدا دەتوێنرێتەوەو دەكرێتە لووتی نەخۆشەكە...

---

[1] رواه أحمد (٣/٣١٥) والحاكم (٤/٢٠٥-٢٠٦) واسناده حسن.

بە جۆرێك نەخۆشەكە لەسەر پشت دەخرێتو ملی دەخرێ بە پشتدا بە ئاسانی دەرمانەكە بگاتە مێشكیو دەست دەكات بە پژمینو هەرچی دەردو دایەكی هەیە دەری دەداتە دەرەوەو ئەم كارەیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەدحو سەنای كردووەو أبو داود لە (سنن)ەكەیدا هێناویەتی كە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خۆی بەكاری هێناوە.[1]

پێناسەیەكی وشەی (القُسط) لە فەرموودەكەدا:

(القُسط) پێشی دەڵێن (الكُست)و پێشی دەڵێن (العود) واتە دارو جۆرە دەرمانێكی دەریاییە.

جۆرەكانی:

یەكەم: سپیەكی كاڵ مەیلەو زەردو بۆن خۆشو عەرەبیەو پێشی دەڵێن (العربی).

دووەم: ڕەشێكی تۆخو پێی دەڵێن (هندی).

سێیەم: لە سوریا هەیەو ڕەنگی وەك ڕەنگی تەختەیە.

باشترین جۆری سپی عەرەبیەكەیەتی كە تازە بێتو پڕ بێتو كۆن نەبێتو بۆنی نەكردبێتو ئەم جۆرە دەلكێ بە زماندا، لە دوای ئەویشەوە جۆرە هندیەكەیەتیو ڕەشی شامی، بەڵام باشترینیان دەریاییە توێكڵ تەنكەكەیە وەك (ابن سینا) دەڵێ.

* ابن حبیب دەڵێ: مەبەست لە (قِسط) واتە قسطی هیندیە.

* (إبن قیم)یش دەڵێ: (قُسط) بە هەردوو جۆرەكەیەوە سودبەخشە، چ سپیەكەی كە پێی دەڵێن دەریایی، ئەوی تریش جۆری هیندیەو ئەمە زۆر گەرمو توونەو سپیەكەشی زۆر نەرمە، هەردووكیان ئێجگار بەسوودن.[2]

دوازدەیەم: دروستە بۆ مرۆڤ كە منداڵێكی نەخۆشی هەبوو بیبات بۆلای كەسانێكی خواناسو لەخواترس تا لە خوا بپاڕێتەوە بۆیو داوای شیفای بۆ بكات:

* سائبی كوڕی یەزید (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: نەخۆش بووم ئازارم هەبوو پورم بردمیە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم

---

١ زاد المعاد (٤/٩٥-٩٦).

٢ أحكام الادوية لا (٢١٣-٢١٤).

خوشكەزایەم ئازاری هەیە، ئەویش دەستی هێنا بە سەرمدا دووعای فەڕو بەرەكەتی بۆ كردم.[١]

سێزدەیەم: هەر لە سۆزو بەزەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ منداڵان سەردانی منداڵە نەخۆشەكانی كردووەو بوخاریش باسێكی ناوناوە (باسی سەردانی منداڵانی نەخۆش):

* ئوسامەی كوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: كچێكی پێغەمبەر (ﷺ) جوابی نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) كە لەو كاتەدا ئەو سەعدو ئوبەی لەگەڵدابوو پێی وت: منداڵەكەم گیان دەدات بەڵكو بێیت بۆ لامان...

لە فەرموودەكەدا هاتووە كە دەڵێ.. هەستاو ئێمەیش لەگەڵی هەستاین‌و چوین‌و منداڵەكەی خستە سەر ڕانی‌و دوا هەناسەی دەداو چاوەكانی پێغەمبەر پڕبوون لە ئاو، سەعدیش پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گریانە چیە؟ ئەویش فەرمووی: ((هذه رحمة وضعها الله في قلوب من يشاء من عباده، ولا يرحم الله من عباده الا الرحماء))[٢]

ئاگاهیەك:

سوننەتە ئەگەر سەردانی نەخۆشمان كرد لەپاڵ سەریدا دابنیشین‌و دووعای بۆ بكەین:

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((مامن مسلم يعود مريضاً لم يحضر أجله فيقول سبع مرات: اسأل الله العظيم، رب الرش العظيم أن يشفيك، الا عوفي))[٣].

واتە: هەر كەسێكی موسڵمان سەردانی نەخۆشێك بكات‌و ئەم دووعایە بكات چاك دەبێتەوە مەگەر هەر ئەجەلی هاتبێت‌و بڵێ: داوا لە خوا لە پەروەردگاری گەورەو مەزن دەكەم، پەروەردگاری خاوەنی عەرشی مەزن، كە خۆشت بكاتەوە.

---

١ رواه البخاري (٥٦٧٠).

٢ رواه االبخاري (٥٦٥٥).

٣ رواه أحمد (١/٢٣٩) والبخاري في الادب المفرد (٥٣٦).

لە فەرموودەی (أبو داود)دا هاتووە کە (صحیح)ەو دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری لە هەر نەخۆشێك بدایە لە ژووری سەریدا دادەنیشتو ئەم دوعایەی دەخوێند: ((أسأل اله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك)).

* ڕەبیعی کوڕی عبدالله دەڵێ: لەگەڵ حەسەندا چووین بۆ سەردانی قەتادە کە نەخۆش بوو، لەلای سەریدا دانیشتو پرسیاری نەخۆشیەکەی لێکردو پاشان دووعای بۆ کردو وتی: اللهم اشف قلبه، واشف سقمه)[1]

واتە: پەروەردگارم دڵی چاك بکەرەوەو نەخۆشیەکەی چاك بکەرەوە.

* (ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی نەخۆشێکی کرد فەرمووی پێی: ((لا بأس طهور إن شاءالله))[2] واتە: هیچ نیە، چاکەبیتەوە ان شاءالله.

چواردەیەم: هەر لە بەزەیی‌و سۆزی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ منداڵان بەتایبەت لەو کاتەدا کە نەخۆش بوون یان لەکاتی گیان دەرچووندا وەك لە فەرموودەکەی ئوسامەدا هاتووە.

پازدەیەم: دروستە موسڵمان سەردانی نەخۆشی منداڵی بێ باوەڕان بکاتو لەوێش بانگی بکات بۆ موسڵمان بوونو شایەتومان هێنان ئەگەر لە سەرەمەرگدا بوو:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: منداڵێکی جولەکە خزمەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەکرد ڕۆژێك نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ((إذهبوا بنا اليه نعوده)) واتە با بڕۆین بۆ سەردانی کردنی.

چوون بۆلای‌و لەو کاتەدا باوکی لەژوور سەریدا دانیشتبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((قل لا إله الا الله، اشفع لك بها يوم القيامة)) واتە: بڵێ، (لا إله الا الله) لەڕۆژی قیامەتدا بەو هۆیەوە تکای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم.

---

١ رواه البخاري في الادب المفرد (٥٣٦).

٢ رواه البخاري (١٣٥٦) وابن حبان (٢٩٦٠) واللفظ له.

منداڵەكەش سەیری باوكی دەكردو باوكیشی پێی وت: باوكی قاسم چیت پێ دەڵێت وابكە، ئەویش وتی: أشهد أن لا إلە إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((الحمد لله الذي انقذه من نار جهنم)) سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری كرد.

شازدەیەم: هەندێك لەو دەرمانانە كە سوننەتە بەكارهێنانیان كە لەلایەن زۆربەی موسڵمانانەوە فەرامۆش كراوەو لەجیاتیدا دارو دەرمانی سەردەم بەكاردەهێنن كە زۆربەی ئاسەواری خراپی لەسەر منداڵ هەیە لەوانە:

١- هەنگوین:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[١]

واتە لەپاش ئەوەی خوای گەورە باسی شوێنو ماوای هەنگ دەكات مەدحو وەسفی هەنگوین دەكاتو دەفەرموێت: شیفاو چارەسەری نەخۆشیەكانی خەڵكیە.

* ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((الشفاء في ثلاثة، في شرطة محجم، او شربة عسل، او كيّة بنار، وانهى امتي عن الكي))[٢]

واتە: چارەسەر لە سێ شتدایە یەكەم كەڵەشاخ گرتن دووەم هەنگوین خواردنو داخكردن بە ئاگر، نایەڵم ئوممەتەكەم بە داخكردن چارەسەری خۆیان بكەن.

* أبو سعيد (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و عەرزی كرد: براكەم سكی دەچێت؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

١ النحل (٦٨-٦٩).

٢ رواه البخاري (٥٦٨١).

فەرمووی: هەنگوینی بدەرێ ((إسقه عسلاً))و ئەویش هەنگوینی پێداو پاش ماوەیەك هاتەوەو وتی: هەنگوینم پێدا بەڵام سکچونەکەی خراپتربوو، سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوەو لە چوارەم جاردا هەر پێی فەرموو: ((إسقه عسلاً))و ئەویش وتی: هەنگوینم پێداوە بەڵام سکچوونەکەی خراپتر بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((صدق الله وكذب بطن أخيك)) واتە خوا ڕاستی فەرمووە بەڵام سکی براکەی تۆ درۆ دەکات)و دیسان هەنگوینی پێداو چاکبوویەوە.[1]

٢-الحبة السوداء- ڕەشکە:

* خالیدی کوڕی سەعد دەڵێ: لە ماڵ دەرچووین بەرەو شاری مەدینەو لەڕێگا غالبی کوڕی ئەبجەرمان لەگەڵدابوو نەخۆش کەوتو بەو شێوەیەوە چووینەوە ئەوێو (ابن ابی عتیق) هات بۆ سەردانیکردنیو پێی وت: ئەو دەنکە ڕەشانە پەیدا بکەن (ڕەشکە) پێنج تا حەوت دانەی لێ ورد بکەنو پاشان بیتکێننە لووتیەوە لەگەڵ زەیتدا لە هەردوو کونی لووتیەوە چونکە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) خۆی باسی بۆ کردم کە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستوویەتی کە فەرموویەتی :((إن هذه الحبة السوداء شفاء من كل داء الا من السّام)) واتە: ئەم دەنکە ڕەشانە (ڕەشکە) چارەسەرن بۆ هەموو نەخۆشیەك جگە لە (سام) وتیان: سام چیە؟ فەرمووی: ((الموت)) واتە مردن.[2]

٣-ئاوی زەمزەم:

* (أبو ذر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إنها مباركة، إنها طعام طعم و(شفاء سقم))[3].

واتە: ئاوێکی موبارەكو بە فەڕە، ئاوێکە جێگەی خواردنو نان دەگرێتەوەو چارەسەری نەخۆشیە.

---

١ رواه البخاري (٥٦٨٤) ومسلم (٥٨٢٣) واللفظ له.

٢ رواه البخاري (٥٦٨٧).

٣ رواه مسلم (٦٤٤٢) والزيادة للطيالسي (٤٥٩) والزيادة صحيحه.

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ماء زمزم لما شرب له))[١] واتە: ئاوی زەمزەم چارەسەرە بۆ هەر نەخۆشیەك لەبەر ئەو بخورێتەوە.

* إبن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئێمە ئاوی زەمزەممان نابوو تێرکەر، وامان دەزانی باشترین هاوکارە بۆ خێزانە فرە منداڵەکان.[٢]

* عبداللەی کوڕی عوسمانی کوڕی خەسیم (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: وهبی کوڕی مونبەه هات بۆ لامان بۆ مەککە، لەوێ نەخۆش کەوتو ئێمەش چووین بۆ سەردانیو دەبینین ئاوی زەمزەمی لەلایە، پێمان وت: بۆچی ئاوێکی شیرینو خۆش ناخۆیتەوە، ئەم ئاوە خەسە.

فەرمووی: نامەوێ ئاوی تر بخۆمەوەو شتی ترم لێ بچێتە دەرەوە، سوێند بەوەی کە گیانی وەهەبی بەدەستە ئەم ئاوە لە قورئاندا (مضنونة) واتە: ئاوی نەبراوە بەوەی کە بیری ئاوە یان شتی تر، لە قورئانەکەی خوادا خواردنە خواردنو چارەسەری نەخۆشیە، هەروەها سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە هەر کەسێك پەلاماری بداتو تێری لێ بخواتەوە تا پەلوپۆی دەکرێتەوە ئەوە ئەو نەخۆشیو ئازارەی لەسەر لادەباتو شیفای بۆ دەنێرێت.[٣]

حەڤدەیەم: دروست نیە متوموورو ملوانکەو پەڕۆ بە منداڵدا هەڵبواسرێت کە هەندێك لە نەفامو ناحاڵیەکان وا دەزانن شیفایان پێوەیەو ئەمەش بە هیچ جۆر لەگەڵ یەکتاپەرستی تەواودا یەکناگرنەوە:

* بوکەیر دەگێڕێتەوەو دەڵێ: دایکی بۆی باس کردووەو وتویەتی چووم بۆلای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت)و مەخرەمەی برازام لەگەڵ خۆم برد کە ئەوکات ئەو تیماری برینی منداڵانی دەکردو کاتێك لە مەخرەمە لێ بوویەوە، بینی خاڵخاڵی لە قاچدا بوو کە ئاسن بوون، فەرمووی بە دایکی: ئێوە وا دەزانن ئەم خاڵخاڵەی کردووتانە

---

١ رواه أحمد (٣/٣٥٧) و ابن ماجة (٣٠٦٢) وهو حديث حسن بشواهده.

٢ رواه ابن ابي شيبه (٢٠٠٨) و عبدالرزاق (٩١٢٠).

٣ رواه الازرقي في (اخبار مكة) (٢/٤٩–٥٠).

قاچی ئەم منداڵە بەلاو توشهاتێکی لێ دووردەکەوێتەوە کە خوا لەسەری نووسیبێ؟!!
جارێکی تر ئەمەی پێوە ببینم چارەسەری ناکەمو دەستی پێوە نادەم، بەتەمەنم ئەگەر خاڵخاڵێکی زیوی پێوەبێت خاوێنترە.[1]

هەژدەیەم: نەخۆشی (ذات الجنب) کەلەکە ئێشە:

* ابن قیم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (ذات الجنب) لەلای دکتۆرەکان دوو جۆرە جۆرێکی ڕاستیەو ئاشکرایەو جۆرێکی ناڕاستەوخۆ و نادیارە:

یەکەم/ ڕاستو ئاشکراکەیان: ئێشێکی توندە دەکەوێتە ئەم بەرو ئەوبەری کەلەکەی مرۆڤ و هۆکارەکەی لەناو لەشیەوە دیارنیە.

دووەم/ ناڕاستو نادیارە: ئەویش هەروەك ئێشەکەی پێشووە بەلام بەهۆی ڕەشەباو کزەبای توندەوە توش دەبێت،

دەڵێ: ئەو چارەسەرەی لە فەرموودکەدا هاتووە بۆ بەشی یەکەم نابێت بەڵکو بۆ بەشی دووەم چارەسەرە کە بەهۆی ڕەشەباو کزەبای توندەوە تووش دەبێت، وە (قسط البحری) کە دارێکی هندیە بەجۆرێکی زۆر نەرم وشلەو لەگەڵ زەیتی کولاودا تێکەڵ دەکرێتو ئەو شوێنەی پێ دەسوێ یان پێ دەدرێت بە کەوچك تا بیخواتو زۆر بەسوودەو نەخۆشەکە چاك دەکاتەوە، دەڵێ: (نەخۆشی (ذات الجنب) یەکێکە لە نەخۆشیە ترسناکەکان)[2]

نۆزدەیەم: زانایان هەر لە کۆنو نوێدا گرنگیان داوە بە زانستی پزیشکی منداڵو لەو بارەیەوە چەندان کێبیان نووسیوە لەوانە:

١- (رسالة في طب الاطفال) محمدی کوڕی زەکەریای (الرازی) (٣١٣) کۆچی.
٢- (سیاسه الصبیان وتدبیرهم) لابن جزار القیروانی (٣٦٩).

* * *

---

١ رواه ابن وهب في (الجامع) (٦٦٨)، والحاكم في (المستدرك) (٤/٢١٨-٢١٨) قال هذا الحديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه واقره الذهبي.

٢ زاد المعاد (٤/٨١-٨٣).

## فەرموودەی سی و شەشەم

## جل وبەرگ و جوانی منداڵان

عن ام خالد بنت خالد (رضی الله عنها) اتي النبي (ﷺ) بثياب فيها خميصة سوداء صغيرة، فقال: ((مَنْ تَرَوْنَ أن نَكْسُو هَذه؟ فسَكتَ الْقَوْمُ فقَالَ ((ائْتُونِى بِأُمِّ خَالِدٍ)) فَأُتِيَ بهَا تُحْملُ، فأخذَ الْخَمِيصَةَ بِيَدِهِ فَأَلْبسَها وقَال ((أَبْلِي وَأَخْلِقِي)). وكَانَ فِيهَا عَلَمٌ أخْضَرُ أوْ أصْفَرُ فَقَالَ ((يَا أُمَّ خَالِدٍ هَذَا سَنَاهْ وَسَنَاهْ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنٌ))

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

أحمد ڕیوایەتی کردووە (٦/٣٦٤-٣٦٥)و البخاری (کتاب اللباس) (٥٨٢٣) (٣٠٧١)و (٣٨٧٤)و (٥٨٤٥)و (٥٩٩٣) أبو داود (٤٢٠٠).

### ئەو ئەحکامو ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم: پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵەکانی (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر گرنگیان داوە بە جوانکردنو ڕازاندنەوەی کچەکانیانو لەبەرکردنی جوانترین جلو بەرگ:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: کاتێك ئوسامەی کوڕی زەید سەر سمێکی داو کەوت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵیساندەوەو فەرمووی: ((لو کان أُسامة جارية لحليته وكسوته حتى أنفقه))[1] واتە ئەگەر ئوسامە کچ دەبوو لە ئاڵتون هەڵم دەکێشاو جلو بەرگی جوانیشم لەبەر دەکرد.

* أبو هريره (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: جارێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووم... لە فەرموودەکەدا هاتووە... تا گەیشتە ژوورەکەی فاطمة (خوا لێی ڕازی بێت)و فەرمووی: ((أثَم لُكَعُ، أثمَّ لَكَعُ))[2] واتە دیسان حەسەنتان لاڵ کردووە؟ أبو هريره دەڵێ گومانمان برد کە فاطمة شۆردویەتیو گوڕیویەتیو ئەوەندەی نەبرد بە

---

١ پێشتر سەرچاوەکەی دراوە.

٢ لکع: اصمعی دەڵێ واتە کەسێك قسەی بۆ نایەت (لسان العرب) (٨/٣٢٣).

ڕاکردن هات‌و باوەشیان کرد بە یەکداو فەرمووی: ((اللهم اني أحبه فاحبه واحب من يحبه))[١] واتە: ئەی خوایە من خۆشم دەوێت (تکام وایە) تۆش خۆشت بوێت‌و ئەویشت خۆش بوێت کە خۆشی دەوێن.

دووەم: مرۆڤ حەز دەکات منداڵەکانی بەشێوەیەکی گەورەو خاوەن کەسایەتی گەورە بن‌و زاناو ناودار دەربچن لە پاشەڕۆژدا، کاریگەری خۆی دەبێت لەسەریان‌و هەوڵ دەدەن خۆیان چاك بکەن‌و چاو لە زاناو ئەهلی زانست‌و چاکەخوازان بکەن، بۆیە هەر بە منداڵی عەمامەکانی خۆیان کردۆتە سەریان تا شەرمی ئەو عەمامە بیانگرێت‌و زانان‌و ناودار دەربچن:

* ئیبراهیمی کوڕی سەعد دەڵێ: لە بیرمە باوکم کۆمەڵێ عەمامەی هەبوو (نەمدەزانی چەن دانەن) خۆی عەمامەیەکی لەسەر دەکردو دانەیەکیشی دەکردە سەری من، من لەو کاتەدا منداڵ بووم‌و هاوڕێکانیشم عەمامەیان دەبەست.[٢]

* مالیکی کوڕی ئەنەس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (منداڵ بووم) بە دایکم وت: دەڕۆم دەخوێنم‌و زانست وەردەگرم، دایکم وتی: جارێ وەرە پێشەکی جل‌و بەرگی زانایان بپۆشەو پاشان زانست بنووسەوە، دەڵێ: گرتمی‌و دەستێك جلی شۆڕی لەبەرکردم‌و بە پەڕۆیەك سەری بەستم‌و عەمامەیەکیشی کرد بە سەرمداو پاشان وتی: ئا ئێستا بڕۆ زانست‌و زانیاری بچنەرەوە.[٣]

* پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: نابێت عەمامە لابرێت‌و من لە سەردەمێکەوە عەمامەم لەسەر کردووە کە دەم‌و چاوم مووی لێ نەهاتووە.

* هەروەها دەفەرموێت: عبدالعزیزی کوڕی ابن المطلب بۆی باس کردم کە جارێکیان بەبێ عەمامە خۆی کردبوو بە مزگەوتداو دەڵێ: باوکم زۆر زۆر قسەو جنێوی

---

١ رواه البخاري (٢١٢٢) (٥٨٨٤) ومسلم (٢٤٤٢).

٢ رواه ابن سعد في الطبقات لا(٢٠٥).

٣ رواه الرامهرمزي في (المحدث الفاضل) (٨٠).

پێ وتم، تەنانەت عبدالعزیز پێی وتم: کە پێم ناخۆشە جنێوەکانت بۆ باس بکەم کەچی پێی وتمو وتی: ئایا بەسەری رووتی خۆت دەکەیت بە مزگەوتدا؟.[1]

سێیەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك جار کچی بچوکی ڕازاندۆتەوە بە ئاڵتون:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك خشڵی لەلایەن پاشای حەبەشەوە پێ گەیشت کە ئەنگوستیلەی ئاڵتونی تێدابوو نقێمدار بوو (نقیم واتە موسیلەکە مورووی تێدایە)، عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دارێك گرتی یان بە هەردوو پەنجەو پاشان ئومامەی کچی ابی العاص کە کچی زەینەبی کچی بوو فەرمووی: ((تحلي بهذا يابنيّة)) واتە: ها کچی خۆم ئەمە بۆ تۆ خۆتی پێ جوان بکە).[2]

* یەزیدی نەحەوی دەڵێ: فەرقەدی سەبەخی چوو بۆ ماڵی حەسەن، لەوێ کچێکی حەسەنی بینی ئاڵتوونی پێوەبوو، وتی بە حەسەن: ئەی باوکی حەسەن تۆش کچت بە ئاڵتونو زێڕ دەڕازێنیتەوە؟ حەسەن زۆر توڕەبوو تەنانەت فەرمووی: ئەی فەرقەد بچکۆل-فُریقد- بۆ تۆ دەتەوێت کچەکەم وەك ئاردبێژو نانکەر نیشان بدەم.[3]

مەسەلەیەك:

هیچی تێدانیەو ئاساییە کونکردنی گوێی کچ (گوێ سمین) لەبەر جوانی:

* أحمدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: بۆ کوڕ بە باشی نازانم (مەکروهە) بەڵام بۆ کچ ئاساییە)و مەهنا دەڵێ: پێم وت لای کێ مەکروه بووە؟ فەرمووی: لەلای جریری کوڕی عثمان.[4]

---

١ الجامع لاخلاق الراوي واداب السامع-خطيب (٩٠٠).

٢ رواه أحمد (١١٩/٦) وأبوداود (٤٢٣٥) وابن ماجة (٣٦٤٤) واسناده حسن.

٣ رواه ابن ابي الدنيا (الاشراف في منازل الاشراف) (٤٧١).

٤ الاداب الشرعية (٣٤١/٣).

* ابن قیم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لە (صحیحین)دا هاتووە كە كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانی ئافرەتانی صحابەی دەدا بۆ بەخشینو خێركردن ئافرەتی وا هەبوو گوارەكانی خۆی دادەكەندو دەیبەخشیە پێغەمبەری خوا (ﷺ).[1]

بەسە بەوەی كە شتێكی دروستە كە خواو پێغەمبەرەكەی دەیان بینی ئافرەتان گوێیان دەسمیو هیچیان لەبارەیەوە نەفەرمووە واتە رازی بوون بەو كارەیانو ئەگەر حەرام بووایە بەرگریان لێ دەكرد لە قورئانو فەرموودەدا.

چوارەم: هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) (سخّاب)یان دەكردە ملی منداڵەكانیان چ كوڕ بوونایە یان كچ كە بریتیە لە ملوانەكەیەك لە مێخەكو هەر بەرهەمێكی تر بهۆنرێتەوە وەك قەزوان، تەنانەت ئیمام بوخاری لە (صحیح)ەكەیدا باسێكی ناوناوە (ملوانەكەی سەخاب بۆ منداڵان)و فەرموودەكەی ئەبوهریرەشی بە بەڵگە هێناوەتەوە.

ئیمام ئەحمەد لە (مسند)دا بەئاشكراتر هێناوەیەتیو دەڵێ: ئەبوهریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: دایكم نەیهێشت لە ماڵ بێمە دەرەوە بۆ ئەوەی ملوانەكەی سخابم بكاتە مل.[2]

پێنجەم: دروست نیە ئاڵتون بكرێتە بە منداڵی كوڕدا:

* یەحیا دەڵێ: لە ئیمام مالیكم بیست دەیفەرموو: پێم ناخۆشەو بە مەكروهی دادەنێم كە ئاڵتون بكرێت بە منداڵی كوڕدا، چونكە پێمان گەیشتووە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیهێشتووە پیاو ئەڵقەی ئاڵتون لە دەست بكاتو منیش بۆ گەورەو بچوك بە مەكروهی دەزانم.

---

١ تحفة المودود لا (٣٤٩-٣٥٠).

٢ المسند (٢/٣٣١).

* (ابن عبدالبر)یش دەڵێ: لەدەستکردنی ئەڵقە بۆ پیاو وانازانم یەك کەس لە پێشەوایانی فەتوا ڕێگەیان پێدابێت‌و هەموویشیان لەلایان مەکروهە بۆ منداڵی کوڕ چونکە باوکان بە منداڵەکانیاندا خواناسیان دەردەکەوێت.[1]

شەشەم: سوننەت وایە ئەگەر منداڵێك جل‌وبەرگی تازەی لەبەرکرد سێ جار پێی بگوترێت: (أبلي واخلقي)و ئەمەش بە (صحیح)ی هاتووە لەلای ئیمام بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێت).

حەوتەم: ماناو مەبەست چیە لە وشەی (أبلي واخلقي):

ئەم وشەیە لەلای عەرەب دووعای چاکەیە بۆ تەمەن درێژی منداڵەکە بەکاردێت، واتە ئەوەندە تەمەن درێژ ببێت تا ئەو جلانە کۆن بکات‌و بیاندڕێنێت،

* خەلیل لە (کتاب العین)دا دەڵێ: واتە: بژیت تا ئەم جلانەت کۆن دەکەیت‌و دەیانڕزێنیت.

بەڵام لە ڕیوایەتی (أبو داود)دا بە سەنەدی صحیح لە (ئەبی نضرة)وە هاتووەو دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر یەکێکیان دەستێك جلی تازەی بکردایە پێیان دەوت: (تبلی ویخلف الله) واتە: لەناوبچێت‌و خوا خۆت بهێڵێت.

لە ڕیوایەتی ئەبو وەلیدا هاتووە دەیانوت: (ابلی وخلقي)[2] یان دەیان ووت (ابلي وخلقي): واتە بیدڕێنیت‌و خۆت بمێنی.

هەشتەم: فەرموودەکەش ئەوە دەگەیەنێت کە هانی منداڵ بدرێت‌و دڵی خۆش بکرێت ئەگەر جل‌و بەرگێکی تازەی لەبەرکردو پێیان بوترێت: وەك چۆن پێغەمبەر

---

١ ابن عبدالبر (الاستذکار) (٨/٣٠٣).

٢ الفتح لابن حجر (١٠/٢٨٠).

(ﷺ) بە دایكی خالیدی فەرموو كە تەمەنی بچوك بوو: ((یا ام خالد هذا سناه)) بە زمانی حەبەشیەكان واتە: جۆرێكی ئەسڵە، جۆرێكی باشە.

(ئەمەش بە پێچەوانەی هەندێك لە موسڵمانانەوە كە دەبینین كەسێك جلوبەرگی نوێی لەبەردایە تالیقی لێ دەدەنو دەڵێن ئەمە ڕەنگ نەمابوو ئەمە نەبێت؟! وادیارە هەرزانەكەیت كڕیوە؟! زۆر ناشیرینە؟! نا ئەسڵە؟ من بیكەم لەمەی تۆ ناكەم!!) ئەم وتانە حەرامنو بۆنی حەسوودیان لێ دێت)*

شتێك كە زۆر پێویستە دایكو باوكو سەرپەرشتیارانی منداڵان بیزانن دەربارەی جلو بەرگی منداڵەكانیان ئەمە هەندێكە لەوانە:

١- دەبێت جلوبەرگی بێ باوەڕانیان لەبەر نەكەنو چاو لە جلوبەرگی منداڵی ئەوان نەكەن تا منداڵەكە لەسەر ئەو شێویە گەورە نەبێت:

* عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاص دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستێ جلی لەبەری مندا بینی نەخشو نیگاری تێدابوو (معصفرین)و فەرمووی: (ان هذه من ثیاب الكفار، فلا تلبسها)[1] واتە: ئەمە لە جلو بەرگی كافرو بێ باوەڕانە لەبەری مەكە.

٢- دەبێت جلو بەرگی كورت (وەك تەنورە) نەكاتە بەری كچە بچوكەكانی تا لەسەر ئەو شێوازە ڕانەیەتو ئاسایی نەبێت لەلای كاتێك گەورە ئەبن.

لەو بەڵاو نەهامەتیانەی ئەم سەردەمە كە تووشی زۆری لە خەڵكی بووەو لە سروشتی پاكیان دەرچونو سەرسام بوون بە جلوبەرگی كافرانو چاولێكردنیانو جلوبەرگی جولەكەو گاوریان پێ باشە كە هێمای بەدڕەوشتیو داڕنینی پێوە دیارە.

بەجۆرێك كە پێچەوانە بۆتەوە! كوڕەكانیان جوان داپۆشیوە بە جلوبەرگو تەنها دەستو دەمو چاویان دیارە!! كەچی لە هەمان كاتدا جلوبەرگی كورتو تەسك

---

* وتەی وەرگێڕ.

١ رواه مسلم (٥٤٨٥).

دەکەنە بەری کچەکانیان کە هەموو لەشیان لە خەڵکیەوە دیارەو بەر لەعنەتی پێغەمبەری خوایان دەخەن (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((کاسیات عاریات)) واتە پۆشتەیشنو ڕووتیشن!.

٣- نابێت جلوبەرگێك بکاتەبەری کوڕەکەی کە لەبەری تاوانبارانو لەخوا یاخیاندا بینراوەو بەهی ئەوان مەشهور بووە:

* (الاجری) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەسەر (إمام) واتە کاربەدەستان پێویستە قەدەغەی بکەن کوڕانی موسڵمان جلوبەرگی فاسقو تاوانباران لەبەربکەنو نەشهێڵن هاوڕێیەتی ئەو کەسانە بکەن کە ناسراون بە بەدڕەوشتو نێرباز، هەروەها باوکانیش نابێت بهێڵن منداڵەکانیان بەرگی فاسقیان لەبەربکەنو هاوڕێیەتیشیان بکەن.[١]

٤- نابێت جلی درێژو دەرەدامان بکەیتە بەری کوڕەکانو پێغەمبەر (ﷺ) لەم کارە بەرگری کردووە:

* عبداللەی کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) جارێك بینی کوڕەکەی جلەکانی شۆڕەو بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشێت فەرمووی: دامێنەکەت بەرز بکەرەوە چونکە لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من جرّ ثوبه من الخيلاء لم ينظر الله اليه))[٢] واتە: هەر کەسێك جلوبەرگی لە زەوی بخشێت لە خۆبەزلزانیەوە ئەو کارە بکات ئەوە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی ناڕوانێت.

* ابوهريره (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ما أسفل من الكعبين من الازار ففي النار))[٣]

---

١ النظر في أحكام أهل النظر- إبن قطان (١٢٩).

٢ رواه أحمد (٢/٣٣).

٣ رواه البخاري (٥٧٨٧).

واتە: جلوبەرگی خواری ڕەقەڵەی قاچ خاوەنەکەی دەباتە ناو ئاگرەوە. لەسەر سەرپەرشتیاری منداڵە هەوڵ بدات منداڵەکانی لە ئاگری دۆزەخ بەدوور بگرێتو لەسەر ڕەوشتی پێغەمبەرو سوننەت ڕایان بهێنێ لەسەر ئەو شتانەی کە پێچەوانەی شەرعی خوا نین.

٥- دەبێت کوڕەکانی بەدوور بگرێت لە لەبەرکردنی ئاوریشم چونکە لەسەر نێرینە حەرامە گەورە بێت یان بچوك:

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لەبەری کوڕەکانماندا داماندەکەندو لەبەری کچەکانماندا دەمان هێشتەوە واتە: ئاوریشم)[1]

* ابن قیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: نایەڵێ کوڕەکەی ئاوریشم لەبەر بکات چونکە ڕەوشتی تێك دەداتو سروشتی کچانەو ناسکۆڵەیی وەردەگرێت، هەروەك چۆن دەبێت لە نێربازیو عەرەق خواردنەوەو دزیو درۆزنی دووری بخاتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت: ((یحرم الذهب والحریر علی ذکور أمتي وأحلّ لاناثهم)) واتە: ئاڵتونو ئاوریشم لەسەر نێرینەکانی ئومەتم حەرامنو بۆ مێینەکان حەڵاڵن.

خۆ ئەگەر منداڵ ئەو شتانەی لێ قەدەغە نەکرابێت خۆ لەسەر سەرپەرشتیارەکەی پێویست کراوە کە نەهێڵێ بیانکاتو بواری نەدات حەرامەکان ئەنجام بدات، چونکە لەسەریان ڕادێت، زۆر ئەستەمە وازپێهێنانی، ئەمەش ڕاسترین وتەی زانایانە.

ئەوانەی کە دەڵێن دروستە ئاڵتونو ئاوریشم بۆ کوڕانی منداڵ، بەڵگەیان ئەوەیە کە تەکلیفی لەسەر نیەو هیچی لەسەر حەرام نیە، قیاس لەسەر وڵاخ دەکەن کە گوایە هیچ حەرام نیە بۆی، ئەمەش قیاسێکی زۆر ناشیاوەو خراپە چونکە بەڵێ منداڵ هیچی لەسەر نیە بەڵام خۆ گەورەبوو لەسەری دەبێت، بۆیە نابێت منداڵ بەبێ دەستنوێژ

---

١ رواه أبوداود (٤٠٥٩) اسناده صحیح.

نوێژ بکات یان بەڕووتی یان بە پیسی، نابێت ئارەق بخواتەوەو قومار بکاتو کاری ناشایستەی جنسی بکات (لواطة).[١]

٦- نابێت بە هیچ جۆرێك باوكو دایكان جلو بەرگی کچانەی لەبەر بکاتو بیرازێنێتەوە:

* ابن تیمیه (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ڕازاندنەوەی کوڕ بەشێوەی کچ دروست نیە، چونکە نابێت خەڵك حەزی لێ بکات (ئەوە تایبەتە بە ئافرەتانەوە) بەڵکو دەبێت لە هەموو شتێك دووری بخاتەوە کە ژنانی دەربچێتو لەوان بکاتو ئەوە وای لێ دەکات کە گەورەش بوو هەر ناسکۆڵەو ژنانی دەبێت، لەوانەشە چەندان فیتنەو خراپەی تری لێ بکەوێتەوە.[٢]

٧- نابێت بهێڵرێت جلوبەرگێك لەبەر بکات لە وێنەی گیانلەبەری لەسەر نەخش کرابێتو ئەمەش نەخۆشیەکەو بازاڕەکان دووچاری بوونو تەنانەت زۆر دەگمەنە بتوانێت دەستێ جل بۆ کوڕەکەت دەست بخەیت کە وێنەی گیانلەبەرانی تێدا نەبێتو ئەوەش غەریبی ئیسلام دەگەیەنێت پەنامان بەخوا:

* أبوطلحة (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لاتدخل الملائكة بيتاً فيه كلب ولا صورة))[٣] واتە: فریشتەکان ڕوو ناکەنە ماڵێك سەگی تێدابێت یان وێنەی تێدا هەڵواسرابێت.

٨- هەروەها نابێت جۆرە جلو بەرگێکیان لەبەربکرێت کە هەندێك وشەو دەستەواژەی بێگانەی پێوەنوسرابێت چونکە زۆربەیان وشەکانیان بێ باوەڕی یان ناڕەوشتیە.

---

١ تحفة المودود لا (٣٠٤).

٢ شرح العمدة من كتاب الصلاة، لا(٢٩٣).

٣ رواه البخاري (٣٢٢٣).

٩- هەروەها نابێت ئەو جلو بەرگانەی لەبەربكات كە هێماو دروشمی بێ باوەڕانی پێوەیە وەك خاچ یان ئەستێرەی شەش پاڵو یان ئاڵای یەكێ لە وڵاتانی بێ باوەڕو لەم وێنانە.

* ئەمە هەندێك بوون لە جلو بەرگە قەدەغەكراوەكان لەسەر منداڵانو مەبەست لێی: ئەوەیە كە دایكو باوكان بە ئارەزووی خۆیان هەموو جلێكیان بۆ نەكەن بەوەی بڵێن گوایە منداڵنو هیچیان لەسەر نیە، لەسەر سەرپەرشتیارەكەیانە كە لە خوا بترسێت چونكە بەرپرسیارە بەرامبەریان:

* سفیان الثوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: فەرمان دەدرێت بە فڕێدانی كەسێك بۆ ناو ئاگری دۆزەخو پێی دەڵێن: ئەمە ماڵو منداڵەكەی هەموو چاكەكانیان خواردووە.[1]

نۆیەم: لە فەرموودەكەشدا ئەوە هاتووە كە گەورە دەتوانێت شۆخیو سوعبەت لەگەڵ منداڵی كچی تەمیزدار بكات:

وەك چۆن لە هەندێك ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە لەسەر ئەم فەرمودەیە لا (٥٩٩٣):

* كچە صحابیەكە دەڵێ: منداڵ بووم لەگەڵ باوكمدا ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و من لەوێ بە ئەڵقەكەی دەستی پێغەمبەر (ﷺ) یاریم دەكردو باوكم لێم توڕەبوو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((دعها)) وازی لێ بێنەو پاشان فەرمووی: ((أبلي واخلقي...)) واتە سێ جار فەرمووی: ئەم جلانە بدڕێنیو خۆت بمێنی.

دەیەم: لە فەرموودەكەشدا ئەوە هاتووە كە دروستە نازناو بنرێت لە كچی بچكۆڵە، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو كچە بچكۆلەیەی فەرموو: ((یا ام خالد)) ئەی دایكی خالد، كە ناوی خۆی (أمة)ی كچی خالد بوو.[2]

---

١ رواه أبونعيم في (الحلية) (٨١/٧).

٢ الاستيعاب (١٧٩٠/٤).

یازدەیەم: مەبەست لە (خميصة سوداء صغيرة):

* خەلیلی كوڕی ئەحمەد دەڵێ: جلوبەرگێكی ڕەشی خەت خەتەو لە خوری دروستكراوە.[١]

دوازدەیەم: بە هەڵگرتن هێنایان (فأتي به تحمل): بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە كچەكە زۆر بچوك بوەو دوورنیە لەگەڵ منداڵیەكەیدا وریاو بەفام بووە لە شت تێگەیشتووە، لە ڕیوایەتی بوخاریدا (٣٨٧٤)دا هاتووە كە ئەو منداڵە كچ بووەو دەڵێ: لە حەبەشە گەڕامەوە من كچێكی بچوك بوومو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پۆشاكێكی ڕەشی خەت خەتاوی پێدامو دەستی دەهێنا بە خەتەكانیداو دەیفەرموو: ((سناه، سناه)) جۆرێكی باشە جۆرێكی باشە.

سێزدەیەم: ((فأخذ الخميصة بيده فالبسها)) واتە: بە دەستی خۆی كردیە بەریو ئەمەش بەڵگەی بەڕەحمی پێغەمبەرە هەروەك بەڵگەی بێ فیزیو تەوازعیەتی.

چواردەیەم: لەوەدا كە بە دەستی خۆی جلەكەی كردە بەری (أم خالد) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە كەسێك دیاری دەدات بە كەسێك ئەگەر كەسەكە منداڵ بوو خۆی بیكاتە بەریو بێگومان بەسەر جلەكانی ژێرەوەیدا.

پازدەیەم: فەرموودەكە ئەوە دەگەینێت كە سوننەتە بە زمانێك لەگەڵ منداڵدا قسە بكرێت كە لێی تێبگات ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەزانێت ئەو منداڵە لە حەبەشە ژیاوەو زمانی ئەوان شارەزا بووە بە زمانی حەبەشیەكان فەرمووی: (سناه، سناه)، بوخاریش باسێكی ناوناوە (باسی ئەو كەسەی بە فارسی قسە دەكات)–(٣٠٧١).

---

١ كتاب العين لا(٢٦٨).

شازدەیەم: بە فەرموودەکە دەرەکەوێت کە دروستە موسڵمان هەندێك دەستەواژەی زمانەکانی تر بەکار بهێنێت ئەگەر کارنەکاتە سەر زمانە سەرەکیەکەی خۆیو وشەی بێگانە تێکەڵ نەکات، وەك بەکارهێنانی وشەی (ڤێری گود:very good) براڤۆ، مەرسی، ...هتد).[1]

*   *   *

[1] ئەم خاڵەی (١٦) وتەی وەرگێڕە.

## فەرموودەی سی‌و حەوتەم

## یاری كردن شۆخی كردن لەگەڵ منداڵدا

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: كان رسول الله (ﷺ) يَدخُلُ علَينَا ولِي أخ صَغِير يُكنَى (أبا عُمَير) قال: أحسبه فطيماً، وكَان لَهُ نُغَرٌ يَلْعبُ بِهِ فمَاتَ، فَدخَلَ علَيْهِ النَّبِي (ﷺ) ذاتَ يَوْمٍ فَرَآهُ حَزِينًا، فقَالَ ((مَا شَأْنُهُ))؟ قَالُوا ماتَ نُغَرُهُ فقَالَ ((يَا أبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟)).

### دەرهێنانی فەرموودەكە:

أحمد ڕیوایەتی كردووە (٣/١١٤-١١٥)و البخاری (٦٢٠٣)و (٦١٢٩)و لە (الادب المفرد) (٢٦٩) لە باسی -سوعبەت كردن لەگەڵ منداڵ، مسلم (٥٦٧٣)و أبو داود (٤٩٦٩) لە (باسی بە كەسێك بڵێی باوكی فلان‌و منداڵیشی نەبێت)و الترمذی (١٩٨٩) و ابن ماجه (٣٧٢٠) لە باسی (المزاح)دا.

### ئەو ئەحكام‌و ئادابانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەكەم: ئەم فەرموودەیە ئەسڵی دوو مەسەلەی زۆر گرنگی ژیانی منداڵانە:

١- منداڵ بۆی هەیە یاری بكات.

٢- شۆخی كردن‌و ڕووخۆشی دان بە منداڵان.

مەسەلەی یەكەم:

فەرمودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دروستە ڕێگا بدرێت بە منداڵان یاری بكەن‌و نابێت بەرگریان لێ بكرێت‌و بەڵگەیش لەسەر ئەوە زۆرە لەوانە:

١- بێ دەنگبوونیان لێیان‌و بەرگری نەكردن لە یاری كردنیان:

* عبداللەی كوڕی عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (لەگەڵ منداڵاندا یاریم دەكرد، لەو كاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) هات‌و منیش لە پاڵ دیوارەكەدا خۆم حەشاردا، لە

دواوە هات و ڕای وەشاندم و فەرمووی: ((اذهب وادع لي معاوية))[١] برۆ موعاویەم بۆ بانگ بکە.

* عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لەگەڵ دەستەیەك لە کچانی هاوڕێمدا یاریم دەکردو لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی کرد بە ژووردا و هەموو ڕەفیقەکانم خۆیان داپۆشت (خۆیان حەشاردا)و کە ئەو ڕۆیشت دەستیان کردەوە بە یاری لەگەڵمدا.[٢]

٢- پێغەمبەر (ﷺ) دەیدا بە لای منداڵاندا یاریان دەکردو ئەویش سڵاوی لێ دەکردن و بە کارەکەیان ڕازی بوو:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دای بەلامداو لەناو منداڵاندا یاریم دەکرد سەلامی لێ کردین و پاشان منی بانگ کردو ناردمی بۆ کارێك.[٣]

٣- پێغەمبەر (ﷺ) سەیری منداڵانی دەکرد کاتێك خەریکی یاریکردن بوون:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەهات بۆ لام کاتێك من یاریم دەکرد بە یاریەکانم و لەلامدا دادەنیشت و ماوەیەکی زۆر سەیری دەکردم و پاشان هەڵدەسا.[٤]

٤- پێغەمبەر (ﷺ) بواری ڕەخساندوە بۆ منداڵ بۆ سەیرکردنی یاری:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: دەمبینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کەواکەی بەری دای دەپۆشتم، منیش سەیری حەبەشیەکانم دەکرد لە مزگەوتدا یاریان دەکرد تا وام لێ دەهات بێ تاقەت دەبووم لە سەیرکردن، ئاگاتان لە کچانی بچوك بێت حەز لە سەیری یاری دەکەن)[٥] واتە: بواری سەیرکردنی پێ بدەن.

---

١ رواه مسلم (٦٧٢٠).

٢ رواه البخاري (٦١٣٠) ومسلم (٦٢٧٨).

٣ رواه أحمد (٣/٢٥٣) إسناده حسن.

٤ رواه أبو يعلى في مسنده (٤٩٠٨).

٥ رواه البخاري (٥٢٣٦).

دووەم:

یاریکردن‌و خۆشی نواندن‌و ڕابواردن کارێکی زۆر گرنگی منداڵانە، بۆیە دەبینی سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە گرنگی تەواویان پێداوە:

* حسن البصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) جارێکیان خۆی‌و عبداللەی کوڕی چوونەوە بۆ ماڵ، سەیر دەکەن منداڵان بە سەربانی ماڵەکەوە یاری دەکەن‌و عبداللە لێیان توڕەبوو، بەڵام شێخ حەسەن فەرمووی: وازیان لێ بهێنە یاری کردن بەهاری ئەوانە.[1]

* هیشامی کوڕی یەحیای غەسسانی باسی باوکی دەکات‌و دەڵێ باوکم دەیووت: خەفەت مەدەن بە منداڵەکانم‌و نیگەرانیان مەکەن چونکە خۆشی‌و سرور گەشە بە منداڵان دەدات.[2]

* ئیبراهیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: سەلەفی صالح هەموو یاریەکیان بە ڕەوا دەزانی بۆ مناڵەکانیان تەنیا یاری کردن بە سەگ نەبێت.[3]

سێیەم: فەرموون لەگەڵ هەندێك لەو یاریانەی کە سەلەفی صالح ڕێگایان بە منداڵەکانیان داوە ئەنجامی بدەن، کە ئەگەر بە وردی سەیریان بکەن هەموو سودی بۆ خودی منداڵەکە هەیە بۆ لەشیان یان بۆ عەقل‌و بیریان یان جوانکردنی ڕەوشتیان‌و چەندان سودی تر لەوانە:

١- تیر ئەندازی (الرمایە):

* موسعەبی کوڕی سەعد لە سەعدەوە دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: کوڕەکانم تیرئەندازی فێربن چونکە ئەوە باشترینی یاریەکانتانە.[4]

---

١ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٥٩٠).

٢ رواه ابن ابي الدنيا في العيال (٥٩٤).

٣ رواه البخاري في الادب المفرد (٢٩٧).

٤ رواه ابن ابي شيبه في (الادب) لا (٨٠).

* ثمامەی كوڕی عبداللەی كوڕی ئەنەس دەڵێ: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) جێگایان بۆ ڕادەخستو لەسەری دادەنیشتو منداڵەكانیشی بەسەریدا نیشانە شكێنیان دەكرد (واتە تووڕە نەدەبوو) جارێكیان هاتە لامان دەبینێ تیرئەندازی دەكەین فەرمووی:

(كوڕەكانم ئەمە كەی نیشانە شكێنیە ئێوە دەیكەن بیدەن بە منو هەرچەندی پێوەنا هەمووی پێكای).[١]

* عمری كوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نامەی نووسی بۆ مامۆستای كوڕەكەیو پێی وت: با سەرەتا هەریەكەیان قورئانەكەت بۆ بخوێننو جوان فێریان بكە، ئەگەر لێ بوویەوە با تیرو كەوانەكەی هەڵبگرێتو نیشانەی بۆ بنێرەوەو حەوت تیری پێوە بنێو پاشان با بڕوات سەرخەوی –قەیلولە– بشكێنێت...)[٢]

٢– زۆرانبازی (مصارعە):

* أبوهریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: حەسەنو حسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) پێكەوە زۆرانبازیان دەگرتو پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دەیفەرموو ((هی حسن، هی حسن)) واتە: حەسەن دەیباتەوە، حەسەن دەیباتەوە، فاطمة (خوا لێی ڕازی بێت) پێی وت: بۆچی وا دەڵێی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ان جبریل یقول: هی حسین)) واه: جبریل دەیووت: حسین یەكەم دەبێت).[٣]

٣– پێشبڕكێ (مسابقە):

* عبداللەی كوڕی حەرس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عبداللهو عبیداللهو كوڕەكانی تری عەباسی كۆكردەوەو ڕیزی دەكردن– دەستی دەكردەوەو باوەشی بڵاودەكردەوەو دەیفەرموو پێیان: ((من سبق الي فله كذا وكذا)) واتە هەر كەسێك زوو بگاتە لای من دیاریەكی پێ دەدەم، دەڵێ (فتسبقون) واتە

١ رواه الطبراني في (المعجم الكبير) (٦٧٩) واسناده صحيح.

٢ ابن ابي الدنيا في الدر المنثور (٦/٥٠٦).

٣ ابن ابي الدنيا في العيال (٥٩٥) في اسناده ضعف.

ئەوانیش هەموویان ڕایان دەکرد بەرەو ڕووی‌و دەکەوتن بەسەر پشت‌و سنگیداو ئەویش (ﷺ) باوەشی پێدا دەکردن‌و ماچی دەکردن).[١]

٤- مەلەوانی (السباحه):

* ابی امامەی کوڕی سەهل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) نامەی نووسی بۆ (أبی عبیده)ی کوڕی (الجراح)و پێی فەرموو: منداڵەکانتان فێری مەلە بکەن‌و فێری تیرئەندازیان بکەن).[٢]

٥- ئەسپ سواری (الفروسیه):

* مەکحول (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: عمری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) نامەی نارد بۆ خەڵکی شام‌و تیایدا پێی وتن: منداڵەکانتان فێری مەلەکردن‌و تیرئەندازی‌و ئەسپ سواری بکەن).[٣]

٦- یاری کردنی کچان بە بووك:

* عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی تەبوك گەڕایەوە یان خەیبەر بوو پەردەیەك دادرابوویەوەو هەوا پەردەکەی بەرزکردەوە هەندێك بووکی عائشە دەرکەوتن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ما هذا یا عائشة؟)) ئەمە چیە ئەی عائیشە؟ عائیشەیش فەرمووی: ئەمانە کچمن، لەنێوانیاندا ئەسپێکی بینی دوو باڵی هەبوو فەرمووی: ((ما هذا الذي اری وسطهن؟)) واتە: ئەی ئا ئەمە چیە لەنێوانیاندا دەیبینم؟ وتی: ئەسپە، فەرمووی: ((ما هذا الذي علیه؟)) ئەی ئەمە چیە بەسەر پشتیەوە؟ وتی: باڵەکانیەتی، فەرمووی: ئەسپ باڵی هەیە؟ عائیشەیش وتی: ئەی نەتبیستووە کە سولەیمان ئەسپی هەبووە باڵدار بوون؟ دەڵێ: پێغەمبەر ئەوەندە پێکەنی بەو قسەیە کە ددانەکانی دواوەی دەرکەوتن.[٤]

---

١ رواه أحمد (١/٢٦٤) والطبراني في المعجم الكبير (١٨/١٨٨)

٢ رواه أحمد (١/٤٦) وإسناده صحيح.

٣ رواه القراب في فضائل الرمي (١٥) ئەسپ سواری ئەمڕۆ لە ئۆتۆمبێل لێخوڕیندا خۆی دەبینێتەوە- وەرگێڕ.

٤ رواه النسائي في السنن الكبرى (٥/٣٠٦-٣٠٧)، و أبوداود (٤٩٣٢) واسناده صحيح.

٧- یاری كردن بە باڵندە:

* فەرموودەی سەرەتای ئەم باسە بەڵگەیە لەسەری بە مەرجێك ئازاری نەداتو خزمەتی بكات.

* هیشامی كوڕی عوروە دەڵێ: عبداللەی كوڕی زوبێر لە مەككە بوو لەو كاتەدا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) باڵندەیان هەبوو لەناو قەفەزدا بوو ڕایانگرتبوو.[1]

٨- بەرزكردنەوەی قورسایی -زەختكردنی شت- (رفع الاثقال):

* طاووس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: عبداللەی كوڕی عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دای بەلای كۆمەڵێك كەسدا بەردی گەورەیان زەخت دەكرد (ئەو چاوەكانی لەدەست دابوو) فەرمووی: ئەوە خەریكی چین؟ وتیان بەرد هەڵدەگرن تا بزانن كامیان بەهێزترە، ئەویش فەرمووی: (عمّال الله أقوى من هؤلاء)واتە: تێكۆشەرانی ڕێگەی خوا لەوان ئازاترن).[2]

چوارەم: لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی باوكو دایكانی موسڵمان (بە داخەوە) ڕۆڵەكانیان پیشتگوێ خستووەو بەجۆرەها یاری، یاری دەكەن بە ئارەزووی خۆیانو بەبێ ڕەچاوكردنو گوێدان بە شەرعی خواو پێغەمبەر (ﷺ)و حەرامو حەلاڵیەكەی، بە بیانووی ئەوەی كە جارێ منداڵنو هیچیان لەسەر نیە !.

بەڵێ وایە هیچیان لەسەر نیە، بەڵام باوكو دایكیان بەرپرسن لێیانو لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكرێت لەسەر ئەوەی ڕازی بوون منداڵەكانیان كەوتوونەتە چەندان حەرامو ناشەرعیەوە:

* ئەوە پەروەردگارە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[3].

---

١ رواه البخاري في الادب المفرد (٣٨٣) لە باسی باڵندەی ناو قەفەس.

٢رواه عبدالرزاق (٢٠٩٦٠).

٣ سورة التحريم (٦).

واتە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران خۆتانو خانەوادەتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤو بەردەو فریشتەگەلێك سەرپەرشتی دەکات کە زۆر دڵڕەقنو زۆر بەهێزنو سەرپێچی خوا ناکەنو چیان پێ بگوترێت بەگوێی دەکەن.

* عبداللەی کوڕی عمر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) دەیفەرموو: ((کلکم راعٍ وکلکم مسؤل عن رعیته، الامام راعٍ ومسؤل عن رعیته، والرجل راعٍ في أهله وهو مسؤل،...))[1] واتە: هەمووتان شوانن و هەموویشتان بەرپرسیارن لە ژێردەستەکانتان، ئیمام بەرپرسە لە میللەتەکەیو پیاویش شوانەو بەرپرسە لە ماڵو منداڵەکەیو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەسەریان...

بۆیە زۆری لە سەلەفی صالح نەیانهێشتووە منداڵەکانیان بە ئارەزووی خۆیان هەرچی یاریە حەزیان لێ بووبێت بیکەن لەوانە:

١- نەیانهێشتووە منداڵەکانیان یاری بە بوکڵەیەك بکەن کە وێنەو پەیکەری تێدابێت:

* أبوطلحة (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاتدخل الملائکة بیتاً فیه کلب أو تصاوین))[2]

واتە: فریشتەکان ڕوو ناکەنە ماڵێك سەگ یان وێنەی پەیکەری تێدابێت.

* ئیمام مالیکیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لەلام مەکروهە پیاو پەیکەر بۆ کچەکەی بکڕێت)[3]

* پرسیار کرا لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی فەرموودەکەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) کە دەیووت (من بە بوکڵە یاریم دەکرد) فەرمووی: (ئاساییە یاریکردنی کچان بە بوکڵە بە مەرجێك (صورة)ی تێدا نەبێت، ئەگەر وێنەی تێدابوو نابێت)[4].

---

١ رواه البخاري (٨٩٣).

٢ رواه البخاري (٣٣٢٢).

٣ الجامع لابن ابي يزيد لا (٢٣٤).

٤ الاداب الشرعية (٣/٥٠٩).

٢-یاریکردن بە جۆرێك قوماری تێدابێت:

* محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کۆمەڵێك منداڵی بینی لە ڕۆژی جەژندا یاریان دەکرد لەسەر شت (واتا قوماریان دەکرد)، فەرمووی: قومار مەکەن چونکە بردنەوەی تێدابێت لە یەکتری قومارە)[1]

٣-یاریکردن بە سەگ:

* ئیبراهیمی النخعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (هاوڕێیانی مەزهەبمان ڕێگایان داوە بە منداڵ یاری بکەن جگە لە یاریکردن بە سەگ)[2]

٤-یاریکردن بە چواردەخانە:

ئەم یاریە تەختەیەك دەهێنن‌و سێ خەتی تێدا هەڵدەکۆڵن‌و منداڵان بە بەرد یاری تێدا دەکەن (پێشی دەڵێن) شەهاردە.

* صفیە دەگێڕێتەوە کە عبداللەی کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) جارێك چووە ماڵەوە دەبینێت هەندێك لە منداڵەکانی بە شەهاردە یاری دەکەن دای بەسەری خۆیداو شکاندی)[3]

* سەلەمەی کوڕێ ئەکوەع (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە بەرگری کردووە لە منداڵ کاتێك کە ئەم یاری (چوارده خانە) بکەن، پێیان وت: بەرگری لێ دەکردن؟ فەرمووی: بەڵێ چونکە لەو یاریەدا منداڵان سوێند دەخۆن‌و درۆیش دەکەن.[4]

٥-یاریکردن بە تاوڵە (النرد):

نەرد ئەوەیە زارێك لە تەختە یان لە ئێسك دروست دەکرێت‌و لە شەش لاکەیەوە ژمارە دەنووسرێت‌و لەناو تاوڵەیەکی تەختەدا یاری پێ دەکرێت. لە فەرموودەدا هاتووە کە بەرگری کراوە لە کردنی:

---

١ رواه إبن أبی شیبه (٦٢٢١) لە یاری کردن بە گوێز یان خورمادا.

٢ پێشتر ڕیوایەتەکەی دراوە

٣ رواه ابن ابي شيبه (٦٢١٣) و البيهقي في الكبرى (٢١٧/١٠).

٤ رواه ابن ابي شيبه (٦٢١٢) و البيهقي في الكبرى (٢١٧/١٠).

* بورەیدە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((من لعب بالنردشير فكأنما صبغ يده في لحم خنزير ودمه))[١].

واتە: هەر کەسێك بە نەردەشێر یاری بکات وەك ئەوە وایە دەستی خستبێتە ناو گۆشتو خوێنی بەرازەوە.

* أبوموسى الاشعرى (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((من لعب بالنردشير فقد عصى الله ورسوله))[٢] واتە: ئەو کەسەی یاری نەردەشێر بکات سەرپێچی خواو پێغەمبەری کردووە.

* نافع (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: عبداللەی کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) هەر کاتێك کەسێکی خۆی بدیایە یاری بە نەردەشێر (تاوڵە) یان چواردەخانە دەکات لێی دەدانو یاریەکەشی دەشکاندن.[٣]

٦-شەترەنج:

* نافع لە عبداللەی کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لێکرا دەربارەی شەترەنج؟ فەرمووی: لە تاوڵە خراپترە.[٤]

* پێشەوا مالك (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: شەترەنج بەشێکە لە تاوڵە.

* هەروەها پرسیارکرا لە ابن مسیبو الزهری (رەحمەتی خوایان لێ بێت) دەربارەی حوکمی شەترەنج؟ فەرمووی: شتی بەتاڵو پڕوپوچەو خوایش بەتاڵو پڕوپوچی خۆش ناوێت.[٥]

هەروەها دەربارەی قەدەغەکردنی شەترەنج (یەزیدی کوڕی ابن حبیب)و (محمدی کوڕی سیرین)و (ابراهیم النخعی)و (مالك بن انس)و (أحمد بن حنبل) (رەحمەتی خوایان لێ بێت) هەمان ڕای پێشوویان هەیە.

---

١ رواه مسلم (٥٩٥٨).

٢ رواه مالك في الوطأ (٢/٩٥٨) والبخاري في الادب المفرد (١٢٦٩) إسناده حسن

٣ رواه الاجري في (تحريم النرد) (٣٥) واسناده صحيح.

٤ رواه ابن أبي الدنيا في (ذم الملاهى) (١٠٢).

٥ رواه البيهقي في (الكبرى) (١٠/٢١٢).

بەڵام زانایانی تری وەك ئیمام شافعیو أبو حنیفەو أوزاعیو كەسانی تر شەترەنج جیادەكەنەوە لە قوماروتاوڵە، ڕێگەیان پێداوەو دەڵێن نەخشەی سەربازیو بەهێزكردنی زیهنو مێشكی تێدایە.[1]

٧- كوجە:

* إبن الاعرابی: واتە منداڵان پەڕۆ دەهێننو خڕی دەكەنو وەك تۆپی لێ دەكەنو پاشان قوماری پێ دەكەن.

* عبداللەی كوڕی دینار دەڵێ: عبداللەی كوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دای بەلای كۆمەڵێك منداڵدا بە كۆجە یاریان دەكرد لە چاڵێكدا كە داری لێ بوو، نەیهێشت ئەو یاریە بكەنو ئەو شوێنەیشی پەڕژین كرد.[2]

٨- یاریكردن بە گیانداران بە سزادانو بەشەڕدانیان:

* إبن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) چوو بۆ لای یەحیای كوڕی سەعیدو لەوێ منداڵێكی بینی مریشكێكی بەستبوویەوەو لە دوورەوە كردبووی بە نیشانەو بەردی تێ دەگرت، خێرا (ابن عمر) چوو بەرەو ڕووی مریشكەكەو كردیەوەو بەرەلای كردو پاشان ڕووی كردە كەسوكاری منداڵەكەو فەرمووی: مەهێڵن منداڵەكانتان ئەم باڵندانە بەهێواشی بكوژن (واتە بەرد باران كردن) چونكە من خۆم لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) كە بەرگری كردووە لەوەی گیانلەبەر بە لەسەرخۆو ماوەی درێژ بكوژرێتو بە نیشانە بنرێتەوە.[3]

پێنجەم: هەڵوێستەیەك لەگەڵ هەندێك لە یاریەكانی ئەم سەردەمە:

**١- تۆپی پێ:**

ئەمڕۆ زۆرترین منداڵ یاری پێ دەكەنو گەورەو بچوك پێوەی خەریكنو تووش بوون، وای لێهاتووە منداڵی لەگەڵدا پیر دەبێتو بچوك لەسەر حەزو ئارەزووی گەورە

---

١وتەی وەرگێڕ.

٢ رواه البیهقي في الكبرى (١٠/٢١٧).

٣ رواه البخاري (٥٥١٤).

دەبێت، ئەم یاریە لە ئەسڵدا حەرام نیە ئەگەر ئەم خاڵانەی تێدا نەیەتەدی کە زۆربەی ئەم خاڵانە ئەمڕۆ تیایدا هاتۆتەدیو باش وایە منداڵ فێری چۆنیەتیە دروستەکەی بکرێت:

١-لە زیکرو یادی خوا مرۆڤەکان غافلو بێ ئاگا دەکات.

٢-لە نوێژکردن لە کاتەکانی خۆی دوایان دەخات.

٣-لە نوێژی بە کۆمەڵو لە مزگەوتدا دوایان دەخات.

٤-دەبێتە هۆی ئەوەی هاوڕێیەتی بەدڕەوشتو دوور لەخواو دواتر لەوانەو فێری جۆرەها جنێوو لەعنەتکردنو شتی خراپی تریش دەبێت

٥-لەم یاریەدا ڕقو کینەو دووبەرەکیو جنێوو قسەی سوك وتن بە یەکتریو بەتیپە چاکەکەی یەکتری دەدەنو هەندێك کات دەگاتە جنێوو شەڕیش لەناو موسڵماناندا پەنا بەخوا.

٦-منداڵی موسڵمان وا لێ دەکات کە چاو بکات لەو یاریزانانەی کە لە زۆر شتیاندا پێچەوانەی شەرعیشە لە قژو جلوبەرگو هەڵسو کەوتیاندا.

٧- بکرێتە هۆکاری بردنەوەو قازانج واتە قوماری پێ بکرێت وەك لە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا دەکرێت پەنا بەخوا.

٨- چاوکردنو لاسایی کردنەوی وڵاتانی کافرو بێ باوەڕە. ئەمەو چەندان زیانی تر کە باسکردنی درێژە دەکێشێت!! خوا پەنامات بدات.

**٢-فیلم کارتۆن:**

ئەم یاریە لای منداڵی ئەم ڕۆژگارە هەر بەوەندەوە نەوەستاوە کە منداڵان گێل دەکاتو دووچاری سستی بیرکردنەوەو داهێنانیان دەکات، بەڵکو لەوەش لایداوەو کاریگەری خراپی کردۆتە سەر بیروباوەڕی منداڵی موسڵمانانو ڕەوشتیان، بۆیە یەکێك لە زاناکانی ڕۆژئاوا دەڵێت: منداڵانی ئەمڕۆ تەنها بینەری ئەم جۆرە فیلمانە نین بەڵکو خۆیان تێکەڵی ڕووداوەکانی بوونو لەگەڵیدا دەژین، بەشداری تیایداو کاریگەریەکی زیندووی کردۆتە سەر مێشكو هەناویان.

* ئەم فیلمە کارتۆنیە جوڵاوانە هەڵدەستێت بە کوژانەوەی تروسکایی (فیترەتی پاك) لەناخی منداڵدا بەڵام بەشێوازێکی خۆش‌و بەلەزەت‌و سەرنج ڕاکێش‌و لەم بارەیەوە پزیشکە دەروونناسەکان دەڵێن: (ئەگەر زیندان زانکۆ بێت بۆ فێربوونی تاوان ئەوە تەلەفزیۆنیش قوتابخانەیەکی ئامادەییە بۆ لادانی منداڵ).

**لە بواری بیروباوەڕدا:** چەندان منداڵی کوڕو کچ تێڕوانین‌و هاوکێشەکانیان تێکچووە، بەهۆی ئەو دیمەنانەی کە لە ئەفلام کارتۆنەکاندا دەیانبینێت، ئەوەتا دەبینی پیاوێك بە هەوادا دەفڕێت، یان کێوەکان تەخت دەکات، یان مانگ لەت دەکات بە دەستەکانی‌و پاشان دەیان داتەوە لەیەك!؟ نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لە چاویەوە تیشك دەردەکات‌و هەموو هەواڵێکی ئاشکراو نهێنی دەزانێ!!.

ئافرەتێك بۆی گێڕامەوە کە منداڵەکەی لێی پرسیوە: دایەگیان ڕاستە خوای گەورە یەك چاوی هەیە؟ ئەویش وتبووی: کوڕی شیرینم (پەنا بەخوا) لەو قسە هەڵەیە، خوای گەورە یەك چاو نیە، منداڵەکەش وتی: بەڵێ یەك چاوی هەیە من لە فیلم کارتۆنێکدا بینیومە کە لەسەر هەورەکان‌و لەسەر کورسیەك دانیشتبوو بەو جۆرە بوو!!.

ئەمە مشتێکە لە خەروارێك، چونکە زۆری لە ئەفلام کارتۆنەکان پڕن لە کاری سیحرو جادوگەری، وەك بڵێی سیحر لێهاتووییە... نەك یەکێك بێت لە گوناهە گەورە لەناوبەرەکان (الموبقات) ئیتر با ئەوەش بووەستێت کە چەندان نیشانەی سەلیبی‌و خاچ پەرستانی تێدایە!!!.

**لەلایەنی ڕەوشتیەوە:** ئەم فیلمانە ڕۆڵێکی ترسناکیان هەیە لە جوانکردنی درۆو دەلەسەو فڕو فێڵ‌و ساختەکاری‌و گزڵدان‌و پیشاندانیان بە شێوەی ئازایەتی‌و لێهاتوویی‌و وریایی!!

کە لەگەڵیدا حەیاو شەرم لە دڵی منداڵەکەدا نامێنێت، بۆ نا؟ لە کاتێکدا پاڵەوانانی ئەم فیلمانە دەبینن بە جل‌وبەرگی کورت یان ڕووت، قسەی ناشیرین‌و پڕوپوچ دەکەن‌و فێری چەندان فێل‌و ساختەکاری دەکەن، ئارەق دەخۆنەوەو جگەرە دەکێشن بە ڕۆژی

ڕۆشندا، قسە دەربارەی ئەوەی کە منداڵانمان فێری جۆرەها جنێوو قسەی سووک دەبن لێیانەوە...[١]

سەیری کتێبی (بصمات علی ولدي) بکە کە چەندان سەرپێچی شەرع فێری منداڵەکانمان دەکەن لە ڕێگەی فیلم کارتۆنەوە.

**٣-یاریە ئەلیکترۆنیەکان (ئەتاری):**

زیانەکانی ئەم یاریە هەر لەوەدا نیە کە منداڵ کاتەکانی تەمەنی لەبەردەمی شاشەیەکدا بەزایە دەدات بەڵکو لەمەش زیاتر چەندان زیانی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە کە پەروەردەکاران‌و پسپۆڕان خەڵکیان لێ ئاگادار کردۆتەوە لەوانە:

یەکەم/ یاریزانەکە ڕادەهێنێت لەسەر دڕندەیی‌و توندوتیژی‌و کوشتار. چونکە زۆربەی ئەو یاریانە خۆشیەکانیان لە پیاوکوشتن‌و دەست گرتن بەسەر ماڵ‌و سامانیاندایە.

لە وڵاتی کەنەدا لێکۆڵینەوەیەك کرا لەسەر (٣٠٠٠٠) لەو یاریانەو لە ئاکامدا دەرکەوت (٢٣) هەزاریان ڕاستەوخۆ باس لە کوشتن‌و تاوان‌و خوێنڕشتن دەکات...

دووەم/ بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی ڕەگەزی (جنسي):

١- زۆربەی یاریەکانی زۆرانبازی بە ئافرەتی بێ جل‌وبەرگ ئەنجام دەدەن کە (کاسیات عاریات)ن.

٢-لە یاری پێشبڕکێکاندا هەر کە سەردەکەوێت بۆ قۆناغێکی تر یەکسەر کچێکی ڕووتترو جوانتری بۆ دەردەچێت‌و ڕۆڵەکە دەبینێت.

سێیەم/ خووگرتن‌و فێربوون بەو یاریانەوە وای لێ دەکات کە ئەرك‌و واجباتەکانی پشتگوێ بخات:

ئەم یاریانە وایان لە هەندێك لە منداڵ‌و مێرمنداڵەکان کردووە کە تەواو خوویان پێوە گرتووەو لەڕادەبەدەر هۆگری بوون، ئەمەش وای کردووە لە هەندێك دەوڵەت ناچاربن تەمەن دیاری بکەن بۆ یاریکردنی ئەو جۆرە ئەتاریانەی کە لە شوێنە

---

١ أطفالنا والترفيه لا (١٣،١٤).

گشتیەکاندا هەن، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك منداڵان هۆگری ببن‌و بۆیان تەرك نەکرێت.

چوارەم/ تاوان‌و ڕەوشتی ناشرین:

لە لێکۆڵینەوەیەکی سەیرو نامۆدا دەرکەوتووە کە ڕێژەی تاوان لەناو ئەو منداڵانەدا کە هۆگری یاری ئەتاریەکانن زیاترە لەوانە: منداڵ گەلێك هەڵدەستن بە سوتاندنی خەڵکانی تر، منداڵانێکیش دایك‌و باوکی خۆیان دەکوژن‌و منداڵانێکیش دەستدرێژی جنسی دەکەنە سەر کچانی منداڵ.

پێنجەم/ دڵی منداڵەکە لە سەر حەزی گوناه ڕادێت:

منداڵەکە لەگەڵ بەردەوامی لەسەر ئەم یاریانەدا کە تیایدا گوێ بۆ مۆسیقاو گۆرانیەکانی دەگرێت، دواتر ئاسان دەبێت لەلای گوێگرتن بۆ شتی حەرام، ئاسایی دەبێت لەلای سەیری کچی بێ جل‌وبەرگ‌و لاشە ڕووتەکانیان، لەسەر هەموو ئەمانە ڕادێت‌و ئاسایی دەبێت لەلای، ئەمە سەرەڕای بەفیڕۆدانی پارەو پولەکانی لە کڕینی شریت‌و چەندان سیدی جۆراو جۆری ئەتاریەکان، بەردەوام بەدوای ئەو یاریانەدا بگەڕێت کە تازەن‌و زۆر گرانن.

**٤- یاریە جادووییەکان (الالعاب السحرية):**

لەو یاریانەی کە لەناو منداڵاندا بڵاوبۆتەوە لەناو وڵاتانی موسڵماندا (یاری سیحربازی)یە لە شوێنی پارك‌و شاری یاریەکان‌و هۆڵە داخراوەکاندا کە زیاتر ناوی نراوە (سێرك) کە تیایدا منداڵی موسڵمان سەیری پیاوێك دەکەن کە یاری بە چاویان دەکات‌و شوشە وا لێ دەکات لەبەر چاویان بفرێت‌و باڵندە دەکات بە وەرەقە، ئەوانیش زۆر خۆشحاڵ دەبن بەم دیمەنەو چەپڵەو فیکەیان بۆ لێدەدەن!! ئەم کارەش یەکێکە لەو حەوت لەناوبەرەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (الموبقات) ناوی بردوون‌و هاوەڵان داری حەدیان داوە لەو کەسەی بەم کارانە هەستاوە.

**٥-چیرۆکی منداڵان:**

هەر لەو شتانەی کە منداڵی موسڵمانان خۆیانی پێوە خەریك دەکەن (چیرۆکی وێنەداری منداڵانەیە)و ئەم چیرۆکانە لەم دواییانەدا زیاتر بڵاوبوویەوەو لەلای منداڵان ڕەواجی پەیداکرد.

کە سەیر لەوەدایە زۆربەی ڕووداوەکانی لەسەر پاڵەوانەتیو توندوتیژیو کوشتنو کەسایەتی خەیاڵیو خورافی یان پاڵەوانە گیانلەبەرەکانن یان پیاوانی ئاسمانی (فضائي) نووسراون.

کە تیایدا دەبینی منداڵەکە ڕۆچووە لەگەڵ کۆمەڵێ ئەفسانەی پڕوپوچی وەك (سوپرمان)و (باتمان)و (میکی)و (سەندرێلا).

هەموو ئەمانە چیرۆك گەلێکی سەیرو سەمەرەن بە وێنەوەو ئەوەی وەریگێڕاوە بە هەموو عەیبو عارو بێ ماناییەکەیەوە، کەمترین وتە دەربارەیان بوترێت: ئەوەیە کە ماناو مەبەستێکی بەرزی تێدانیە، مەبەستی چاندنی ڕەوشتو قیەمی بەرزو جوان نیە.

لەمانەش ترسناکتر ئەوەیە کە تەواوی بوونی خوای تێدا فەرامۆش کراوە، بگرە بە پێچەوانەوە هەموو ئەو کارانەی کە تەنها لە پەروەردگار دەوەشێتەوە داویانە بە پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکانەو لەبەر چاوی منداڵەکانمان باران دەبارێننو خەڵکی نوغرۆ دەکەنو شارێك دەبەن بە ناخی زەویدا بە خەڵکەکانیشیەوە ! !

هەندێك لەو چیرۆکانە ڕووداوەکانی لە دەوری جنۆکەو شەیتانەکاندا نمایش دەکرێت، کە ئەمەش زۆر زیان دەدات لە منداڵەکە لەوەی ترسو بیم دەخاتە دڵیانەوە ئەمەش سەرەڕای خاڵیبوونی ئەو چیرۆکانە لە مانای بەرزو ئاکاری جوان.

**٦-یاری دوو گۆڵی سەرمێز:**

پرسیار کرا لە لێژنەی هەمیشەیی وڵاتی عەرەبستانی سعودی دەربارەی ئەو یاریەی کە لە بازاڕەکاندا داهاتووەو گەنجو منداڵ پێوەی خەریکن، کە بریتیە لە مێزێكو کۆمەڵێك یاریزانی تەختە یان ئاسن دروستکراوەو بە دەست دەجوڵێنرێنو تۆپێك لە

نێوانیاندایەو یاری پێدەکەنو لەدوای یاریەکە دۆڕاوەکە پارە دەدات بە خاوەنی یاریەکەو ئایا لە شەریعەتی ئیسلامدا دروستە؟

لە وەڵامدا وتیان: ئەگەر بەو جۆرە بێت کە باسی دەکەنو پەیکەری تێدابێتو دۆڕاوەکە پارەی یاریەکە بدات ئەوە حەرامە لە چەند ڕوویەکەوە لەوانە:

١- خەریکبوون بەم یاریەوە کاتەکان دەکوژێت لە شتی لەهو لەعبو بێ سووداو لەو پێناوەدا زۆرێك لە کارو ئەرکەکانی دنیاو دینی بۆ دەفەوتێنێت، ئەم یاریە دەکاتە خوو، بەرەبەرە دەبیات بەرەو قومارکردن لەسەری، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بەری لێ بگیرێتو دروست نیە لە شەریعەتدا.

٢- دروستکردنی پەیکەرو وێنەو کڕینی لە گوناهە زۆر گەورەکانە کە فەرموودەی (صحیح) حەرامی کردووەو هەڕەشەی سەختی خوایی لەسەرەو سزای ئاگری بە ئێشی بۆ هەیە.

٣- هەر بەوەی کە دۆڕاوە کە پارەکەی دەدات حەرام دەبێت، چونکە فەوتو ڕەوتکردنی ماڵە لە شتی پڕوپوچدا، کاسبی کردن بەسەر ئەو ئامێرەوە دروست نیەو ئەو پارەیە حەرامەو (سحت)ە کە لەو ڕێگایەوە دەستی خۆی دەخاتو خواردنی ماڵی خەڵکە بە ناڕەواو لە گوناهە گەورەکانەو قومارەو حەرامە (وبالله التوفیق).[1]

٧- هەموو یاریەکانی تری وەك: بیستو یەكو پۆکەرو چۆکەرو شەترەنجو هتد.. پرسیار لە هەمان لێژنەی پێشوو کرا دەربارەی ئەم یاریانە ئایا حەرامن یان هەر مەکروهن؟

لە وەڵامدا وتیان:

ئەگەر ئەو یاریانە لەسەر پارەو بەرامبەر بکرێت ئەوە قومارەو حەرامەو (ابن عبدالبر) دەڵێ: هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە شەترەنج حەرامە ئەگەر لەسەر شت بکرێتو قومارەو دروست نیە کردنی.

---

١ فەتوای ژمارە ٢٢٠٩ (١٥/٢٠٦-٢٠٧).

هەروەها لەو ڕووەشەوە حەرام دەبێت كە زۆرێ لە ئەركو واجباتی بۆ دەفەوتێنرێت لە كاتەكانی خۆی وەك نوێـژ بـۆ نمونـەو فەوتانـدنی مـافی خێـزان یـان دایـكو بـاوكو كەسانی تری ژێردەستی، یان سەردەكێشێت بـۆ حـەرامی وەك نـاكۆكیو دووبـەرەكیو ڕقو كینەو جنێو و قسەوتن بە یەكتری كە ئەوەش حەرامە، بـەڵام ئەگـەر ئـەم یاریانـە لەم شتانەی پێشو بەدوور بێت، هەر بـاش وایـە خۆمـانی لێ بـەدوور بگـرین چـونكە لـە پێشەوا (علی كوڕی ئـەبوطالـب)ەوە دەگێڕنـەوە كـە داویـەتی بـەلای كۆمەڵێكدا یـاری شەترەنجیان كردووە فەرموویەتی: (مَا هَـذِهِ التَّمَاثِيـل الـتي أنـتُم لَهَـا عَـاكِفُون)؟ واتـە: ئەمە چیە سەرتان داخستووە بۆ ئەم بتانە؟

هەروەها (ابن عمـر)و هـاوەڵانی تـریش حـەرامیان كـردوونو هـەروەها (أبوحنیفـە)و (أحمد)و (مالیك) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) حەرامیان كردوون، چونكە هۆكارێكـە بـۆ سەركێشان بەرەو قومـاركردن لەسـەریان، هـەر لەبـەر ئـەو هۆیەشـە كـە پێغەمبـەرمان هەڕەشە لەو كەسانە دەكات كە تاوڵە دەكـەنو بـە سەرپێـچیكاری پـەروەردگار ناویـان دەباتو دەفەرموێت ((من لعب بالنرد فقد عصى الله ورسوله)).

٨- یاری دەرەچێ كردن:

هەروەها پرسیار كرا لە هەمان لێژنە دەربارەی (شختك بختـك)و دەرەچـیێو بـەختی خۆت كە شێوەكەشی قوتویەكی مەقەبا دەكرێتو لەناویدا شـتت بـۆ دەردەچـێت ئـیتر جاری وا هەیە شتەكە چاكو گران بەهایەو جاری وایش هەیە زۆر بێ نرخە؟

لە وەڵامدا فەرموویانە: ئەم یاریە دروست نیە چونكە دەچێتە ڕیزی كڕینو فرۆشتنی نادیار (بیع الغرر)و دەچێتە ڕیزی قومارەوەو حەرامە.

شەشەم: ئەو كاتانەی كە دروست نیە بوار بە منداڵان بدرێت یاری بكەن تیایاندا:

١- دەبێت لەكاتی نوێژەكاندا یاری نەكەن تا ڕابێن لەسەر پارێزگـاری لـەكاتی نوێژەكانیان بە كۆمەڵو لە مزگەوتدا ئەنجامیان بدەن.

٢-لەكاتی خۆر نیشتندا كە وەختی بڵاوبوونەوەی جنۆكەو شەیتانەكانە.

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((اکتفوا صبیانکم العشاء، فان للجن انتشاراً أو خطفةً))[1] واتە: منداڵەکانتان بەدوور بگرن لە یاریکردن لە دەرەوە لە دوای خۆر نیشتن‌و لە کاتی عیشادا چونکە لەو کاتەدا جنۆکەکان بڵاودەبنەوەو دەست دەبەن بۆ خەڵکی.

٣-هەروەها نەهێڵن لەدوای عیشای درەنگ یاری بکەن چونکە گومانی ئەوەی تێدایە کە خەبەریان نەبێتەوە بۆ نوێژی بەیانی.

* (ابي البدرة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناخۆش بووە لەپێش نوێژی عیشا بخەوین‌و لەدوای عیشایش قسەو باس بکەین).[2]

* موعاویەی کوڕی قەڕە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: باوکم لە دوای نوێژی عیشا بە هەموو منداڵەکانی دەووت: منداڵەکانم بخەون بەڵکو خوای گەورە لەم شەوەدا خێر بێنێتە ڕێگەتان).[3]

منیش دەڵێم: شەو درەنگ خەوتن هۆکارە بۆ فەوتاندنی نوێژی بەیانی‌و ئەگەر بیشی کات بە تەمەڵی‌و قورسی هەڵدەستێت بۆ کردنی چونکە تەواو شەکەت بووە.

حەوتەم:

هەر لە فەرموودەکەدا گەمەو شۆخی‌و سوعبەتی پێغەمبەرمان بۆ دەردەکەویت کە لەگەڵ منداڵاندا کردوویەتی ئەمەش سۆزو خۆشەویستی بووە بۆیان:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (کان رسول الله (ﷺ) من أفکه الناس مع الصبي)[4].

---

١ رواه البخاري (٣٣١٦).

٢ رواه البخاري (٥٤٧).

٣ رواه أبونعیم (٢/٢٩٩).

٤ رواه ابن النسي في (عمل الیوم واللیلة) (٤١٩)دا.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خۆشـترین‌و سوعبەتـچی تـرین کـەس بـووە لەگـەڵ منداڵدا.

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: کوڕێکی (أم سُـليم) هـەبوو نـاوی (أبـو عمير)بوو، باڵندەیەکی هـەبوو، پێغەمبـەر (ﷺ) هـەر کاتێـك بهاتایـە بـۆلای دەیکـردە پێکەنین، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە (وكان يناغيه) واتە: نەغنەغەی بۆ دەکردو ئغـەی بـۆ دەکرد.

* محمودی کوڕی ربیع (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: تەمەنم پێنج سالان بوو لەبیرمـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی پڕ دەکرد لە ئاو تێی دەگرتم یان بە دوڵچە[1]

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ) گاڵتەو شۆخی لەگـەڵ زەینـەبی کـچی (أم سـليم) دەکـردو پێـی دەفـەرموو: ((يـا زوينـب، يـا زوينب))[2] واتە: زەینەبولکە–زەینەبولکە، یان زەینەبە گچکە–زەینەبە گچکە !.

* دیسان ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (پێغەمبەری خـوا (ﷺ) پێی دەگووتم ((يا ذا الاذنين))[3] واتە ئەی خاوەنی دوو گوێ–ئەی گوێدار.

هەشتەم: لە سوعبەت‌و شۆخیەکانی لەگەڵ منداڵاندا ئەوەبوو لەسـەر پـشتی یاریـان دەکردو ئەویش قسەی نەدەکرد:

** (أم خالد)ی کچی (خالدی کوڕی سەعید) دەڵێ: لەگەڵ باوکمـدا هاتمـە خزمـەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کراسێکی زەردم لەبەردابوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرمووی: ((سـنة، سـنة)) واتـە: چـەند جوانـە چـەند جوانـە جلـەکانت)و منـیش بـە مـۆری پێغەمبەرایەتیەکـەی یـاریم دەکـردو دەسـتاکریم دەکـردو بـاوکم لـێم تورەبـوو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((دعها)) واتە: وازی لێ بێنە.[4]

---

١ رواه البخاري (٧٧).

٢ رواه الضياء في المختاره (١٠٩/٥) ١٥٣٣– إسناده صحيح.

٣رواه أحمد (١١٧/٣–١٢٧).

٤ رواه البخاري (٥٩٩٣).

نۆیەم: هەر بەم جۆرە هاوەڵانیش (خوایان لێ ڕازی بێت) لەناو ماڵو خێزانی خۆیاندا گرنگیان داوە بە شۆخیو گاڵتەكردن:

* ابراهيم التميمي دەڵێ: عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) دەیفەرموو: پیاو لە ماڵەوە دەبێت وابێت، بەڵام لەكاتی پێویستدا دەبینی پیاوە.

* سفيان الثوري (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: زەیدی كوڕی ثابت (خوا لێی ڕازی بێت) لەناو ماڵ منداڵەكەیدا سوعبەتچی ترین كەس بووە بەڵام كە لەناو خەڵكدا دابنیشتایە جدی ترین پیاو بوو)[١]

* عەقەبەی كوڕی حارث دەڵێ: ئەبوبەكری صدیقم بینی (خوا لێی ڕازی بێت) حەسەنی كوڕی عەلی دەگرت بە باوەشیەوەو هەڵیدەقوناند دەیفەرموو:

بـــابی شـــبهُ النـــبي لیـــس شبیهـــا بعلي

واتە: هەموو گیانی لە پێغەمبەر دەكاتو هیچی لە عەلی ناكات. عەلیش (خوا لێی ڕازی بێت) گوێی لەو شیعرە بوو لە پاڵیدابوو پێ دەكەنی.

دەیەم:زانایان زۆر گرنگیان داوە بەو سودو كەڵكانەی لە فەرموودەكەی ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) وەردەگیرێتو تەنانەت أحمدی كوڕی أبی أحمدی (الطبري) بەشێكی تایبەت كردووەو ناوی ناوە (ئەو كەڵكانەی لە فەرموەدەكەی (أبی عمیر) وەردەگیرێت)و لە پێشەكیەكەیدا وتوویەتی:

(بەسەرهاتی عومەیر، كە ڕیوایەتەكانیم) هێناوە، بەكورتیەكەی چەندان كەڵكی فقهیو سوننەتیو حیكمەتی تێدایە كە شەست لایەنی فیقهی لەخۆ گرتووە ئەوەی پەیوەندی بە منداڵەوە هەیە:

١-لە فەرموودكەدا هاتووە هەر كاتێك بهاتایە بۆ لای، سوعبەتو شۆخی لەگەڵ دەكرد كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆر شۆخی لەگەڵ كردووەو ئەمەش دوو شت دەگەیەنێت:

یەكەم/ شتێكی دروستو ڕێگەپێدراوە سوعبەتكردن لەگەڵ منداڵاندا.

دووەم/ ئەم ڕێگەپێدانە بەڵگەی سوننەتیەتی نەك بەڵگەی دروستی ئەگەر وانەبووایە زۆر جار دووبارەی نەدەكردەوە وەك لە باسی نوێژگەر دەستكاری وردە

١ رواه الدينوري في (المجالسة) (١٠٣٨).

بەردی بەردەمی دەکاتو دەفەرموێت: ((فان كنت لابد فاعلاً فمرة)) واتە ئەگەر چارت نەبوو تەنها یەك جار نەبێت قەیناکات یەکجار.

٢-سوعبەتو شۆخیەکانی لەگەڵ منداڵاندا بەڵگەیە لەسەر بێ فیزیو خۆبەزل نەزانینی پێغەمبەرمان (ﷺ).

٣-بەڵگەیە لەسەر ڕەوشتی بەرزو جوان.

٤-بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە پیاو لە ماڵەوە کەسێکی جیابێت وەك ئەوەی لە دەرەوەیە، لە ماڵەوە سوعبەتچی بێت لەگەڵ منداڵەکانیو بەڵام لە دەرەوە خاوەنی ویقارو کەسایەتی بێت بەڵام لەبەر ڕیاو خۆدەرخستن نەبێت.

٥-مەبەست لە وشەی (ما بال أبا عمير) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە برایەکت بینی، لە حاڵی برا یان منداڵە بچوکەکانی بپرسی.

٦-لە فەرموودەکەدا (باڵندەکەی کە یاری پێ دەکرد مرد)و پێغەمبەریش (ﷺ) بەرگری لێ نەکرد لەو کارەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە باوکان باڵندە بۆ منداڵەکانیان بکڕن.

٧- بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە باوكو دایکان دەبێت بوار بە منداڵەکانیان بدەن بە ئارەزووی خۆیان یاری بکەن ئەگەر یاریەکە حەرامو بەدڕەوشتی لێ نەکەوێتەوە.

٨- بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەرجکردنی پارە لەپێناو کڕینی بوكو یاری بە منداڵەکانیان بە ئیسرافو پارە بەفیڕۆدان دانانرێت ئەگەر حەرام نەبن.

٩-بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گرتنی باڵندەو ڕاگرتنی لەناو قەفەزدا دروستە.

١٠-هەر کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوعبەتی لەگەڵ (أبا عمير)دا بکردایە (أبا عمير) دەستی دەکرد بە گریان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو گریانێکی هەتیو عەرشی پەروەردگار نالەرزێنێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إذا بكى اليتيم اهتز العرش)). بۆ هەموو گریانێك نەهاتووەو دوو جۆرە گریان هاتووە:

یەکەم/ گریانی ناز لەدوای شۆخی کردنو گەمەکردن لەگەڵ هەتیوەکە.

دووەم/ گریانی ستەملێکردنو نەبوونیو خەفەتباری بەڵام ئەگەر سوعبەتت لەگەڵ هەتیوێکدا کردو گریاندت ئەوە گوناه نیەو عەرشی خوا نالەرزێنێت.

١١- بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤی عاقڵو ژیرمەند لەگەڵ خەڵکیدا دەجوڵێتەوە بەپێی عەقڵی خۆیان نەك بەپێی عەقڵو ژیری خۆی.

١٢- هەندێك وا دەزانن کە ژیرمەند نابێت قسە لەگەڵ بێ عەقڵدا بکاتو هەواڵی بپرسێت، نەخێر وانیە بەڵکو ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی باڵندەیەك دەپرسێتو هەواڵی منداڵێکی بچوك دەپرسێتو دەفەرموێت ((یا أباعمیر مافعل النغیر؟)) یان فەرمووی ((ما بال أباعمیر)).

*　　　*　　　*

## فەرموودەی سی و هەشتەم

## بەرگری کردن لە سەرتاشینی نیوەچڵ

عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال: ان النبي (ﷺ) رأى صبياً حلق بعض شعره وتَركَ بَعضه، فَنَهَاهُم عن ذلِكَ وقَال: ((أحلقُوا كُلهُ أو أتركُوه كُلّه)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

عبدالرزاق لە (١٩٥٦٤)داو أبوداود لە (٤١٩٥)داو النسائي لە (٥٠٤٨)و ابن حبان لە (٥٥٠٨)دا ڕیوایەتیان کردووە.

### ئەو ئەحکام و فەرمانانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نابێت هەندێك لە سەر بتاشرێت و هەندێکی بەجێ بهێڵرێت کە پێی دەڵێن (القزع)و پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری لێکردووە:

* عبداللەی کوڕی عمر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرگری کردووە لە سەرتاشینی منداڵ بەشێوەی (القزع) دەڵێ وتم بە نافع: (قزع) چیە؟ فەرمووی: هەندێکی سەر دەتاشرێت و هەندێکی بەجێ دەهێڵرێت.[1]

دووەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کارێکی ناشایستە و ناشەرعی بە منداڵ بکرێت، باوك و دایك و سەرپەرشتیارەکەی بەرپرسیارو گوناهبارن.

سێیەم: جۆرەکانی قەزەع:

ابن قیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: چوار جۆر قەزەع هەیە:

١- لێرە هەندێکی بتاشرێت و لەوێ هەندێکی بهێڵرێتەوە واتە پینەپینە.

٢- ناوەڕاستی سەری بتاشێت و ئەملاو ئەولاکەی بهێلێرێتەوە وەك گاورەکان وایان دەکرد.

---

١ رواه البخاري (٥٩٢٠) ومسلم (٥٦١٠). پڕاو پڕ وەك (حەفر) لەم ڕۆژگارەدا.

٣–ئەملاولاکەی بتاشرێتو ناوەڕاستەکەی بهێڵرێتەوە وەك ئـەوباشو نزمـەکان وایان دەکرد، (ئەمڕۆ پێی دەڵێن (حەفر) وەرگێڕ).

٤–پێشی سەر بتاشێتو دواکەی بهێڵێتەوە، ئەمانە هەمووی قەزەعەو بەرگری لێکراوە لە ئیسلامدا (والله أعلم).

چوارەم: دروستە قژی کوڕ درێژ بکرێتو بکرێت بە پەلکە بۆی:

* ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەربارەی ئەو شەوەی لە مـاڵی پـورە مەیمونـەی مایەوە دەگێڕێتەوەو دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) شـەو هەسـتاو دەسـتی کرد بـە نوێژکردنو منیش هەستام لەلای چەپیدا وەستامو ئەویش دوو پەلکەکـەی قـژی گرتمو خستمیە لای ڕاستی خۆیەوە.[1]

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: پەلکـەم هـەبوو، دایکم پێی وتم: نایبڕم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) درێژی دەکردو ڕایدەکێشت.[2]

* أبو وائل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ابن مسعود (خوا لێی ڕازی بێت) وتاری بۆ دەداینو دەیفەرموو: چۆن پێم دەڵـێن وەك قورئـان خوێنـدنی زەیـدی کـوڕی سـابت لەدوای ئەوەی کە من حەفتاو ئەوەندە سورەتم لە دەمی پێغەمبەری خـواوە بیـستووە (ﷺ) لەو کاتەدا زەید لەناو منداڵاندا یاری دەکردو جوتێك پەلکەی هەبوو.[3]

پێنجەم: سوننەتە لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی منداڵدا سەری بتاشرێت.

شەشەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپاش سێ ڕۆژ مردنی باوکیان سـەری کوڕەکـانی جەعفەری کوڕی ئەبوطالبی تاشی:

* عبداللەی کوڕی جەعفەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ ڕۆژ لـە کـەسو کـاری جەعفـەر وەسـتا لـەدوای شـەهیدبوونیو پاشـان هـات بۆلایـان فەرمووی: ((لاتبكوا على أخي بعد اليوم)) واتـە لـەمڕۆ بـەدواوە بـۆ براکـەم مـەگرینو

---

١ رواه البخاري لە (كتاب اللباس)دا (٥٩١٩).

٢ رواه أبوداود (٤١٩٦) واسنادە حسن.

٣ رواه النسائي (٥٠٦٤) وأصلە في الصحيحين.

پاشان فەرمووی: ((ادعوا اليَّ بَني أخي)) واتە: برازاکانم بۆ بانگ بکەنو دەڵێ: هەموومان هاتین سەرمان وەك جوجەڵەی لێ هاتبوو فەرمانی بە سەرتاشینمانداو فەرمووی: ((ادعوا اليَّ الحلاق))[١]

حەوتەم: ئەمڕۆ زۆربەی منداڵی موسڵمانان وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە چاو لە جولەکەو گاور دەکەنو جۆری قژ تاشینەکانیان لە کۆمەڵگە کافرو بێ باوەڕەکانەوە وەرگرتووەو منداڵە داماوەکە لەسەر ئەم چاولێکردنە گەورە دەبێتو تا وای لێ دێت خۆشیشی بوێنو شوێنیان بکەوێت لە گەورەبووندا.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دەفەرموێت: ((من تشبه بقوم فهو منهم))[٢] واتە: هەر کەسێك چاو لە هەر گەلێك بکات ئەوە لەگەڵ ئەواندایە. کەواتا لەسەر باوكو دایکان پێویستە ئاگاداری منداڵەکانیان بنو نەهێڵن لە شێوازی سەرتاشیندا چاو لە بێ باوەڕان بکەنو لەسەر ئەو شێوازە گەورە ببنو ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا بەرپرسن لێیان:

* ابی سلام دەڵێ: چووم بۆلای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت)و سەرم بە شێوازی (قەزەع) تاشرابوو، فەرمانی دەرکرد هەموویان بۆ تاشیم.[٣]

* شێخ محمود التویجری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: هەر کەسێك چاو بکات لە دوژمنانی خوای تەعالا وەك: (قەزەع/ تاشینی قژی سەر کە هەندێکی بتاشرێتو هەندێکی بەجێ بهێڵرێت ئەوە کاری جولەکەو گاورو مەجوسەکانە)[٤].

---

١ رواه النسائي (٥٢٢٧).

٢ رواه أبوداود (٤٠٣١).

٣ رواه ابن أبي شيبه (٥٣٢٦).

٤ الايضاح والتبين لا (٧٥–٧٧).

زۆرێك لە نەفامانی ئەم سەردەمەی خۆمان قژی منداڵەكانیان بە جۆرێك دەتاشن كە لـە پێـشەوە هەنـدێكی دەهێڵنـەوە وەك پـاپۆكی كەڵەشـێر، دەڵـێن ئەمـە كـاری جولەكەكانەو بە گشتی ئەمە شێواندنی خەڵقی خوایەو حەرامە):

* أبـوداود ڕیوایـەتی كـردووە لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەگێڕێتەوە كە دوو منداڵی بینی كە بە جۆرێك قژیان تاشیبوو كـە هەنـدێكی تاشرابوو هەندێكیشی وەك پەلك شۆڕ كرابوویەوە، فەرمووی: بیانبڕن یان كورتیان بكەنەوە ئەمە شێوە سەرتاشینی جولەكەكانە.[1]

* صفیەی كچی أبی عبید دەڵێت: ابن عمر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) منـداڵێكی بینـی سەری بەشێوەی پچرپچر تاشرابوو (قەزەع) فەرمووی: ئەوە نازانی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرگری كردووە لەوەی كە سەری منداڵان بەم جۆرە بتاشرێت.[2]

* المـروزی دەڵـێ: پرسـیارم كـرد لـە أبـو عبـدالله واتـە: أحمـدی كـوڕی حەنبـەل (ڕەحمەتی خـوای لێ بێـت) دەربـارەی منـداڵ پـشتی سـەری‌و قـەنافزی بتاشرێت؟ لـە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە كـاری فارسـە مەجوسـیەكانەو هـەر كەسـێك چاویان لێ بكـات لەوانە.

*  *  *

---

١ سنن أبوداود (٤١٩٧).

٢ مسند امام أحمد (١٠٦/٢).

## فەرموودەی سی و نۆیەم
## فەرمان پێکردن و بەرگری کردنی منداڵان

**عن ابي هريرة** (ﷺ) قال: كنا عِند رسول الله (ﷺ) وَهُو يقسمُ تَمراً مِن تمر الصدقة، وَالحسن بن علي في حجرهِ، فَلما فرغَ حمله النبي (ﷺ) على عاتقة، فسال لعابة على النبي (ﷺ) فرفع النبي (ﷺ) رأسه، فإذا تَمرة في فِيه، فَحَرك خده، وَقَال: ((القِهَا يَا بنيَّ كِخْ كِخْ ارْمِ بِهَا)) فادخل النبي (ﷺ) يده في فِيه فَانتزعهَا مِنهُ ثُم قال: ((أمَا عَلِمْتَ انَّ الصَّدَقَةَ لاتحلُّ لآل مُحمد)).

### دەرهێنانی فەرموودەکە:

عبدالرزاق (٦٩٤٠)و أحمد (٢/٢٧٩)و البخارى (١٤٨٥)و (١٤٩١)و (٣٠٧٢)و مسلم (١٠٦٩)و النسائى (٨٦٤٥)و الدارمى (١٦٨٢) ڕیوایەتیان کردووە.

### ئەو ئەحکام و فەرمانانەی لە فەرموودەکە وەردەگیرێت:

یەکەم: دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەوە دەگەیەنن کە سەرپەرشتاری منداڵ لەسەریەتی منداڵەکانی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت، ئەمەش بە فەرمان پێکردن و پەروەردەکردنیان لەسەر جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی پەروەردگار قەدەغەی کردووە.

ئەمەش مافێکی منداڵە بەسەر باوک و دایکیەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا پرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەری:

* وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾[١]

---

١ سورەتی التحريم ئایەتی (٦).

* ئیمام عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەر مانای ئەو ئایەتە دەفەرموێت: واتە لەسەر دایكو باوكانە فێریان بكەنو پەروەردەیان بكەن.[١]

* قەتادە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر وشەی (قُوا) دەفەرموێت: واتە فەرمانیان پێ بكات بە گوێڕایەڵی خواو بەرگریان لێ بكات لە قەدەغەكراوەكانی، فەرمانی خوایان بەسەردا جێ بەجێ بكاتو هاوكاریان بێت لەم بارەیەوەو ئەگەر بینی سەرپێچی پەروەردگاریان كرد بەرگریان لێ بكاتو دووریان بخاتەوە لێی.[٢]

* یان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عبداللەی كوڕی عەمری فەرموو (خوا لێی ڕازی بێت) ((وان لولدك علیك حقاً))[٣]

واتە: كوڕەكەت مافی هەیە بەسەرتەوەو دەبێت بەرامبەری جێبەجێ بكەیت.

* لەو فەرموودەیەی كە (ابن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) كە لە پێغەمبەری خواوە بیستوویەتی تیایدا هاتووە: ((والرجل في أهله راع وهو مسؤل عن رعیته..))[٤] واتە: پیاو لەناو خێزانەكەیدا بەرپرسیارە لێیانو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكرێت لەسەریان.

* هەروەها ابن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((لایسترعی الله تبارك وتعالى عبداً رعیة قلت او كثرت الا ساله الله تبارك وتعالى عنها یوم القیامة، أقام فیهم امر الله تبارك وتعالى ام أضاعه؟ حتى یسأله عن أهل بیته خاصة))[٥]

---

١ رواه الطبري في تفسیره (١٦٥/٢٨).

٢ رواه الطبري في تفسیره (١٦٦/٢٨).

٣ رواه مسلم (٢٧٠١).

٤ مسلم (٤٧٥١) والبخاري (٨٩٣).

٥ رواه أحمد (١٥/٢).

واتە: هیچ بەندەیەکی خوا نیە کە خوای تەبارەكو تەعالا کۆمەڵێك کەسی خستبێتە ژێر دەستی جا فەرقی نیە کەم بن یان زۆر، مەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا خوای تەبارەكو تەعالا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات لەسەریان کە ئایا حوکمو فەرمانەکانی خوای بەسەردا جێ بەجێ کردوون یان فەوتاندوونی؟ تەنانەت دەربارەی خێزانو منداڵەکانیشی بەتایبەتی پرسیاری لێ دەکات.

* (فُضیل)ی کوڕی (عیاض)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هەموو شوانێك بەرپرسیارە لە ژێردەستەکانیو پیاو دەربارەی خێزانو منداڵەکانی پرسیاری لێ دەکرێت، دەی لەخوا بترسنو ئاگاتان لە ماڵو منداڵتان بێتو ئێوە بەهەوانتەو بێ مەبەست دروست نەکراون.[1]

دووەم: هەڕەشەی زۆر توند هاتووە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ ئەو کەسانەی کە لەژێر دەستی پیاوێکدانو دەیانفەوتێنێتو فەرمانیان پێ نادات بە گوێڕایەڵی پەروەردگارو بەرگریان لێ ناکات لە سەرپێچی کردنیو ئەنجامدانی حەرامو قەدەغەکراوەکان:

* عبداللەی کوڕی عەمر (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کفی بالمرء اثماً ان یضیع من یقوت))[2] واتە: بەسە بۆ مرۆڤ ئەوەندە گوناه کە ئەو کەسانە بفەوتێنێت کە قوتو خواردنیان لەژێر دەستی ئەو دایە.

* مەعقەلی کوڕی یەسار (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ما من عبدٍ یسترعیه الله رعیة، یموت یوم یموت وهو غاشٍ لرعیته الا حرّم الله علیه الجنة))[3]

واتە: هەر بەندەیەك خوای گەورە خەڵکی خستبێتە ژێر دەستیو ئەو ڕۆژەی دەمرێت غەشو دزی لێ کردبن ئەوە خوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات.

---

١ رواه السلفي في (الطیوریات) (٢٩٩).

٢ رواه مسلم (٢٢٧٥) و أبوداود (١٦٩٢) واللفظ له.

٣ رواه مسلم (٢٨٠).

* عثمان الحائطی دەڵێ: گوێم لە (ابن عمر) بوو (خوا لێی ڕازی بێت) بە پیاوێکی دەووت: ئەدەبو ڕەوشتی منداڵەکەت دابدە چونکە بەرپرسیاری لە کوڕەکەت کە ئایا چۆن پەروەردەت کرد؟ وە چیت فێر کرد؟ ئەویش بەرپرسیارە لە چاکەکردن لەگەڵتداو گوێڕایەڵی کردنت.[1]

* سفیان الثوري (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە ڕۆژی قیامەتدا فەرمان دەدرێت کەسێك بخرێتە ناو ئاگرەوەو پێی دەڵێن: ماڵو منداڵەکەی هەموو چاکەکایان خواردووە.

سێیەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر منداڵ ناشەرعیو سەرپێچیەکی کرد دەبێت سەرزەنشت بکرێتو بەرگری لێ بکرێت لە دووبارەبوونەوەی ئەو غەڵەتە تا حەرامو سەرپێچی ئاسایی نەبێت لەلایان، لەو فەرموودانەی لەم بارەیەوە هاتووە زۆرن لەوانە:

١- ئەو فەرموودەیەی کە فەرمان بە باوکان دەدات لە تەمەنی دە ساڵیدا بدەن لە منداڵەکانیان لەسەر نوێژ نەکردن.

٢- بوار نەدەیت منداڵەکەت لاسایی کافرو بێ باوەڕان بکاتەوە لە قژ داهێنانو سەرتاشینو جلوبەرگ لەبەرکردنو جوانکاریەك کە پێغەمبەر بەرگری لێکردووەو بە باوکان دەڵێت نەهێڵن منداڵەکانیان لایەکی قژیان بتاشنو لایەکی تری بهێڵنەوە.

٣- بەرگریکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەی منداڵان لەکاتی خۆر نیشتندا بچنە دەرەوە کە لەو ساتەدا شەیتانەکان بڵاودەبنەوە بەسەر زەویدا.

٤- نەهێشتنی ئەوەی کە بهێڵرێت منداڵ ئادابەکانی خواردن فەرامۆش بکات وەك لە فەرموودەکەدا هاتبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری کرد لەوەی عمری کوڕی أبی سلمە دەست ببات بۆ ئەملاو ئەولای قاپی خواردنەکەو فێری کرد دەست بۆ بەردەمی خۆی ببات.

[1] رواه أبونعيم في تأريخ أصبهان (١/٤٦٥-٤٦٦).

چوارەم: هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە منداڵ وەك چۆن هەڵەی لێ قبول ناکرێت، هەر بەو جۆرەیش فەرمانی چاکەی بەسەردا دەدرێت تا ڕابێت لەسەری‌و لەو بارەیەوە هاتووە کە:

١- فەرمانی پێدراوە لە سێ کاتدا مۆڵەت وەربگرێت ئەوجا بڕواتە ژوورەوە بۆ لای دایك‌و باوکی کە پێش نوێژی بەیانی‌و لەکاتی نیوەڕۆداو لەپاش نوێژی عیشایە.

٢- فەرمانی پێدراوە کە شوێن بیرو باوەڕی ڕاستەقینە بکەوێت‌و لە بیدعەو هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوا بەدووربێت وەك لە فەرموودەکەی (ابن عباس)دا هاتووە (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((إذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله)) واتە: ئەگەر پاڕایتەوە تەنها لە خوا بپاڕێرەوەو لە ئەو داوا بکەو تەنهایش داوای کۆمەکی هەر لە ئەو بکە.

٣- هەروەها فەرمانی پێدراوە کە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا نوێژ بکات‌و باوك‌و دایکی نوێژی پێ بکەن.

ئەمەو چەندان فەرمانی تر کە لەم کتێبەدا هێناومانە.

پێنجەم:

سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لەسەر ئەم پرۆگرامە جوانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتوون‌و منداڵەکانیان لەسەر پەروەردە کردووە، لەسەر گوێڕایەڵی‌و بەندایەتی گۆش کردبوو، لەسەر دوورکەوتنەوە لە گوناه و قەدەغەکراوەکان‌و بە گەورە سەیرکردنی سنورەکانی پەروەردگارو نەشکاندنیان، لەم بارەیەوە نموونە زۆرن لەوانە:

* لە (ابن عمر)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە جارێکیان دەڕوات بۆ ماڵی یەحیای کوڕی سەعیدو لەو کاتەدا کوڕێکی یەحیا مریشکێکی بەستبوویەوەو نابوویەوە بە نیشانە !

(ابن عمر)یش خێرا ڕۆیشتو مریشكەكەی كردەوەو منداڵەكەشی برد بۆ لای یەحیای باوكیو پێی وت: تەمێی منداڵەكەتان بكەن با باڵندە نەكاتە نیشانەو بە لەسەرخۆیی نەیانكوژێت من لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) كە بەرگری كردووە لەوەی گیانلەبەر بە هێمنی بكوژرێت.[1]

* عەلی كوڕی سەهلی كوڕی زوبێر دەڵێ: خزمەتكارێكیان كچێكی زوبێری بردبووە خزمەت عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) و چەند زەنگڵەیەك لە قاچیدا بوو، عمر كە بینی خێرا پچڕاندیو پاشان فەرمووی: (لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((ان مع كل جرس شيطاناً))[2] واتە: لەگەڵ هەموو زەنگڵەیەكدا شەیتانێك ئامادەیە.

* نافع لە ابن عمرەوە دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێت) كە لە منداڵەكانی داوە لەسەر هەڵەی (زمانەوانی) لە قورئان خوێندنیاندا یان قسەكردنی ئاسایی.[3]

* سەعدی كوڕی ئیبراهیم لە باوكیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: عبدالرحمنی كوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ كوڕێكیدا كە كراسێكی ئاوریشمی لەبەردابوو چوونە خزمەت عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت)و ئەویش هەستاو كراسەكەی لەبەری كوڕەكەیدا دڕاند.[4]

* جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لەبەری كوڕاندا جلی ئاوریشمان بدیایە دامان دەكەندو لەبەری كچاندا دەمانهێشتەوە.[5]

---

١ رواه البخاري (٥٥١٤).

٢ رواه أبوداود (٤٢٣٠).

٣ رواه البخاري في الادب المفرد (٨٨٠) وابن ابي الدنيا في (العيال) (٣٣٥).

٤ رواه ابن ابي شيبه (٤٧٠٩).

٥ رواه أبوداود (٤٠٥٩).

* محمدی کوڕی زوبیر (الحنظلی) دەڵێ: عمری کوڕی عبدالعزیزم بینی دای لە کوڕێکی لەسەر ئەوەی بینی لەسەر دیوارێك نووسیبووی (بسم الله)[١]

* محمدی کوڕی سوقە دەڵێ: سەعیدی کوڕی جوبەیرم بینی (رەحمەتی خوای لێ بێت) عەرەبێکی دەشتەکی بینی ملوانکەیەکی لە ملدابوو، لە ملی ڕایکێشاو قرتاندنی.[٢]

* ئەسمای کوڕی عوبەید دەڵێ: بە محمدی کوڕی سیرینم وت: چەند هەتیوێکم لەلایە واتە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەم، فەرمووی: بە منداڵەکانی خۆت چی دەکەیت بەوانیشی بکە، چۆن دەدیت لە منداڵی خۆت ئاواش لەوان بدە.[٣]

* شومەیسە (العتکیە) دەڵێ: باسی تەمێکردنو لێدانی منداڵی هەتیو کرا لە خزمەت عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێت)و ئەویش فەرمووی: من جاری وابووە ئەوەندەم داوە لە هەتیو لە چوارپەلی کێشاوە.[٤]

* ئیبراهیم (النخعی) دەڵێ: لەسەر پاراستنی پەیمانو شایەتیدان دروست لێیان دەدایـن.[٥]

شەشەم: سەرپەرشتی منداڵ دەبێت زۆر ژیرانە هەموو شێوازەکانی بەکاربهێنێت، دەبێت زۆر سوور بێت لەسەر پەروەردەکردنو تەمێ کردنیانو نابێت ڕەحمو بەزەیی وای لێ بکات کە توڕە نەبێت لێیانو لێیان نەدات ئەگەر بینی سەرپێچی شەرعیو کاری نابەجێ دەکەن کە ئەوەش وایان لێ دەکات وردە وردە لەگەڵ گوناهدا ڕابێتو لەپاش ئەوە دەبنە هۆی زەرەرمەندی خۆیانو ئەوانیش:

---

١ رواه ابن ابي شيبه (٢/٤٦-٤٧).

٢ رواه الفاكهي في اخبار مكة (٤٤٢).

٣ رواه البخاري في الادب المفرد (١٤٠).

٤ پێشتر دراوە.

٥ رواه البخاري في صحيحه (٣٦٥١).

** ابن الجزار القيرواني کە پزیشك بووە دەڵێ: فەرمانمان پێدراوە کە ئەدەبی منداڵانمان لەکاتی منداڵیاندا دابدەین، چونکە لەو کاتەدا زۆر شتیان بەدەست خۆیان نیەو هەر کارێك بدەیت بەسەریاندا ئەوە دەکەنو هەر کەسێك منداڵەکەی لەسەر ئەدەبو ڕەوشتی جوان پەروەردە بکات ئەوە چاکەیەکی گەورەی دەست کەوتووە، بەڵام هەر کەسێك ئەوە وازلێبێنیو گرنگی پێ نەدات ئەوە بەرەو ناتەواویەکی گەورە دەبیات، لەوانەیە دوای ئەوەی کار لەکار ترازا هەست بە گەورەیی پەروەردەکردنی منداڵەکانی بکاتو پەشیمانی ڕووی تێ بکات کە بەهۆی هەڵەی خۆیەوە تووشی هاتووە.[1]

* ابن قیم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەو کەسەی منداڵەکەی پشتگوێ بخاتو ئەو زانستانەی فێرنەکات کە سودی هەیە بۆی ئەوە لەگەڵ منداڵەکەیدا بە ئەوپەڕی خراپی خراپ بووە، خراپ بوونی زۆربەی منداڵان بەهۆی باوكو دایکیانەوەیە، کە داواکاریەکانی ئیسلامو سوننەتەکانی پێغەمبەریان فێرناکەن، بە منداڵی فەوتاندونیان، ئیتر بە گەورەیی نە سودیان بۆ خۆیان دەبێتو نە سودیان بۆ ئەوانیش دەبێت.

هەروەك باوکێك گلەیی لە کوڕەکەی دەکاتو دەڵێ زۆر خراپیت لەگەڵمدا، ئەویش جوان وەڵامی دایەوەو وتی: بە منداڵی لەگەڵ من خراپ بوویتو منیش بە گەورەیی لەگەڵ تۆ خراپم، بە منداڵی منت فەوتاندو منیش بە گەورەیی تۆم فەوتاند.[2]

حەوتەم: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت قۆناغ قۆناغ بەرگری لە منداڵ بکرێت نابینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەرەتاوە بەدەم بەرگری خواردنی دەنکە خورماکەی لە حەسەن کرد،و پێی فەرموو: ((کخ کخ))و پاشان هەر بەوەوە نەوەستاو

١ سياسة الصبيان لا(١١٤).

٢ تحفة المودود لا (٣٨٧).

قۆناغی دووەمـی لەگەڵدا بـەکارهێنا کـە گـۆڕینی سەرپێچییەکەیە بـە دەسـتو هەسـتا دەستی خستە دەمی بەزۆر خورماکەی لە دەمی دەرهێنا بە لیکەکەیەوە.

هەشتەم: خۆشەویستیو ڕەحمو سۆز نابێـت وا لـە بـاوكو دایکـان بکـات کـە واز لـە منداڵەکەیان بهێنن بە ئارەزووی خۆی چی بوێت بیکات، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بە بەزەیترین کەس بووە لەگەڵ مـاڵو منداڵەکەیـدا کەچـی ئـا بـەو جـۆرەش تونـدو تیژە لەگەڵ حەسەنداو ناهێڵێت تەنانەت دەنکە خورمایەکیش بخـوات چـونکە خورمـای زەکاتەو زەکاتیش بە بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) ناشێتو پێی دەفەرموێت: ئایا نازانی زەکات بـە ئـالی محمد ناشـێتو دروسـت نیـە بۆیـان، کەواتـە ئەمەیـە ڕەحـمو بـەزەیی ڕاستەقینە بە منداڵدا.

نوکتەیەك/ زۆرێك لە باوكو دایکان لە ڕێگەی تێنەگەیشتنەوە وادەزانن منداڵـەکانیان خۆش دەوێتو سۆزیان هەیە بۆیان کە هەڵیان ناسێنن بۆ نوێژی بـەیانی!! یـان دڵیـان نایە ڕۆژوویان پێ بگرن![1]

نۆیەم: فەرموودەکەش ئەوە دەگەیەنێت کە کاتێت باوكو دایکان بەرگری لە کارێکی ناشایستە دەکەن لە منداڵەکانیان دەبێت هۆی ئـەوەیان بـۆ روون بکەنـەوە کـە بۆچـی نـاهێڵن ئـەو کـارە بکـەن وەك پێغەمبـەر (ﷺ) هۆکـاری نـەخواردنی خورماکـەی بـۆ حەسەن ڕوون کردەوە.

دەیەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زەکات وەك بـۆ گـەورەکانی کـەسو کاری پێغەمبەر دروست نیە هەروایش بۆ منداڵەکانیان دروست نیە، (کەواتە هەندێك لـە باوکان وادەزانن گوناهکردنو حـەرام خـواردن بـۆ گـەورەو بەساڵاچـوان حەرامـەو ئـیتر منداڵەکانیان دزی لە باخی خەڵکیو دوکانەکان بکەن سەرزەنشتیان ناکەن یان جنێـوو

[1] وتەی وەرگێڕ.

شەڕو قسەی سوك بڵێن بە هاوڕێكانیان بەرگریان لێ ناكەن‌و دەڵێن قەیدی چیە منداڵە جارێ!!)[1]

یازدەیەم: فەرمودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە لیكی منداڵ پاكە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی كرد بە دەمی حەسەنداو خورماكەی دەرهێنایەوە بە لیكەكەوەو هەڵیدایەوە ناو خورماكانی ترو فەرمانی شۆردنی نەدا.

* ابن قیم (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەم مەسەلە شتێكی گشتیەو كەس ناتوانێت خۆی لێ بپارێزێت‌و منداڵ هەر هەڵدەگیرێت‌و ئەویش لیك‌و تفی هەیە، بۆیە شەرع وای داوا نەكردووە جل بشورێت لە پێوەدرانی لیك‌و بە دروستی داناوە نوێژی پێوەبكرێت.[2]

دوازدەیەم: فەرموودەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دروستە لەناو كۆڕو كۆمەڵدا پیاو منداڵی لەگەڵدابێت‌و دروستیشە بیخاتە سەر كۆشی یان لەپاڵ خۆیدا دایبنێت.

سێزدەیەم: لە فەرموودەكەدا ئەوە دروستە كە پیاو منداڵ بخاتە سەرشانی یان وەك دەڵێن بیگرێت بە قەڵادوشكانیەوە.

چواردەیەم: دروستە كاتێك منداڵ شتێكی خراپ یان حەرام بخوات پێی بڵێی –كخ–كخ– واتە: پیسە، كخەیە، بیتفەوە: وەك ئەوەی حەسەن (خوا لێی ڕازی بێت) خورماكەی برد بۆ دەمی‌و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((كخ كخ ارم بها...)) فەرموودەكە.

---

[1] وتەی وەرگێڕ.

[2] تحفة المودود (٣٦٢).

کە ئەم وشەیە بۆ منداڵ بەکاردەهێنرێت کاتێك شتێکی پیس ببات بۆ دەمی، هەندێك دەڵێن وشەیەکی عەرەبییەو هەندێکی تر دەڵێن فارسییەو بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە باسی قسەکردن بە فارسیدا هێناویەتی (والله أعلم).

*　　　*　　　*

## فەرموودەی چل هەم
## نیشانەکانی باڵغبوونی منداڵ

**عن عبدالله بن عمر (رضى الله عنهما) قال:** عرضني رسول الله (ﷺ) يَومَ أُحُد فِي الْقتال، وأنَا ابنُ أربعَ عَشْرَةَ سَنَة فَلَم يُجزِني، وعرَضَني يَومَ الْخَنْدَقِ، وأنَا إبنُ خَمْس عَشْرَةَ سَنَةً فأجَازَني.

قَالَ نَافِع: فقَدِمتُ عَلَى عُمَر بْنِ عَبدالْعَزِيزِ وهوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَة، فَحَدَّثتُهُ هَذَا الْحَدِيث، فقَالَ إنَّ هَذَا لَحَدّ بَينَ الْكَبِيرِ والصَّغِيرِ، فَكَتَبَ إلَى عُمَّالِهِ أن يَفرِضُوا لِمَن كَانَ ابْنَ خَمس عَشْرَةَ سَنَة، وَمَن كَانَ دُونَ ذَلكَ فَاجعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ.

أحمد له (٢/١٧)و البخاری لە (٤٠٩٧) (٢٦٦٤)داو مسلم لە(٤٨٧٠)داو وشەکەش هی ئەوە، أبو داود (٢٩٥٧) لە باسی (کەی موچەی گەورە بە موجاهید دەدرێت؟)دا (٤٤٠٦)و الترمذی لە (١٧١١)و (١٣٦١)و النسائی لە (٣٤٣١) لە باسی کەی تەلاقی منداڵ دەکەوێت، و ابن ماجه (٢٥٤٣) لەباسی ئەو کەسەی حەدی لێ نادرێت.

### ئەو ئەحکامو فەرمانانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

یەکەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر جیاکردنەوەی گەورە لە منداڵ.

دووەم: زاناکان شەش نیشانەیان داناوە بۆ دەرکەوتنی باڵقبوونو بوون بەپیاو کە چواریان ژنو پیاو دەگرێتەوەو دوانیان تایبەتە بە ئافرەتانەوە.

سێیەم: یەکەمیان ئەوەیە بە ساڵ باڵقوون دیاری بکرێت کە فەرموودەکە بەئاشکرا ئەو مانایە دەگەیەنێتو بوخاریش لە صەحیحەکەیدا باسێکی ناوناوە کاتی باڵقبوونی منداڵان.

* یان فەرموودەکەی ابن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) کە بۆ جەنگی ئوحود ڕێگەیان پێ نەدا بەشداری بکات چونکە (١٤) ساڵان بوو بەڵام هەر کە بوو بە (١٥) ساڵان وەك پیاوێکی موجاهید حیسابی بۆ کردو ڕێگەی پێدا.[1]

---

١ صحیح البخاري (٤٧٢٨).

* ئەوەیشی کە عمری کوڕی عبدالعزیز یاسای دیاریکردنی گەورەبوونی لەسەر بنیات ناو لە هەموو وڵاتی ئیسلامدا هەمواری کرد بەڵگەیە لەسەر (١٥) ساڵان بەڵگەی گەورەبوونو باڵق بوونە.

* الترمذي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (زانایانی وەك سفیان الثوریو ابن المباركو الشافعيو أحمدو اسحاق پێیان وایە منداڵ پێی نایە (١٥) ساڵی حوکمی گەورەی بەسەردا دەدرێت، بەڵام ئەگەر پێشتر نیشانەی گەورەبوونی بە بالقبوون (احتلام) لێ دەرکەوت حوکمی گەورەی بۆ دەکرێت)[١].

* ابن منذر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: نوعمان دەڵێت: (ئاستی گەورەبوونی تەمەنی (١٨) ساڵیە بەڵام کچ لە (١٧) ساڵیدایە)و ئەمەش بەڵگەیەکمان لەسەر ئەم تەمەنانە دەست نەکەوتو هەر کارکردن لەسەر فەرمودەکەی ابن عمر شایانترەو بەڵگەیەکی ئاشکرایە.[٢]

چوارەم: دووەم نیشانەی باڵق بوون (احتلام)ە واتە حەزی شوکردن یان ژن هێنانو دەرکەوتنی ئاوی مەنیە:

* خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾[٣]

* أبوسعيد الخدری (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((غسل يوم الجمعة واجب على كل محتلم))[٤] واتە خۆشوردنی ڕۆژی هەینی لەسەر هەموو کەسێکی پێگەیشتووە.

---

١ السنن (٣/٦٤٢).

٢ الاوسط (٤/٣٨٩).

٣ النور (٥٩).

٤ رواه البخاری (٢٦٦٥) لە باسی باڵق بوونی منداڵاندا.

* یان ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((رفع القلم عن ثلاث)): واتە گوناه لە سەر سێ کەس نانووسرێت یەکێکیان فەرمووی: ((الغلام حتى يحتلم)) واتە منداڵ تا باڵق دەبێت ئەویش بە دەرکەوتنی ئاوی مەنی.

* ابن قدامە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: یەکەمین نیشانەی گەورەبوون هاتنەدەرەوەی ئاوی مەنیە لە عەورەتەوە، ئەو ئاوەی کە مرۆڤی لێ دروست دەبێت ئیتر لە خەودا یان لەکاتی بەئاگاییداو بە چوونە لای خێزان یان هەر خۆی بێتەوە، لەمەدا هیچ جیاوازیەکمان نەبینیوە.[1]

* البغوی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر کوڕ یان کچ پێش تەمەنی (١٥) ساڵی نیشانەی ئاو هاتنەوەی لێ دەرکەوت حوکمی گەورەی دەدرێت بەسەردا، یان کچ لە دوای (٩) ساڵی بکەوێتە حەیزەوە حوکمی گەورەی هەیەو پێش (٩) ساڵی نە ئاو نە حەیز دەوریان نیە.[2]

* موغیرەی کوڕی مەقسەمی الکوفی دەڵێ: من لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا نیشانەی ئاو هاتنەوەم لێ دەرکەوت).[3]

پێنجەم: لە نیشانەکانی تری گەورەبوون دەرهاتنی مووە لە جەستەی مرۆڤ:

* ابن قدامە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: مووی زبر لە دەووبەری شەرمگەی کوڕ یان کچ دەرهاتو شایانی ئەوەبوو لابرێت ئەوە نیشانەی گەورەبوونە، بەڵام مووە ورد یان زەردەموو هیچ نیە چونکە منداڵیش هەیەتی.[4]

* عطية القرضي (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە ڕۆژی قورەیزەدا فەرمانی کوشتنمان لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەرچوو، سەیر دەکرا هەر کەسێك مووی

---

١ المغني (٦/٥٩٧).

٢ شرح السنة (٩/٣٢٨).

٣ رواه البخاري معلقاً (٢/٢٥٧).

٤ المغني (٦/٥٩٧).

بەری ببوایە دەكوژراو هەر كەسیش دەرنەهاتبایە بەڕەلاّ دەكراو منیش یەكێك بووم لەو بەڕەلاّكراوانە.[١]

* الترمذي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: فەرموودەیەكی (حسن صحیح)ەو لەلای هەندێك لە زاناكان كاری پێ دەكرێت ئەگەر ساڵی لەدایكبوون یان هاتنەوەی ئاوی مەنی دیار نەبوو ئەمەش وتەی أحمدو اسحاقە.[٢]

* عبدالەی كوڕی عبیدی كوڕی عومەیر دەڵێ: منداڵێك لە سەردەمی عثمانی كوڕی عەففاندا (خوا لێی ڕازی بێت) دزی كردو هێنایانە خزمەتیو ئەویش فەرمووی: سەیری شەرمگەی بكەنو ئەوانیش سەیریان كرد مووی لێ نەهاتبوو، ئەویش دەستی نەبڕی.[٣]

* ابن منذر (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: خوای عز وجل فەرمانی داوە بە جەنگ كردن لەگەڵ بێ باوەڕانو كوشتنیانو پێغەمبەریش (ﷺ) بەرگری كردووە لەوەی ژن یان منداڵ بكوژرێت، سوننەتیش بە دەرهاتنی موو منداڵی لە گەورە جیاكردۆتەوە.[٤]

شەشەم: نیشانەی چوارەمی گەورەبوون، منداڵەكە شەش بست (شبر) درێژ بێت:

* ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە منداڵێكیان هێنایە خزمەت ئەبوبەكری صدیق كە دزی كردبوو، نەیانزانی تەمەنی چەندەو نەشیاندەزانی ئایا باڵق بووە یان نا، بۆیە ئەبوبەكر بە بست پێوای ئەوەندەی پەنجەیەك كورتتر بوو لە شەش بست بۆیە بەڕەلای كردو دەستی نەبڕی.[٥]

* عبداللەی كوڕی ئەبی مولەیكە دەڵێ: خزمەتكارێكی عمری كوڕی عبداللەی كوڕی ئەبی ڕەبیعەیان هێنایە خزمەت عبداللەی كوڕی زوبێر كە دزی كردبوو، (ابن الزبیر)یش

---

١ رواه أحمد (٣٤١/٤)، أبوداود (٤٤٠٤) والنسائي (٣٤٢٩).

٢ السنن (٩٤٥/٤).

٣ رواه البيهقي في السنن الكبرى (٥٨/٦).

٤ الاوسط (٣٨٨/٤).

٥ رواه ابن ابي شيبه (٨٢٠٤).

پێوای دەبینیْ شەش بستە، دەستی بڕی، لەو کاتەدا ابن الـزبیر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) فەرمووی: عمری کوڕی خطـاب (خـوا لێـی ڕازی بێـت) نامـەی نووسـی بـۆ عێراقیـەکان دەربارەی منداڵێکی بەنی عامر کە ناوی (نومەیلە)بوو، دزی کردبوو، عمر بۆی نووسین: بیپێوون ئەگەر شەش بست بوو، ئـەوا دەسـتی بـبڕن، ئـەوانیش پێوایـان بـە ئەنـدازەی پەنجەیـەك کـەم بـوو، وازیـان لیْ هێنـاو ناویـان لێنـا (نومەیلـە) واتـە پەنجـە بچکۆڵە، لەپاشەڕۆژدا بوو بە سەرکەورەی عێراق.[1]

* إبن منذر (رەحمەتی خوای لیْ بێت) دەڵیْ: لـە ئەبوبـەکری صـدیقو عمـری کـوڕی خطابو (إبن الزبیر)ەوە (خوایان لیْ ڕازی بێت) گێڕاومانەتەوە کە ئاستی بـاڵق بوونیـان بە شەش بست دیاریکردووەو (إسحاق)یش هەمان ڕای هەیە.[2]

حەوتەم: پێنجەم نیشانەی باڵقبوونی تایبەت بە ئافرەتان، کەوتنە عادەی مانگانەیە (الحیض):

* عائیـشە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویەتی: ((لایقبل الله صلاة حـائض الا بخمـار))[3] واتـە: خـوای گـەورە نوێـژی ئـەو ئافرەتەی گەیشتۆتە حەدی حەیز قەبوڵ ناکات مەگەر بە سەرپۆشەوە.

* إبن منذر (رەحمەتی خوای لیْ بێت) دەڵیْ: هەموو زانایان لەسەر ئـەوەن کـە هـەر کاتێك ئافرەت کەوتە حەیزەوە ئیتر باڵق بووەو فەرزەکانی لەسەر واجبە.[4]

نوکتەیەکی گرنگ:

* ابن قدامە (رەحمەتی خوای لیْ بێت) دەڵـیْ: کـەمترین تەمـەن کـە ئـافرەت تیایـدا بکەوێتە حەیزەوە نۆ ساڵانە، بـە بەڵگـە بینینـی ئـەو دیاردەیـە بـە چـاو دەی چـەندان

---

١ رواه عبدالرزاق (١٨٧٣٧) بإسناد صحیح.

٢ الاشراف (٢/٣١٤).

٣ رواه أحمد (٦/٢١٨) و أبوداود (٦٤١) وإبن ماجة (٦٥٥).

٤ الاوسط (٤/٣٨٨).

ئافرەت هەبووە لە (٩)ساڵیدا کەوتۆتە حەیزەوە، لە ئیمام شافعیەوە دەگێڕنەوە کە نەنەیەکی بە چاوی خۆی بینیوە تەمەنی (٢١) ساڵ بووە.

هەشتەم: شەشەم نیشانەی باڵقبوون کە تایبەتە بە ئافرەتان (منداڵبوون)ە

* ابن قدامە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: سکپڕبوون نیشانەی باڵقبوونی ئافرەتە چونکە خوا وای بڕیارداوە منداڵ نەبێت مەگەر لە یەککگرتنی ئاوی پیاوو ئاوی ژنەوە وەك دەفەرموێت: ﴿فَلیَنظُرِ الانسَانُ مِمَ خُلِقَ خُلِقَ مِن مَاءٍ دَافِق يَخرُجُ مِن بَينِ الصُّلبِ وَالتَّرَائب﴾.

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە لە فەرمودەکانیدا کە هەر کاتێك ئافرەت حامیلە بوو ئەوە حوکمی گەورەبوونی بەسەردا دەدرێت:

* ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئافرەت ڕوودەدات ناکەوێتە حەیزەوە کەچی سکی پڕ دەبێت.[1]

* هەروەها دەفەرموێت: ئافرەت لە (١٠) ساڵیدا سکی پڕ دەبێت.

* الشافعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئافرەتێك لە یەمەن لە (٩) ساڵیدا یان (١٠) ساڵیدا سکی پڕبوو)[2] ئەم گومانە لە (ابن عبدالحكم)ەوەیە.

نۆیەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیهاد لەسەر منداڵ واجب نیە تا باڵق نەبێت:

* المروزی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هیچ کەس لە زانایان گومانیان لەوەدا نیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جیهادی لەسەر ئافرەتو خزمەتکارو منداڵێك باڵق نەبووبێت فەرز نەکردبوو.[3]

---

١ المسائل لابي داود (١١١٥).

٢ مناقب الشافعي لابن أبي حاتم لاپەڕە (٤٩).

٣ السنە (١٣٥-١٣٦).

دەیەم: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ساڵانە باوکان کوڕەکانیان پیشانی بەرپرسانی دەوڵەتی ئیسلام دەدەن بە مەبەستی جیهادپێکردنیان‌و وەرنەگرتنی ئەوانەی لە (١٥) ساڵ تەمەنیان کەمترە:-

* سەمورەی کوڕی جوندوب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ساڵێك ئەنصاریەکانی ڕیز دەکرد بۆ ئەوەی کامیان گەورەو باڵق بوون بەشداری جیهادیان پێ بکات.[١]

* عروەی کوڕی زوبێر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆمەڵێك لە منداڵانی هاوەڵانی گێڕایەوەو بەشداری جەنگی پێ نەکرد لەبەر منداڵیان لەوانە:

عبداللەی کوڕی عمری کوڕی خطاب، کە چواردە ساڵان بوو، ئوسامەی کوڕی زەیدو بەرائی کوڕی عازب، عەرابەی کوڕی ئەوس، پیاوێکی بەنی حارسە، زەیدی کوڕی ئەرقەم، زەیدی کوڕی ثابت‌و ڕافع دەڵێ خۆی هەڵبڕی‌و پێغەمبەریش ڕێگای جیهادی پێدا، ئەوانی تری لە شاری مەدینە هێشتەوە بۆ پارێزگاری‌و پاسەوانی ژن‌و منداڵی موجاهیدەکان.[٢]

یازدەیەم: بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە (صحیح)ەکەیدا باسێکی ناوناوە ئەو منداڵەی دەبرێت بۆ جیهاد بۆ بەردەستی‌و خزمەتکردن:

* ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (أبوطلحة)ی فەرموو: ((التمس غلاماً من غلمانكم يخدمني حتى اخرج الى خيبر))

---

[١] رواه الحاكم (٢/٦٠) والطبراني في المعجم الكبير (٧/١٧٧) (٦٧٤٩).

[٢] رواه ابن عساكر في تأريخه (١٩/٢٦٤).

واتە: ئەی ئەبوطەلحە منداڵێك لە منداڵەکانتانم بۆ پەیدابکە تا دەردەچم بۆ جەنگی خەیبەر خزمەتم بکات)و (ابوطلحە)یش منی هێناو لەو کاتەدا من منداڵ بووم‌و بالّق نەبووم‌و خزمەتی پێغەمبەری خوام دەکرد لە هەر شوێنێك کە دادەبەزی بۆ حەوانەوە.[1]

دوازدەیەم: وتەکەی عمری کوڕی عبدالعزیز (رەحمەتی خوای لێ بێت) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بڕە مووچەی منداڵان کەمترە لە بڕەمووچەی پیاوان‌و ئەوەی نەگاتە (١٥) ساڵان لەناو منداڵاندا ناوی دەنووسرێت.

سوودێك:

خەلیفە ڕاشیدەکان (خوا لێیان ڕازی بێت) مووچەیان بڕیبوویەوە بۆ منداڵ هەر لەکاتی لەدایکبوونیەوە:

* ابن عمر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کۆمەڵێك بازرگان هاتن‌و لەلای مزگەوت دابەزین‌و شەو مانەوە، عمری کوڕی خطاب بە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی فەرموو: چۆنە ئەم شەو پێکەوە پاسەوانیان بین نەوەکو دز پەنێکیان پێدا بدات، هەردووکیان ئەو شەوە بوونە پاسەوان‌و شەو بەنۆرە شەونوێژیان دەکرد.

عمر (خوا لێی ڕازی بێت) گوێی لە گریانی منداڵێکی ساوا بوو، چوو بەرەو ماڵەکەیان‌و بە دایکی فەرموو: لە خوا بترسەو چاکبە لەگەڵ منداڵەکەت، پاشان گەڕایەوە بۆ شەونوێژی خۆی‌و دیسان منداڵەکە گریایەوەو بەهەمان شێوە ڕۆیشتەوە بۆ لای‌و پاشان گەڕایەوە بۆ جێگاکەی خۆی.

دیسان لەکۆتایی شەودا گریانەکەی بیستەوە، ئەم جارەش ڕۆیشتەوە بەرەو ماڵەکە بە دایکەکەی وت: بێ قەزابی، من وادەزانم دایکێکی خراپی، ئەوە چیە بەدرێژی شەو گوێم لە گریانی منداڵەکەت بووە؟!

---

[1] رواه البخاري (٣٨٩٣) ومسلم (٣٣٠٠).

ئافرەتەكەش وتی: ئەی بەندەی خوا (نەیناسی كە عومەرە) بەڕاستی ئەم شەو منت هەراسان كرد، من دەمەوێت لە شیری ببڕێنمەوە كەچی نایەڵی، عمر فەرمووی: بۆچی؟! ئافرەتەكەش وتی: چونكە عمر (خوا لێی ڕازی بێت) مووچە بە منداڵ نادات هەتا لە شیر نەبڕێتەوە.

عمر (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: تەمەنی چەندە؟ ژنەكەش وتی: ئەوەندەو ئەوەندە مانگە. بۆیە فەرمووی پێی: پەلەی لێ مەكە!.

نوێژی بەیانی كرد بۆ موسڵمانانو بەدەم گریانەوە قورئانی دەخوێند كە لە قورئانەكەی حاڵی نەدەبووین، كاتێك سەلامی دایەوە فەرمووی: ئای نەگبەتی بۆ عمر چەند منداڵی موسڵمانانی كوشتبێت؟! پاشان فەرمانی دا جاڕ بدەن لە شاردا: كە پەلە مەكەنو منداڵەكانتان لە شیر مەبڕێننەوە، چونكە لەمڕۆ بەدواوە موچە دەبڕێنینەوە بۆ هەر منداڵێك لە دایك دەبێت لە ئیسلامدا، بەهەمان شێوە نامەی نووسی بۆ سەرجەم هەرێمەكانو پێی فەرموون: هەر منداڵێك لەدایك ببێت مووچەی بۆ دەبڕینەوە.[١]

* سەعیدی كوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: عمری كوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) مووچەی بڕیبوویەوە بۆ منداڵ لەو ساتەوەی لەدایك دەبێتو دەنگی گریانی دەبیسترێت (استهلال).[٢]

* عمری كوڕی محمدی كوڕی یەزید لە باوكیەوەو ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: كاتێك لەدایكبووم عمر مووچەی (١٠٠) دیناری بۆ بڕیمەوە.[٣]

---

رواه ابن سعد في الطبقات لكبرى (٣٠١/٣) وعبدالرزاق (٩٧١٧) وابن عساكر في تأريخ دمشق ١(٤٤-٣٥٥).

٢ رواه ابن ابي شيبه (١٢٩٣٤) وعبدالرزاق (٦٦٠٧).

٣ رواه ابن ابي شيبه (١٢٩٣٦).

* هەروەها لە عەلی کوڕی ئەبوطالیبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هەمان حوکم دەگێڕنەوە.[١]

ئەم کتێبە تەواو بوو لە خوا داواکارم بە کەرەمو بەخشندەیی خۆی ئەم کارەم لێ وەربگرێتو لێم ڕازی بێتو بە دروستی لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) بووبێت، سوپاس بۆ خوای هەموو جیهان.

وەرگێڕ
عمر توفیق الخطاط

نوسەر
أبوعبدالله عادل بن عبدالله ال حمدان

١ ابن ابي شيبه (١٢٩٣٧).

# ناوەڕۆك